ساڵی چواردەهەم پاییزی ٢٠١٣
گۆڤارێکی تایبەتە بەوەرگێڕانو کلتوری بیانی
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دەریدەکات


# سەردەم
76


خاوەنی ئیمتیاز
شێرکۆ بێکەس

سەرنووسەر
ڕەووف بێگەرد

راوێژکاری گۆڤار
ڕێبین هەردی

دەستەی نووسین

هەورامان وریا قانع

دیزاین
ئومێد محەمەد

تایپ و هەڵەچنی
ڕێبوار سەدرەدین

بەرگ
ئارام عەلی



ئیمەیڵ
govarysardam@yahoo.com

www.serdem.net

# ناوەڕۆک

## فیکرو فەلسەفە ٤ - ٦٩



## وتارو لێکۆڵینەوە ٧٠ - ١١٩



## گفتوگۆ ١٢٠ - ١٥٣

## ئەدەب و هونەر ١٠٤ - ١٩١



## وێستگەکان ١٩٢ - ٢٢١



## بڵاوکراوەکانی دەزگای سەردەم ٢١٤

ئامادەکردنی: باوکی ڕەهەند

# ئانارشیزم، سیاسەتی شاعیرانە

نووسینی: هوارد زین
لە فارسییەوە: کاوە گوڵکار

هێربێرت ڕید لە پێشەکییەکدا کە بۆ کتێبی «ئانارشیزم، سیاسەتی شاعیرانە» نووسیویەتی دەڵێ: «وشەی ئانارشی لە ڕۆژئاوادا ئاژاوەیەکی گەورەی لای زۆربەی خەڵک نایەوە. ئەم وشە بە مانای بێنەزمی، توڕەیی و گرژی، دوو دڵی و دڵنیانەبوون... هاتووە. ئێمە دەبێت لەم ماناگەلە بترسین چونکە دەیان ساڵە لەگەڵیدا ژیاوین. ئەڵبەتە نە لە کۆمەڵگەیەکی ئانارشیستیدا، کە هیچکاتێ بوونی نەبووە، بەڵکو دروست بە پێچەوانەوە لەو کۆمەڵگەیانەدا لە تەکیدا ژیاوین، کە زۆرترین ترسیان لە ئانارشی بووە، واتە لەو دەوڵەت نەتەوە بەهێزانەی سەردەمی مۆدێرن.

بە درێژایی مێژووی مرۆڤ ئاژاوەی کۆمەڵایەتی وانەبینراوە. پەنجا ملیۆن کەس لە شەڕی جیهانی دووهەمدا کوژران: یەک میلیۆن لە کۆریا، یەک میلیۆن لە ڤێتنام، نیو ملیۆن لە ئەندونزیا، بە



هوارد زین

سەدان هەزار کەسیش لە نەیجیریا و مۆزامبیک. بیست ساڵ پاش تەواو بوونی شەڕیش سەرەڕای ئەوە بڕیار وا بوو چیدی هیچ شەڕێک روونەدات، جیهان سەدان قەیرانی سیاسی پڕ لە گرژی و ئاڵۆزی بەخۆوە دیوە. ملیۆنان کەس دیلی برسیەتی و هەژارین، یاخود ژیان لە زیندان و شێتخانەکاندا بەسەر ئەبەن. دوو کاری ناوەوەی ئەم ئاڵۆزییە لە شێوەی نامۆیی و سەرلێشێواوی و بەدبەختی گشتی و رووکاری دەرەوەیشی لە شێوەی زۆری سوپا و میلیتاریزەکردن، خەزن کردنی غازی کیمیاوی و بۆمبای هایدرۆژینی و ناوکیدا خۆی دەنوێنێ. ئەمڕۆکە پیاوان و ژنان و ئەو منداڵانەی، کە ئاستی تێگەیشتنیان نەختێک بەرز دەبێتەوە و لە سنوری ناوچەیی تێدەپەڕێت ژیانیان تەژی لە بێباوەڕی و ژاری دڵەڕاوکە دەبێت و لە خۆ دەپرسن بڵێی نەوعی بەشەر یا مرۆڤ تا بەرەو وەچەیەکی تر بژی یانا؟ هەر بۆیە ئانارشیستەکان دەیانەوێت کۆتایی بەم بارودۆخە بهێنن و بۆ یەکەمجار رێکخستنێک بەم جیهانە ئاڵۆزکاوە بدەن. ئێمە هیچ کاتێک بەوردی گوێمان لە قسەی ئەوانە نەگرتووە. ئەوەش، کە بیستوومانە لە رێگەی فیلتێرەکانی پاسدارانی ئاژاوە و رێبەرانی دەسەڵاتی میللی چ سەرمایەداری و چ سۆشیالیستییەوە بووە.

ئەو رێکخستنەی ئانارشیستەکان دەیانەوێت لەگەڵ رێکخستنی دەسەڵاتە نەتەوەییەکاندا کە ئەڵمانییەکان Ordnung و سیاسەتمەدارە ئەمەریکییەکان «نەزم و یاسا»ی پێ دەڵێن، جیاوازی زۆرە. ئانارشییەکان خوازیاری دروستبوونی جۆرێک پەیوەندی خۆویستانە لە ناو مرۆڤدان، کە لەویست و نیاز و پێداویستییەکانی خەڵکەوە سەرچاوەی گرتبێت. ئەم رێکخستنە لە ناوەوە هەڵدەقوڵێت و سروشتییە. جەماوەر بە دڵی خۆیان نەک لە رێگەی زۆرو تۆقاندنەوە، رێکخستنێکی ساکار هەڵدەبژێرن. ئەمەش شتێکە وەکو ئەو کارەی شێوەکارێک لەگەڵ رەنگەکان یا هونەرمەندێک لەگەڵ مادە سەرەکییەکان دەیکات. بەشێوەیەکی جوان شکڵێکی جوان و رازاوە و دڵڕفێنی پێ دەبەخشێت، لەبەرئەوەی باوەڕ و ئیمانی بە ئیشەکەی خۆی هەیە، ئیشەکەی بە پیت و بەرەکەت دەردەچێت. هەر بۆیە لەم روانگەوە سەیر نییە ئەگەر «هێربرت رید»ی شاعیر و فەیلەسووفی بواری هونەر بە ئانارشیست دابنێین.

رید لە رێگەی ئەزموونە تایبەتییەکانی خۆیەوە بە ئانارشیسمی فەلسەفی گەیشت. ئەو کوڕی جووتیارێکی ئینگلیزی بوو، لە (یۆرکشایێر) گەورە بوو، چەند ساڵێک لە شاری پیشەسازی دەوامی

گرت و هەر لەوێ چۆتە زانکۆ. شیعری ئەهۆنییەوە و حەزی لە هونەر و ئەدەبیات بوو.
لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا لە ریزی سوپای ئینگلیزدا ناچار بوو بۆن و بەرامە و دەنگ و هەرای شەڕ تەحەموول بکات. دواتر وەکو زۆربەی رۆشنبیران، شۆڕشی بۆلشەفیکی ئۆکتۆبەری مەزن لە روسیا، سەرنجی راکێشا، بەڵام هەر زوو دیکتاتۆری حیزبی شیوعی بێزاری کرد و رووی کردە ئانارشیسم، کە بە جۆرێک لەگەڵ حەز و ویستی ئەو بۆ هونەر یەکی دەگرتەوە. ئەو حەزی لە پەیکەرسازی، شیعرو رەخنەی هونەری و فەلسەفەی هونەر بوو و شیعرەکانی William wordworth شاعیر ئینگلیزی (١٧٧٠-١٨٥٠) و Samuel taylor Coleridge١٧٧٣ - ١٨٤٣) کاریگەری زۆری لەسەر کەسایەتی ئەو دانا.

ڕید تا کاتی مەرگی لە ١٩٦٨دا، چل کتێبی نووسیوە، کە زۆربەیان دەربارەی هونەر و ئەدەبیاتن.
لە ١٩٥٤ لە ئینگلستان کۆی وتارەکانی لەبارەی ئانارشییەوە لە ژێر ناوی «ئانارشیو رێکخستن»دا بڵاوکرایەوە. بەڵام نامیلکەی «شۆڕش و هزر» کە لە ١٩٥٣ دا نووسیبووی رێگەی پێنەدرا لە ئەمریکا بڵاوبکرێتەوە. هۆکارەکەشی ئەوە بوو، کە ئەمریکا لە دەیەکانی پەنجادا رێگەی بە هیچ جۆرێک ئانارشیسم و بەربەرەکانەی جدی نەدەدا. بەڵام لە ١٩٧٠ دا هەلومەرجەکە گۆڕاو «ڕید» دیارییەکی بۆ هێنان، کە نەوەی تازە نیازیان پێ بوو و خوازیاریشی بوون. ئەم دیارییەش «ئاوڕدانەوەی ئیستاتیکانە و جوانناسی لە سیاسەت»بوو.
رێکخستنی هەنووکەیی دنیای سیاسەت، بەو جۆرە کە دەیبینین، سەپێندراوە بەسەرکۆمەڵگەدا، یانی



هێربێرت ڕید

نە خەڵک خوازیارین و نە ئەویش پێداویستی و نیازەکانی جەماوەر لەبەرچاو دەگرێت. هەر بۆیە ئاژاوە و وێرانکاری لێ دەکەوێتەوە.

سیاسەت تاپۆ و مۆتەکەیەکە لە بەرانبەر هەستی ئێمە و هەناسەی لێ بڕیوین. سیاسەت دژی بنەڕەتەکانی ئیستاتیکایە، لە جوانی بە دوورە، داسەپێنراوە بەسەرماندا. وەکو دەنگێکە، کە لە گوێماندا بلەرێتەوە و ئازارمان بدا و خاوەنی ئەو دەنگانەش ناوی مۆسیقای لێ بنێن.

دەنگ و هەرا و جەنجاڵی ڕێکخستنی ژیانی مۆدێرن وا ئێمەی کەڕ کردووە، کە ئاوازی ناسک و جوان و لەسەرخۆ ناگاتە گوێمان. هەر بۆیە سەیر نییە، کە لە سەردەمی مۆدێرنەدا، لە زەمانی شۆڕشی فەرەنسی و ئەمریکی، واتە لەو کاتەدا، کە مرۆڤ زۆرترین غروری سەبارەت بە دەستکەوتەکانی خۆی هەبوو، بیرۆکەی ئانارشیستی بەرانبەر بەم لووت بەرزی و لە خۆبایی بوونە ڕاوەستا.

شارستانیەتی ڕۆژئاوا، لە وەسفی تایبەتمەندییەکانی خۆی وەکو پێشکەوتنێکی بەرچاو لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، هەرگیز نەیتوانیوە هاوتایی و هاوسەنگی بپارێزێت.

یەکە گەورەکانی دەوڵەتە نەتەوەییەکان جێگەی عەشایر و تایفەگەریان گرتــەوە. حکومەتی پارلەمانی جێگەی بە مافی خودایی حکوومەتی پاشایەتی لێژکرد. هێزی هەڵم و کارەبا جێگەی پیشە دەستییەکانی گرتەوە. زانیاری و فێرکردن تەلیسمی خورافەی پوچەڵکردەوە. یاسا جێگەی ریش سپیگەری گرتەوە. بەڵام سەرەڕای ئەمانە، ئانارشیزمی دروســت لــە بەشکۆترین ڕۆژانــی شارستانیەتی ڕۆژئاوادا سەری هەڵدا، لەبەرئەوەی مژدەکانی ئەم شارستانیەتە پووکانەوە و بزربوون.

دەسەڵاتی نەتەوەیی، کە بە دروشمی کۆتایی هێنان بە زۆرەملێی دەرەکــی و دابین کردنی ئاسایشی ناوخۆیی هاتە مەیدان ئەوەندەی تر دەسەڵاتی ئیمپراتۆرییە پاوانخوازە گەورەکان و قەیران و تەنگژە خوێناوییەکانی ئەوانی بەسەر خەڵکدا سەپاند و شەڕی ماڵوێرانکەری نێو ئیمپراتۆرییەکانی زیاتر کرد. پەرەسەندنی ئیمپریالیزم و شەڕ هاوکات لەگەڵ سەرهەڵدانی دەوڵەتە نەتەوەییەکاندا جۆرێک لە خۆ کوشتن بوو. حکومەتی پەرلەمانی بانگەشەی ئەوەی دەکـرد، کە خەڵک لە ڕێگەی دەنگدانەوە ئەتوانن بەشداری لە چارەنووسی خۆیاندا بکەن، بە شێوەی دەوڵەتی یەک حیزبی یا دوو حیزبی خۆی پیشانداو بوو بە پەردەیەک بۆ داپۆشینی سیمای نوێنەرانی پەرلەمان، کە لە ڕاستیدا نەک نوێنەری خەڵک، بەڵکو نوێنەرانی هەڵکەوتووی پارە و سامان و هێز و دەسەڵات بوون. بەرهەمهێنانی چڕ نەیتوانی کۆتایی بە هەژاری و چەوساندنەوە بهێنێت. بەرهەمهێنان و بڵاوکردنەوەی کاڵاکان، بە هۆی تەکنۆلۆجیاوە مەعقول تر، بەڵام لە ڕوانگەی مۆڕاڵەوە نامەعقول و نادادپەروەرانە بوو. خوێندن و خوێندەواری نەیتوانی کۆتایی بە فریو خواردنی زۆرینە لە لایــەن کەمینەوە بهێنێت و ئەمەش فریودانێکی تازە بوو.

سەرلێشێواوی و پەشێوی مێشکی خەڵکی داگیر کرد، کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی لە جاران کاریگەرتر بوو، چونکە هەنوکە چەکداربوو بە دەزگای مەزنی کۆنترۆڵی دەروون. پرۆسەی ماف دادپەروەری بە دیاری بۆ کەس نەهێنا و فاکتەری سەربەخۆی بێ دادپەروەری جێگەی خۆی بە ستمگەرێکی مەجهول و نەناسراو دا. «حکومەتی یاسا»، کە جێی بە حکومەتی «پیاوان» لێژ کرد تەنیا دەسەڵاتدارەکانی گۆڕی و ستەم و بێداد هەروەک خۆی مایەوە.

لە گەرمەی شۆڕشی ئەمریکادا، تام پین هاوکات

لەگەڵ ئەوەی بانگەشەی بۆ دامەزراندنی حکومەتی سەربەخۆی ئەمریکا ئەکرد، بە دڵنیاییەوە لەبارەی حکومەتی شۆڕشگێڕی نوێوە لە «عەقڵی تەندروستدا» ئاوای نووسی: «کۆمەڵگە لە هەر شێوەیەکدا بێت، بەخشش و مەوهیبەتە، بەڵام دەسەڵات تەنانەت لە باشترین شێوەشیدا، جگە لە خراپەی پێویست هیچی تر نییە».

ئانارشیستەکان زوو تێگەیشتن کە رووخانی شا و میرەکان و بە دەسەڵات گەیشتنی تاقمەکان و پەرلەمانەکان ناتوانێت دیموکراسی لەگەڵ خۆیدا بە دیاری بێنێت لەبەرئەوەی شۆڕشەکان چەندە توانا و قابیلیەتی ئازادی و سەربەستیان تێدایە، ئەوەندەش قابیلیەتی ملهوڕی و دیسپۆتیزمیان تێدایە. هەر بۆیە ژاک روو Jacques Reux کە قەشەیەکی دێهاتی بوو بۆ ژیانی دێهاتییەکان و کرێکارانی پاریس نیگەران بوو لە ١٧٩٣ دژی «دیسپۆتیزمی سەناتۆری» خوتبەی خوێند و بە شتێکی «ترسهێنەر وەکو تارمایی پاشاکان»ی شوبهاند، چونکە پێی وابوو یاسا هەرچەند جەماوەر وا دەزانن خۆیان دایانناوە، بەڵام لە راستیدا زنجیر و کۆتە بۆ دەست و پێی هەر ئەو خەڵکە» یاسا خەڵک دەسەمۆ دەکات. لە شانۆی «پیتر وایس» دا لە ژێر ناوی «سادومارا» (١) ژاک روو، کە بە تەناف (حبل) شەتەک دراوە، بۆ کورتە ساتێک بێدەنگی و سانسۆری شانۆکە دەشکێنێ و پێش ئەوەی فریابکەون و بێدەنگی بکەن هاوار ئەکاو ئەڵێ:

«کێن ئەوانەی بازارەکان کۆنترۆڵ دەکەن؟
کێن ئەوانەی قوڵف ئەدەن لە خەزێنەی دانەوێڵەکان؟
کێن ئەوانەی کاخ و کۆشکەکان تاڵان دەکەن؟
کێن ئەوانەی دەست بەسەر ئەو زەویانەدا ئەگرن، کە بڕیار وابوو بەسەر هەژارەکاندا دابەش بکرێن؟»

یەکێک لە هاوڕێیانی «روو» بە ناوی ژان وار لە jean varlet لە یەکەمین مانیفێستی ئانارشیستی شۆڕشی فەرەنسا لە ژێر ناوی «یاخیبوون» (٢) دا ئاوا دەنووسێت:

«بەڕاستی، کە ئەم حکومەتە شۆڕشگێڕە چ دێوێکی کۆمەڵایەتی بەد، و چ شاکارێکی مەکیاڤیلیستە Machiavellianism. بە هەر شێوەیەک سەرنج دەدەم حکومەت و شۆڕش پێکەوە ناگونجێن. مەگەر ئەوەی وای دابنێین، کە خەڵک دەیانەوێت دەزگای دەسەڵاتی خۆیان دابمەزرێنن و بەردەوامیش دژی خۆیان راپەڕن، کە ئەمەش ئایدۆلۆجیایەکی زۆر بێ مانایە».

بەڵام ئانارشییەکان باوەڕێکی تەواویان بەم «ئایدۆلۆجیای بێ مانایە» هەیە. چونکە تەنیا دید و روانگەیەکی «بێ ماناو جێی پێکەنین»ە ئەوەندە شۆڕشگێرانەیە، کە ئەتوانێت کەم و کورپییەکانی شۆڕش بە روونی ببینێت. هیربرت دید لە تەمەنی هەفتا ساڵیدا لە ١٩٦٣ لە کتێبی «لەعنەت لە کولتوور» نووسیویەتی:

«ئەوەی لە مێژووی مرۆڤایەتیدا بایەخێکی بووە، لە دەستکەوتەکانی فیزیا و ئەستێرەناسی و دۆزینەوە جوگرافیاییەکان و دەرمانی نەخۆشییەکان و فەلسەفە و هونەریشدا، تێکرا دەرئەنجامی کرداری توندڕەوەکان و پەرگیرەکان بووە، ئەو شێتانەی، کە بڕوایان بە «ئایدۆلۆجیا بێ ماناو پێکەنین هێنەرەکان» بووەو شەهامەت و جەسارەتی شتە نامومکینەکانیان بووە...»

شۆڕشی روسیا تەنانەت بەڵێنی لەمە زیاتری دەدا، ئەو نادادپەروەرییەی کە شۆڕشی فەرەنسا و ئەمریکا نەیتوانی پێی بگا — لە هەموو شێوەیەکیدا لەناوی ببات. بەڵام «ئێما گۆڵدمان Emma Goldman» لە نامیلکەی «رابوون

لە رووسیا» لە رەخنەیەکی توندوتیژی ئانارشیدا شۆڕشی رووسیا ئاوا هەڵدەسەنگێنێت: «شکست و تراجیدیای گەورەی شۆڕشی رووسیا ئەوە بوو، کە دەیانویست تەنیا ناوی دەزگاکان و هەروەها بارودۆخەکە بگۆڕن. لە کاتێکدا بەها کۆمەڵایەتییەکان و مرۆڤایەتییەکانی شۆڕش لە بیرچووبوونەوە. هیچ شۆڕشێک ناتوانێت رزگارکەر بێت مادام کەرەستە و شێوەکانی گەیشتن و پەرەسەندنی شۆڕش لەگەڵ مەبەستەکانیدا لەیەک رەگەز نەبن. شۆڕش نەفی ئەو هەلومەرجەیە، کە تێدابن. نارەزاییەکی توندوتیژە دژی هەموو پەیوەندیەکی نامرۆڤانە و تێکڕای ئەو کۆیلایەتییەی، کە لەو پەیوەندیانەدا حەشاردراوە. شۆڕش لەناوبەری ئەو بەها سەپێندراوانەیە، کە دەزگای بێ سەروبەری نادادپەروەری و ستەم و درۆ بە یارمەتی نەزانین و بەربەریەت لەسەر بناغەکانی دانــراوە. شـۆڕش بانگەشەی بەها تازەکانە، کە گۆڕانکاریی پەیوەندییە بنەڕەتییەکانی مرۆڤ — مرۆڤ و کۆمەڵگە — مرۆڤ بە دیاری دێنێت».

ئـانـارشـیـیـەکـان پێیان وایــە، کــە سیستەمی سەرمایەداری وێرانکەرو دژ بە ئەقڵ و نامرۆڤانەیە. سەرمایەداری کانزا و شتەکانی سەر زەوی، چڵێسانە هەڵدەلووشێت و دواتر شتگەلێکی لێ دروست دەکا، کە هیچ فرِی بە نیازی خەڵکەوە نییە، ئەگەریش هەی بێت بە رێکەوتە، چونکە دروستکەرەکان و بڵاوکەرەوەکانی کاڵاکان، کارخانەی گـەورەی بازرگانی و تەنیا قازانجی خۆیان لەبەرچاوە. هەر بۆیە لای ئـەوان دروسـت کردنی بۆمبا و لوغم و بینای ئیداری و بۆیەیی رەنگا و رەنگ گرنگترە لە دابینکردنی خواردن و خانوو و سەیرانگا. بەڕاستی وشەی ئانارشی بەو مانا ناسراوەیەوە، کە ئاژاوە و ئاژاوەچیەتییە، باشترین وەسفی سیستەمی ئابوری دڕندە و ئیسرافکاری ئەمریکایە و پڕ بە پێستیەتی.

ئانارشیەکان لایان وایە، کە گەنجینەکان و کانزاکان موڵکی هەمووانە و دەبێ لە رووی نیازەوە بەسەر خەڵکدا دابەشبکرێت، نەک لە رێگەی سیستەمی نـادادپــەروەری بانکی و دراوی و بەشێوەیەکی نامرۆڤانە. ئەوەتا بەپێی ئەم سیستەمە هەموو سامان و سەروەتی وڵاتەکان دەچێتە گیرفانی کەمایەتیەکی بچووک لە دەوڵەمەندەکانی ئەمریکا «ئەمریکا بە ٦٪ نفوسی لە رێـژەی جیهاندا، ٥٠٪ بەرهەم و سەروەتی جیهانی بە دەستەوەیە» ئانارشییەکان لەگەڵ حیکایەت بێژی شانۆی «بازنەی گەچی قەفقازیا»ی «بێرتولێت برێشت» هاودەنگن، کە لە کۆتایی شانۆکەدا ئەڵێت:

«گوێ رادێرە، حیکمەتی پێشینیان چی ئەڵێت:
هەرشتێک ئەبێ بسپێری بـەو کەسەی قـەدری دەزانێت
کـەوا بـوو: منداڵەکان بسپێرن بە دایکەکان تا بەختەوەربن.
عەرەبانەکان بدەنە دەست پیاوی خۆی تا بە جوانی ببیەن بەڕێوە.
دۆڵەکان و پێدەشتەکان بدەنە دەست ئاودێرەکان تا بەرهەمەکەی ببینین.»

هەر لەم روانگەوە بوو، کە «جـرارد ڤانستانلی Gerard Winstanely رێـبـەری جووتیارانی (٣) ئینگلیز لە سەدەی هەڤدەهەمدا بە لەبەرچاو نەگرتنی یاسای موڵکایەتی تایبەتی داوای لە لایەنگرانی خۆی کرد زەوییە بەیارەکان بکێڵن و کشتوکاڵی تێدا بکەن. جرارد لەبارەی خەونەکانیەوە لە داهاتوودا دەڵێ:

«ئـەو رۆژەی یاسای جیهانی بەرابەری لە دڵی هەموو پیاو و ژنێکدا سەرهەڵبدات، کەس بۆی نییە ئیدعای مۆڵکایەتی هیچ بونەوەرێک بکات و ئیتر کەس ناڵێت ئەمە هی منە و ئـەوەماڵی تۆیە،

ئەمە ئیشی منە و ئەوە ئیشی تۆیە. بەڵام هەموو بە گەلە کۆمەکی کار دەکەن و زەوی دەکێڵن و ئاژەڵ پەروەردە ئەکەن. نیعمەتەکانی سەر زەوی بۆ هەمووان دەبێت. هەر کەس نیازی بە دانەوێڵە، ئاژەڵ یا باڵندەیەک بێت، دەتوانێ لە یەکەمین سایلۆیدا، کە لەسەر رێگەکەیەتی هەڵی بگرێت. هیچ کڕین و فرۆشتن و بازاڕێک لە ئارادا نابێت. تەواوی زەوی گەنجینەی هاوبەشی هەموو مرۆڤەکانە چونکە زەوی مۆڵکی خودایە».

مەسەلەی ئێمە ئەوەیە، کە چۆن لە تەکنۆلۆجیای بەهێزی سەردەم کەڵک وەربگرین بۆ دابین کردنی نیازەکانی مرۆڤ، بە بێ ئەوەی ببینە قوربانی و کۆیلەی رێگا و شێوە بیرۆکراتییەکان. یەکێتیی سۆڤیەت نیشانی دا پڕۆژەی ئابووری نەتەوەیی بۆ مەبەستە گشتییەکان جێگرێکی باشە، بۆ ئەو ئاژاوە و بێ سەر و بەرییە قازانج خوازیانەی سەرمایەداری. بـەڵام رێبەرانی یەکێتیی سۆڤیەت نەیانتوانی پێشنیارەکانی «هربێرت رید» و ئانارشییەکانی دیکە بەکاربێنن. رزگاربوون لە دەستی بیرۆکراسی پیشەسازی مـەزن، کە تایبەتمەندی هاوبەشی جیهانی پیشەسازی سۆشیالیزم و سەرمایەداریشە و ئەو کێشەیەی لێ ئەکەوێتەوە، کە کرێکاران لە بەرهەمی کاریان، لە بەرهەمیان، لە هاوکارەکانیان و لە سروشت و لە خۆشیان بێزار دەکات. «رید» پێشنیاری ئەوەی کرد، کە ئەگەر کۆنترۆڵی ئیشی کرێکاران بە خۆیان بسپێرن، ئەوا ئەم کێشەیە چارەسەر دەکرا بەبێ ئەوەی مەوهبەتی بەرنامە دارشتن و هاوئاهەنگی ببێتە قوربانی بەرژەوەندی کۆمەڵایەتی.

«پرۆدۆن»، ئەوکەسەی خۆی بە یەکەمین ئانارشیست دەزانی، لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمدا ئەڵێ: «داراییەکان ئەدزرێن» سەرچاوەکانی زەوی و وزەی مرۆڤەکان چ لە ژێر چاودێری و کۆنترۆڵی شەریکەکانی سەرمایەداریدا بێ و چ لە دەست ئەو بیرۆکراسیانەی، کە خۆیان بە «سۆشیالیست» دادەنێن، لە هەر شێوەدا، دزی مەزن روویـداوە و ژیان و بەرهەمی کاری مرۆڤەکان بە تاڵان رۆیشتووە، ئەم تاوانە سەرەتاییە، سەرچاوەی هەموو بەدبەختییەکانە بە درێژایی مێژووی مرۆڤایەتی. چەوساندنەوە، شەڕ، کۆلۆنیالیکردن، بە کۆیلەکردنی ژنان، بە»تاوان» دانانی هەر هێرشێک، کە بکرێتە سەر موڵکایەتی و بە دادپەروەرانە زانینی ئەو سزا ستەمکارانەی، کە هەڵقوڵاوی «کۆمەڵگە پێشکەوتووەکانە» ئەمانەن ئەو نەهامەتی و بەدبەختییەی لەو تاوانە سەرەتایەوە سەرهەڵدەدەن.

ئانارشییەکان دەڵێن هـەردوو جۆری بیرۆکراسی سەرمایەداری و سۆشیالیستیش، نەیانتوانی لە پراکتیکدا ئەو دیموکراسیە جێبەجێ بکەن، کە بەڵێنیان دابـوو. جەوهەر و زاتی دیمۆکراسیەت ئەوەیە، کە خەڵک خۆیان چارەنووسیان دیاری بکەن بەڵام ژیانی ئەمڕۆی ئێمە بە دەستی جڤاتە سیاسی- عەسکەری و پیشەسازییەکانی ئەمریکا و حیزبی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤیەتە. دەوڵەتی دوو حزبی (ئەمریکا) و یەک حزبی (سۆڤیەت) فۆتۆکۆپییەکی چڵکنی یەکترن. هەردووکیان لە رێگەی نوێنەرانی بێ دەسەڵاتی پەرلەمانەوە وا پیشان ئـەدەن، کە خەڵک لە رێگەی دەنگدانەوە لە ژیانی خۆیاندا بەشدارن. لە واقیعدا «دەنگ» لە کۆمەڵگەی مۆدێرندا، نەختینەگی دونیای سیاسەتە هـەروا، کە دراو نەختینەگی دونیای ئابوورییە. هەردوو بەناوی دەسەڵاتی زۆرینە بەسەر کەمینەدا خەڵک تەفرە ئەدەن و ئەو راستییە ئەشارنەوە، کە ئەوە کەمینەیەکی تایبەتە بەسەر زۆرینەی خەڵکدا دەسەڵاتی خۆیان دائەسەپێنن.

ئانارشییەکان دەڵێن «یاسا و ئاسایش» گەورەترین درۆی سەردەمی ئێمەیە. یاسا رێکخستنی لێ ناکەوێتەوە بە تایبەتیش ئەو رێکخستنە رێک و پێکەی کۆمەڵگە، کە لە هاویاری و گەلەکۆمەکی سەرچاوە ئەگرێت. یاسا دانـراوە بۆ ئاسایشی دەوڵەتە پاوانخوازەکان و ئاسایشی زیندان و ئەو سوپایە، کە خەڵکی پێ بترسێنن.

تەنیا کارێک، کە یاسا ئەنجامی ئەدات ئەوەیە لە رێگەی زۆر و داپڵۆسینەوە نەهێڵێت ئەو خەڵکە رەش و رووتانەی، کە خۆیان قوربانی و زادەی کۆمەڵگەی گەندەڵن، سەرکێشی و نافەرمانی بکەن.

رێکخستنێک، کە ئەم یاسایە بە دیاری دەیهێنێت کاتی و کەم خایەنە، چونکە زۆرە ملێی خۆی بانگهێشتنێکە بۆ نافەرمانی و سەرکێشی. یاسا ناتوانێت کۆمەڵگەیەکی باش دروست بکات.

کۆمەڵگەی باش تەنیا زۆرینەی خەڵک لـە رێـگـەی خۆبەخشی و هـاوکـاری چەند لایەنە و دابەش کردنی سەروەت و سامان بە شێوەی دادپـەروەرانـە لەناوخۆیاندا ئەتوانن دیسپیلینی پێ بـدەن. باشترین ئاسایش ئەوەیە کە خەڵک نە بە زۆری یاسا، بەڵکو بە ویست و حـەزی خۆیان هەر کارێک، کە بە پێویستی بزانن ئەنجامی بدەن. دیاری ئەم شارستانیەتە تازەیە بە حکومەتی قانون و دیمۆکراسی نوێنەرەکانیەوە چییە؟ هەم سەرچاوە سروشتییەکانی زەوی لەناو دەبات، کە ئەتوانن خۆشی و بەختەوەری بە خەڵک ببەخشن و هەم سەرچاوە سروشتییەکانی مرۆڤەکان، کە

ئەمیشیان دەیتوانی هەوێنی خۆشەویستی و بلیمەتی بێت، بەرەو گەندەڵی و نەمان پەلکێش ئەکات.

بـە سـەمـەر گەیشتنی ئـەم تـوانـا و قابلییەتە هەنووکەیانەش نیازی بە پەروەردەکردنی بەرەیەکی نوێ لە فەزایەکی تەژی لە مێهرەبانی و هونەردایە. مخابن ئێمە پەروەردەی دونیای سیاسەتین. هێربرت رید لە «هونەرو نامۆیی»دا لە وەسفی مرۆڤایەتی پێنەگەیشتوو ناتەواودا، کە پـەروەردەی رەحمی دونیای سیاسەتە ئەڵێ:



William wordworth





مەکیاڤێلی

«ئەگەر بینایی و هەستی بیستن و چێژتن و لامیسە و هەموو وردەکارییەکانی جوانی هەستەکانمان، کە لە پرۆسەی زاڵبوون بەسەر سروشتدا و دەست تێوەردان و گۆڕانکاری مەواد بە شێوەی مێژوویی پەروەردە ئەبێ و باڵا ئەکات، هەر لە منداڵییەوە تا گەورەیی و پیری بەو جۆرە پەروەردە نەکرێت دەرئەنجامی ئەم کارە بوونەوەرێکی لێ ئەکەوێتەوە، کە شیاوی ناوی مرۆڤ نییە. ئەم بونەوەرە دەزگایەکی کوێر و کەڕ و لاڵە، کە تەنیا لە ناخەوە حەزی لە گرژییە. حەزی لە کرداری تووڕەیی و زبری و دەنگی ناحەز و هەر جۆرە یارییەکی لێوانلێو لە هەراو هوریا، کە بتوانێت دەرگای دەمارە داخراوەکانی بکاتەوە. سەرقاڵییەکانی ئەم بوونەوەرە ئەمانەن: ئیستادیۆم و مەیدانی وەرزشـی، یاری پین بـاڵ، هۆڵەکانی هەڵپەڕین و ئاهەنگ و تەماشای تاوان و گاڵتەجاڕی سادیسم لە سەر شاشەی تەلەفیزیۆن، قومار و راهاتن بە مادە سڕکەر و هۆشبەرەکان».

ئەسەف بۆ پرۆسەی پەرەسەندن؟ کە دوای یەک میلیارد ساڵ ئەم مرۆڤانەی لێ کەوتۆتەوە، کە ئەگەر بیانویستایە دەیانتوانی کەرەستە خاوەکانی سەر زەوی و هەروەها خۆشیان بە شکڵ و شێوەیەک دەربهێنابێت، کە جێگای رەزامەندی و حەزی تێکڕای ژنان و پیاوانی گشت جیهان بێت.

بـەڵام ئایا ئێستاش دەتوانین لەم هەڵبژاردنەدا خۆمان سەر پشک بین؟! وا دیـارە نیازمان بە گۆڕانکارییەکی قووڵی شۆڕشگێڕانە لە پرۆسەی کار و چۆنیەتی بڕیاردان و پەیوەندییە سێکسییەکان و.. تا بیروڕا و کولتووریشمان هەیە. ئەم گۆڕانکارییەش بە شێوەی ئاسایی دەرئەنجامی نابێت واتە نە بە سەرنگوونی حکومەتەکان لە رێگەی نیزامییەوە (کە رادیکاڵە سوننەتییەکان لایەنگرین) و نە بە ریفۆرم و چاکسازی لە رێگەی هەڵبژاردن و دەنگدانەوە،

کە ویستی لیبراڵە سوننەتییەکانە پێی ناگەین. بارودۆخی جیهانی ئەمڕۆ ئەم راستیە دەسەلمێنێت. ئانارشیستەکان هەمیشە بەوە تۆمەتبارکراون، کە لایەنگری توندوتیژین و بە رێگەیەکی دەزانن بۆ دروستکردنی گۆڕانکاری شۆڕشگێرانە. ئەم تۆمەتە لەلایەن ئەو حکومەتانەوە دەهێنرێتە ئارا، کە خۆیان بە توندوتیژی دروستبوون، بە توندوتیژی پارێزگاری لە دەسەڵات دەکەن و بەردەوام سوود لە توندوتیژی بۆ سەرکوتکردنی راپەڕینەکان و هێرشی نەتەوەکانی دی وەردەگــرن. هەندێک لە ئانارشیستەکان — وەک هەموو شۆڕشەکانی دی دنیا، چ ئەمەریکی یان فەرەنسی، رووسی یان چینی- جەختیان لە بەکارهێنانی توندوتیژی کــردووە. هەندێکیشیان لایەنگری تیرۆر و ترس و تۆقاندنن و بگرە تەنانەت جێبەجێی دەکەن. لێرەشەوە هیچ جیاوازییەکیان لە کەسی شورشەکانی دیدا نییە. ئەوەی ئانارشیستەکان لەوانی دی جیادەکاتەوە، کە زۆربەیان شۆڕش بە پرۆسەیەکی کولتووری — ئایدۆلۆژی و داهێنەرانە دادەنێن، کە رەنگە وەکو هاوار و قیژە و ژانی لەدایک بوونی منداڵێک، توندوتیژی تێیدا شتێکی حەتمی بێت، چونکە مـرۆڤ بە غەریزەیی لە بەرانبەری هەر گۆررانکارییەکدا دەوستێت و شۆڕشیش خۆی لە خۆیدا جۆرێک گۆڕانکاری هەمە لایەنەیە. بەڵام دەکرێ لە رەوتی سەرهەڵدانی شۆڕشێکدا، ئاستی توندوتیژی کەم بکرێتەوە.

ئێلێکساندێر بێرکمەن Alexander Berkman کە لە تەمەنی گەنجیەتیدا ویستبووی کارخانەدارێکی ئەمریکی بکوژێت، دواتــر کە پێدەگا و تێدەگا، لەبارەی توندوتیژی و شۆڕش لە کتێبی «ئەلف و بێی ئانارشیزم» دا دەڵێ:

«بە راستی ئەمانەوێ چی لە ناوببەین؟ سەروەتی دەوڵەمەندەکان؟ نا، ئەمە شتێکە ئێمە ئەمانەوێت هەموو خەڵک کەڵکی لێ وەربگرن هەروەها زەوی و مووچە و کانزاکان و رێگەی ئاسن و کارخانەکان و دوکانەکانیش نامانەوێت وێـران بکرێن، بەڵکو ئەمانەوێت لە خزمەتی خەڵکدابن.

کەوابوو شۆڕشی کۆمەڵایەتی نایەوێت هیچێک نابوود بکات بەڵکو ئەیەوێت بە قازانجی گشتی دەست بەسەر هەموو ئەو سەروەت و سامانانەدا بگرێت. شۆڕش ئەبێت ئەوەی بۆ بەختەوەری گشتی پێویستە بناسێت و رای بگرێت».

شـۆڕش لە واقیعدا بە زۆر و لە رێگەی سوپا و تفەنگەوە، ناکرێت. شۆڕش دەبێ لە پێشدا لە هزر و بیر و کرداری مرۆڤەکاندا دروست بێت، تەنانەت پێش ئەوەی لە هیچ ئۆرگانێکدا گۆڕانکاری بنەڕەتی بکرێت، چونکە شۆڕش کردارێکی ساتەوەختی نییە، بەڵکو پرۆسەیەکی درێژخایەنە. «برکمەن» لەم بارەوە دەڵێ:

«ئەگەر مەبەستی ئێوە دابینکردنی ئازادیە، دەبێت فێربن ناچارکردن وەلا بنێن. ئەگەر ئەتانەوێت لەگەڵ خەڵکدا لە ئاشتیدا بژین، ئەبێ برایەتیتان بسەلمێنن و رێز و حورمەتی یەکتر و خەڵک رابگرن. ئەگەر بۆ قازانجێکی هاوبەش پێکەوە ئیش دەکەن، دەبێ مومارەسەی دەستگرۆیی و هاویاری بکەن. مانای شۆڕشی کۆمەڵایەتی تەنیا ئەوە نییە سەر لەنوێ رێکخراوێک جێگەی یەکێکی تر بگرێت، شۆڕش سەقامگیری بەهای مرۆڤایەتی تازە و پەیوەندی کۆمەڵایەتی تازە و روانینێکی تـازەی مرۆڤ بۆ مرۆڤە، روانینی کەسێکی ئـازاد و سەربەخۆ بۆ هاورێکەی.

شۆڕش بە مانای رۆحی تازەکردن بەبەر ژیانی تاک و کۆمەڵە. ئەم رۆحەش بە شەوێک تازە ناکرێتەوە بەڵکو دەبێ وەکو تۆوی گوڵێکی ناسک بچێندرێت و ئاو بدرێت و پەروەردە بکرێت تا ئەم گوڵە ناسک و

جوانە بەرهەم بێت. پێش هەر شۆڕشێک ئێمە ئەبێ فێربین بە جۆرێکی تر بیربکەینەوە».
ئانارشییەکان ئەڵێن گۆڕانکاری شۆرشگێڕانە ئەوەیە، کە هەر لە ئێستاوە، لە هەر کوێ دەژین دەستی پێبکەین. ئەمەش بەو مانایە، کە دەستبەرداری ئەو پەیوەندییە توندوتیژانە بین، کە لەسەر بنەمای دەسەڵاتخوازی دامەزراون، چ لە نێوان ژنان و پیاوان و چ لە نێوانی منداڵ و باوک و یان کرێکار و خاوەن کاردا. ئەم شۆڕشە تێکشکانی بۆ نییە، چونکە بەردەوام لە ژیانی رۆژانەدا لە سەرهەڵدانەوەدایە. لە ناو ماڵەکاندا، لە شەقامەکاندا، لە کۆڵان و گەڕەکەکان و لە شوێنی ئیشکردندا. ئەمە گۆڕانی تەواوی کولتوورە، ئەگەر لەلایەکەوە پێشێل بکرێت لە لایەکی دیکەوە چرۆ ئەکات و سەرهەڵدەداتەوە. شۆڕشێکی لەم جۆرە هونەرە، چونکە ئەوەندەی، کە نیازی بە خۆڕاگریی و بەرگری کردن هەیە، ئەوەندەش نیازی بە خەیاڵە. دیمۆکراسی مۆدێرن هاندەری خەڵکە بۆ خۆویستی و بەشداری کردن لە تاوانەکاندا.
«هێربرت رید» لەبارەی دەور و رۆڵی هونەر لە کتێبی «هونەرو نامۆیی» دا ئەڵێت: «هونەر تا ئەبەد ئاژاوەگێڕ و شۆڕشگێڕە. گەورەیی هونەرمەند لەوەدایە، کە بەردەوام بە شوێن شتە نەناسراوەکاندا ئەگەڕێ و بەرەنگاریان ئەبێتەوە و دەرئەنجامی ئەم کارەش داهێنان و نوێخوازییە. هەر رەمزێکی تازەش، روانینێکی تازەیە بۆ ژیان، گرنگی ئەمەش لەوەدا نییە کە بیروباوەڕی هەنووکەیی خەڵک بهەژێنێت یان هەست و نەستی ئاڵۆزی ئەوان بە زمانێکی فەسیح و رەوان بڵێتەوە. ئەمەیان ئەرکی سیاسەتمەداران، رۆژنامەنووس و خەتیبەکانە. هونەرمەند ئەو شتەیە، کە ئەڵمانییەکان پێی دەڵێن Ein Rotller واتە ژێر و ژوورکەری نەزم و.. یاسا سەقامگیرەکان»

ئەم وتەیە بە مانای جیاوازی بەرچاو لە نێوان هونەرمەندی داهێنەر و سەرکەوتو لەگەڵ خەڵکدا نییە. ئەبێ لەوە تێبگەین هەروا، کە هێربرت مارکۆز وتویەتی: کۆمەڵگەی مۆدێرن ئەیەوێت بە تەواوی هێز و توانایەوە، مرۆڤێکی تاک رەهەند دروست بکات و ئەم هەوڵە ئەبێ پووچەڵ بکرێتەوە.
نزیکبوونەوەی. رید لە هونەر و ئانارشی وەڵامێکە پڕ بە پێستی خۆی بۆ سەدەی بیستەم و تەرکیزکردنەوەی ئەو فکرەیە، کە شۆڕش ئەبێ هاوکات کولتووری و سیاسیش بێت.
هەر بۆیە لە کتێبی «لەعنەت لە کولتوور»دا دەڵێ:


ئێما گۆڵدمان

«ئەوڕۆکە دەست و پێی ئێمە بەستراوەتەوە. ئەوەی کە دەیانکڕین و دەیانفرۆشین، لە موبلیاتی ناوماڵەوە، تا قاپ و کەوچک و جل و بەرگمان، نە لەرووی نیازەوەیە، بەڵکو بۆ قازانجە. تێکڕای فەرهەنگی سارمایەداری کۆمەڵگەی ئێمە، قوماشێکی رەنگا و رەنگە بۆ داپۆشینی ناوەڕۆکی ئەو کەل و پەلە چرووک و بێ نرخانەی دەوروپشتمان.
لەعنەت لەم فەرهەنگە، وەرن بۆ رێزگرتنی شۆڕشی تیموکراتێک هەلهەلەبکێشین. وەرن شارەکان جۆرێک دروست بکەین، کە زۆر گەورە نەبن بەڵام دلڕفێن بن و خەڵک بە ئاسودەگییەوە لە شەقامەکانیدا پیاسە بکەن و لە پارک و باخە گشتییە سەوز و بەگوڵ خەملاوەکانیدا، زارۆکەکان یاری بکەن. لەخانووە رازاوەکانیاندا بەختەوەر بژین. وەرن لەنێوان کشتوکاڵ و پیشەسازیدا و لەنێوانی شارو دێدا. هاوسەنگی و هاوتا بوونێک دروست بکەین. دەبێ لەپێشدا ئەم ئەرکە سەرەکیانە و مەعقولانە بە ئەنجام بگەێنین و پاشتر لەبارەی کولتوورەوە وتوێژ بکەین.
هەروەها درێژەی پێدەدات و دەڵێ:
«ناکرێت کولتوور لەسەرەوە بەسەر خەڵکدا بسەپێنیت. کولتوور لەخوارەوە و لەدڵی خەڵکدا وەکو کانی سەرهەڵدەدات و ئەتەقێتەوە. لە دەروونی جەماوەر و کار و ژیانی رۆژانەیاندا.
فەرهەنگ رەنگدانەوەی سەرخۆشییەکان و دڵ خۆشییەکانی گەلە لە پرۆسەی ژیان و هەڵسوکەوتی رۆژانەیاندا»
شۆڕشگێڕان پێویستە رەگەزی جوانناسی و ئێستاتیک بۆ هەڵاتن و رزگاربوون لەو کۆت و پێوەنانەی رابردوو، لە بیرنەکەن. بەدرێژایی مێژوو دیومانە چۆن شۆڕشگێڕان بە هۆی پابەندی بە سونەتەکانەوە سەرکوت کراون یاخود لە رێگە لایان داوە. مارکسییەکان دەبێ ئەو ئاگادارییەی مارکس لە «هەژدەی برۆمێرلویی بناپارت» دا وەکو گوارە لە گوێ بکەن بۆ ئەوەی لە بیری نەکەن. مارکس ئەڵێ:
«تێکڕای سونەتەکانی باوباپیرانی کۆچکردوومان مۆتەکە و تارماییە، کە بۆ مێشکی زیندووەکان چۆن دروست لە کاتێکدا ئەیانەوێت گۆڕانکاری لە ناو و دەرەوەی خۆیاندا بکەن و داهێنەرانە شتێکی تازە بخولقێنن، بەڵێ لەم ساتەوەختی قەیرانی شۆڕشگێڕانەدایە، کە ئارەزوومەندانە دەستە و دامێنی رۆحی مردووەکانیان ئەبن و ناو و دروشمەکانی بەرەنگاربوونەوەیان لێ وەردەگرن، تا سەر لەنوێ دیمەنی نوێی مێژووی جیهان بەو دیکۆرە کۆنە بڕازێننەوە و هەر بەو زمانە کۆنەش لەم شانۆیەدا قسە بکەن»
تەکنیک و هونەری شۆڕش لەوەدایە ئەوەی عەقڵ و زانست نایبینن، بیبینێت. بۆ تێکشکانی ئەم سنورانە و بۆ پەرەپێدانی عەقڵ تا داهاتوویەکی دوور، ئێمە پێویستمان بە شور و غەریزە هەیە، ئەو هەستەی، کە لە قوڵایی دڵی مرۆڤ دێتە دەرەوە و ناکرێ لە هیچ سەردەمێکدا بە درێژایی مێژوو، چوارچێوەیەکی بۆ دابنێیت.
هەربۆیە لە ١٩٦١دا، هێربرت رید، دوای بەشداریکردنی لە خۆپیشاندانێکی مەدەنی دژ بە خستنە ئاوەوەی ژێر دەریایی ناوەکی پۆلاریس لە لەندەن ئاوا دێتە ئاخافتن: «ئەم لەمپەرە دەبێ لابچێت، بەڵام ئەمە کاری عەقڵ نییە. هەردوولا بەڵگەیەکی زۆری راستیان بۆ کردەوە ناڕاستەکانیان لەلایە. ئەم دۆخە تەنیا بە کردارێکی غەریزی دەگۆڕدرێت. بانگهێشتن بۆ نافەرمانی و سەرکێشی کردارێکی جەمعی و غەریزییە و دەبێ هەرواش بێت. هەڵچونی غەریزەکانی مرۆڤ دژی هەڕەشەی لەناوبردنی گشتییە. هەرچەند یاری کردن بە غەریزەکان جێگەی مەترسییە بەڵام هەر بەم دەلیلە لە بارودۆخی نا ئومێدی و رەشی

ئێستادا، ئەبێ ئێمە غەریزەکان بجوولێنین. دەبێ خەیاڵی خەڵک بەرفراوان بکەین تا لەو چارەنووسەی هەڕەشەی مردنیان لێ دەکا، ئاگاداریان بکەینەوە. بۆ گەیشتن بەم ئارمانجەش دەبێ بەکردەوە بیسەلمێنین لە ڕێگەی قوربانی کردنی گیان و ماڵمان بەبێ ترس ئەم ئاسایشە تێک ئەدەین تا لە کۆتاییدا مرۆڤایەتی لە دەرد و ئازار و مەرگی بە کۆمەڵ رزگار بکەین بۆ هەتاهەتایە».

ئانارشیزم باش ئەزانێت، کە بۆ گەیشتن بە ترۆپکی ئازادی لەزەت بردن لە ژیاندا، گۆڕانکاری لە هەموو بوارەکانی کولتووری و ئابووری و رامیاری پێویستە. بەڵام لەسەر ئەو باوەڕەیە، کە ئەم گۆڕانکارییە دەبێ هەر لە ئێستاوە دەست پێ بکات. لە پەیوەندییە هەنووکەیەکانی نێوان مرۆڤەکان، کە زۆرترین کۆنترۆڵمان بەسەریاندا هەیە. ئانارشیزم دەزانێت، کە ئێمە پێویستمان بە بیرکردنەوەی عاقڵانە هەیە، بەڵام نیازمان بەوەش هەیە ئەم بیرۆکە عیلمی و ئینتزاعیەش بە کردەوە لە پراکتیکدا روونی بکەینەوە و داییەزێنین.

هێربرت رید لە نامیلکەی «دەربارەی ئازادی» دا ئەڵێ:

ئێمە نیازمان بە بازاڕی رەشی کولتوور هەیە، بۆ ئەوەی بە ئیرادەیەکی گەورەوە خۆمان لە پێگە عیلمی و جامعە (زانکۆ) و بەها و تیوریيە وشک و کلێشەیەکانیان لەبارەی هونەر و ئەدەبەوە بپارێزین. ئەمەش بۆ ئەوە نییە ئەم کاڵا هونەریانە و مەعنەوییانە لە ڕێگەی کەنیسە و دەوڵەت و چاپەمەنی و میدیاکان بازرگانی پێوە بکەین بەڵکو بۆ ئەوەیە لە قاچاخە رێوە بیانهێنین» بەم جۆرەش یەکەم کاڵای قاچاخ ئەو ئەدەبیاتەیە، کە بە پێچەوانەی هەموو درۆ و دەلەسەیەک لە ئەندێشە و ئاوات و خەونەکانی ئانارشیزم بەشێوەیەکی راستەقینە ئەدوێت.

سەرچاوە:

ئانارشی سیاسەتی شاعیرانە، نووسینی هێربێرت رید

تێبینی: هوارد زین ئەم وتارەی لە پێشەکی کتێبەکە نووسیوە و کۆی بیروڕای هێربێرت ریدی لەم پێشەکییەدا خستۆتەڕوو.

پەراوێزەکان:

١- JEAN PAVEL MARAT لە رێبەرانی شۆڕشی فەرەنسا (١٧٤٣-١٧٩٣).

MARQUISDE SADE رۆماننوسی فەرانساوی (١٧٤٠-١٨١٤)

٢-EXPLOSION وشەیەکی لاتینیە، بە مانای تەقینەوەیە، بەڵام لێرەدا بە مانای شۆڕش و یاخیبوون هاتووە.

٣-DIGGERS گروپی مساوات مللی کە لە ١٦٤٩ لە ئینگلیز بۆ ماوەیەک پەرەی سەند لە دژی موڵکایەتی تایبەتی «زەویە گشتییەکانی» ئەو وڵاتەیان داگیر کرد.

# پێشگۆتن بۆ هەر میتافیزیکێک کە بشێت لە ئایندەدا ببێت بە زانست

ئیمانوێل کانت
لە ئەڵمانییەوە: کاوە جەلال

## بەشی دووەم

### پاژی یەکەمی پرسیارە سەرەکیە ترانسێندێنتالەکە
### لکی یەکەمی پرسیارەکە: ئایا چۆن ماتماتیکی پەتی دەشێت



کانت

ماتماتیکی پەتی دەشێت، چونکە بەندە بە لێڕوانینی پەتییەوە وەك فۆرمی مەئریفەی سێنسی. ئەم فۆرمە لەگۆڕێیە پێش ئەوەی بابەتە دەرەکیەکان کاربکەنە سەر سێنسەکان. بەم ڕێیەوە کایەی بەکاربردنی ماتماتیك تایبەتە بە بابەتی سێنسەکان، واتا بە دیاردەکان.

بەڵام تێڕوانینی ئێمە ئەوەیە کە سەرجەم مەئریفەی ماتماتیکی ئەم تایبەتمەندییەی هەیە: ئەو دەبێت سەرەتا تێگەکەی خۆی لە لێڕوانیندا چێبکات، ئەوەش بێگومان بە ئاپریۆری، کەواتە لە شێوەیەکی ئەوتۆی لێڕوانیندا چێبکات کە ئەمپیری نییە، بەڵکو پەتییە. ماتماتیک بەم ڕێیەوە نەبێت، ناتوانێت یەک هەنگاو بنێت، بۆیە بڕیارەکانی هەمیشە حەدەسین (ئینتوئیتیڤن). بە پێچەوانەوە فەلسەفە دەبێت قایل بێت بە بڕیاری ئیستیدلالی (دیسکورزیڤ) کە تەنیا لە تێگەوە ئەنجام دەدرێت، هەروەها دەتوانێت تیۆرییە ئاپۆدیکتیەکانی خۆی بەڕێی لێڕوانینەوە ڕوونبکاتەوە، بەڵام هەرگیز ناتوانێت لەوێوە وەک دەرەنجام بییانباتەوە. ئەم ڕەچاوە پەیوەند بە سروشتی ماتماتیکەوە ڕێنومایەکمان پێدەدات بۆ یەکەم و باڵاترین مەرج بۆ شیمانەی ئەو، واتا: ماتماتیک دەبێت لێڕوانینێکی پەتیی وەک بناغە هەبێت و تێیدا

هەموو تێگەکانی خۆی بە کۆنکرێت، بەڵام سەرباری ئەوە بە ئاپریۆری، دابرێژێت، یان وەک دەگۆترێت، چێیانبکات. گەر بتوانین ئەم لێڕوانینە پەتییە و شیمانەکەی ئاشکرابکەین، ئەوسا بە سانایی ڕووندەبێتەوە کە چۆن بڕیاری پێکهاتەیی بە ئاپریۆری لە ماتماتیکی پەتیدا، بەمەش چۆن خودی ئەم زانستە، دەشێت. پێدەچێت لەم هەنگاوەدا کێشەیەک بێتەئاراوە نەک کەم بێتەوە. ئاخر ئێستا پرسیارەکە ئەوەیە کە ئایا چۆن دەشێت بە ئاپریۆری لە شتێک بڕوانرێت؟ لێڕوانین پێشبینییەکە لەو شێوەیەدا کە چۆن ئەو ڕاستەوخۆ بەندە بە ئامادەیی بابەتەوە. بۆیە پێدەچێت نەتوانین لە بنەڕەتەوە بە شێوەیەکی ئاپریۆری بڕوانین، چونکە ئەوسا دەبێت لێڕوانین بەبێ بابەتێک ڕووبدات کە نە پێشتر و نە ئێستا ئامادەیە و لێڕوانینەکە ڕووی تێبکات، بەمەش ناشێت ئەو لێڕوانین بێت.

گەر پێویست بێت لێڕوانینمان بە جۆرێک بێت کە پێشبینیی شتان بکات لەو شێوەیەدا کە چۆن ئەوان لەخۆدا هەن، ئەوا نەشیاوە هیچ لێڕوانینێک بە ئاپریۆری ڕووبدات، بەڵکو هەمیشە ئەمپیری دەبێت. ئاخر تەنیا کاتێک من دەتوانم بزانم چی لەنێو بابەت لەخۆدا هەیە، گەر بابەتەکە بە من هەنووکەیی بێت و پێمدرابێت. کەواتە تەنیا بە یەک جۆر دەشێت لێڕوانینم پێش کردەکێتیی بابەت لەگۆڕێ بێت و وەک مەئریفەی ئاپریۆری ڕووبدات: گەر لێڕوانینم هیچی دی جگە لە فۆرمی سێنسێتی لە خۆ نەگرێت، فۆرمێک کە لەنێو سەبژێکتی مندا پێش سەرجەم چاپاندنە (ئیمپرەسیۆنە) کردەکیەکان لەگۆڕێیە، ئەمەش بەو ڕێیەوە کە من لە لایەن بابەتەکانەوە کارم تێبکرێت / بارگاوی دەکرێم (affiziert). ئاخر من دەتوانم بە ئاپریۆری بزانم کە مرۆ دەتوانێت بەگوێرەی ئەم فۆرمەی سێنسێتی لە بابەتگەلی سێنسەکان بڕوانێت. لێرەوە ئەم سەرەنجامە دەکەوێتەوە: تەنیا ئەو بڕیارانە کە ڕوودەکەنە ئەم فۆرمەی لێڕوانینی سێنسی، لە لایەن بابەتگەلی سێنسەکانەوە دەهێنرێنەئاراوە و چواندنیان هەیە، ئەوجا بە پێچەوانەوە لێڕوانینەکان کە بە ئاپریۆری شیاون، هەرگیز ناتوانن ڕووبکەنە هیچ شتێکی دی جگە لە بابەتگەلی سێنسەکانمان.

کەواتە ئەوە تەنیا فۆرمی لێڕوانینی سێنسیە کە ڕێمان پێدەدات بە ئاپریۆری لە شتەکان بڕوانین، بەڵام ئێمە بەڕێی ئەوەوە تەنیا ئەو ئۆبژێکتانە دەناسین کە چۆن ئەوان بۆ ئێمە (بۆ سێنسەکانمان) دیاردەدەن، نەک چۆن ئەوان لەخۆدا هەن. ئەم پێشمەرجە بەتەواوی پێویستە، گەر بمانەوێت بڕیاری پێکهاتەیی بە ئاپریۆری وەک شیاو دابنێین، یان کاتێک ئێمە بەڕاستی بەو بڕیارانە دەگەین، ئیدی بتوانین لە شیمانەی ئەوان تێبگەین و لە سەرەتاوە دیاریان بکەین.

بەڵام فەزا و کات ئەو لێڕوانینانەن کە ماتماتیکی پەتی دەیانکات بە بناغەی هەموو مەئریفە و بڕیارەکانی کە پێکڕا وەک ئاپۆدیکتی و زەرووری سەرهەڵدەدەن. ئاخر ماتماتیک دەبێت سەرەتا سەرجەم تێگەکانی لە لێڕوانیندا، ماتماتیکی پەتیش دەبێت سەرجەم تێگەکانی لە لێڕوانینی پەتیدا، دابرێژێت، واتا چێیان بکات، بەبێ ئەم کارەش (چونکە ئەو ناتوانێت شێوازی شرۆڤەیی بگرێتە بەر، واتا تێگەکان دابەشبکات، بەڵکو تەنیا دەتوانێت شێوازی پێکهاتەیی بگرێتە بەر) ناتوانێت یەک هەنگاو بنێت، واتا ئەوەی پێناکرێت گەر هاتوو خاوەنی لێڕوانینی پەتی نەبێت. تەنیا لەم لێڕوانینە پەتییەدا دەشێت کەرەسە بۆ بڕیاری ئاپریۆریانەی پێکهاتەیی درابێت. جیۆمەتری لێڕوانینی پەتیی فەزا وەک بناغە دادەنێت. ئاریتمێتیک لە کاتدا تێگەکانی ژمارە بەڕێی خستنەپاڵیەکی بەردەوامی یەکەکانەوە چێدەکات، بەڵام بە تایبەتی میکانیکی

پەتی دەتوانێت بەیاریدەی پێشبینیی کات تێگەکانی خۆی لەمەڕ بزووتن بهێنێتە ئاراوە. لە بنەڕەتدا ئەو دوو پێشبینییە هەردووکیان تەنیا لێڕوانینن. ئاخر گەر مرۆ سەرجەم ئەمپیرێتی، واتا ئەوە کە سەر بە شئورکردنە، لە لێڕوانینی ئەمپیریانەی تەنەکان و گۆڕانیان (بزووتنیان) لابەرێت، ئەوسا تەنیا فەزا و کات دەمێننەوە کە لێڕوانینی پەتین و بە ئاپریۆری بریتین لە بناغەی لێڕوانینە ئەمپیریەکان، هەر لەبەر ئەم هۆیەشە کە هەرگیز ناشێت وەلاوەبنرێن. بەڵام لەبەر ئەوەی ئەوان لێڕوانینی ئاپریۆریی پەتین، ئەوا هەر بەو رێیەوە پێشانی دەدەن کە ئەوان تەنیا فۆرمی سێنسێتیی ئێمەن و دەبێت لەپێش سەرجەم لێڕوانینی سێنسیەوە، واتا لەپێش دەرککردنی بابەتە کردەکیەکانەوە، هەبن، هەروەها تەنیا بەگوێرەی ئەوان دەشێت بابەتەکان بە ئاپریۆری بناسرێن، ئەمەش بێگومان تەنیا لەو شێوەیەدا کە چۆن ئەوان بۆ ئێمە دیاردەدەن.

**ماتماتیك بەندە بە فۆرمە ئاپریۆریەکانی لێڕوانینەوە، ئەمانیش لە لایەنی خۆیانەوە پێشمەرجن بۆ سەرجەم لێڕوانینی ئەمپیری، بەمەش ئیدی چواندنی زەروریی ماتماتیك بۆ سەرجەم دیاردە بە ئێمە دراوەکان سەلمێنرا، واتا ئەو کێشەیە چارەسەرکرا کە چۆن بڕیارە پێکهاتەییە ئاپریۆرییەکانی ماتماتیك شیاون (و چواندنی گشتییان هەیە).**

کەواتە کێشەی ئەم بڕگەیەی ئێرە چارەسەر کرا. ماتماتیکی پەتی، وەک مەئریفەی ئاپریۆریانەی پێکهاتەیی، دەشێت چونکە روناکاتە هیچ بابەتێک جگە لە بابەتگەلی سێنسەکان، لێڕوانینی ئەمپیریانەی ئەم بابەتانەش لێڕوانینێکی پەتی (ی فەزا و کاتی) وەک بناغە هەیە، ئەمە بێگومان بە ئاپریۆری، ئەوجا ئەم لێڕوانینە دەتوانێت بناغە بێت، چونکە تەنیا فۆرمی سێنسێتییە و ئەم فۆرمەش لەپێش دیاردەی کردەکیانەی بابەتەکانەوە لەگۆڕێیە، ئاخر ئەم فۆرمەیە کە بەڕاستی سەرەتا هاتنەئارای دیاردە دەشێنێت. بەڵام گەر بە ئاپریۆری لەم توانستە بڕوانین، دەبینین کە ڕووناکاتە کەرەسەی دیاردە، واتا روو لەوە ناکات کە لە دیاردەدا شئورکردنە، ئاخر ئەمیان ئاپۆستەریۆریە، بە پێچەوانەوە ئەم توانستە تەنیا ڕوودەکاتە فۆرمی دیاردە، واتا فەزا و کات. گەر کەسێک کەمترین گومان لەوە بکات کە فەزا و کات تایبەتمەندیی هەڵواسراو نین بە شتەکان لەخۆداوە، بەڵکو ئەوان تەنیا تایبەتمەندیی پەیوەندییەکەی خۆیانن بە سێنسێتییەوە، ئەوا من دەخوازم بەرانبەر ئەوە بزانم کە چۆن مرۆ پێش هەر ناسیارییەک لەتەک شتەکاندا، واتا پێش ئەوەی ئەوان بە ئێمە درابن، دەتوانێت بە ئاپریۆری بزانێت کە داخۆ دەبێت روانین لەوان چۆن بێت، ئەمەش لە بنەڕەتدا رەوشێکە کە پەیوەندیی بە فەزا و کاتەوە هەیە. ئێمە دەتوانین بەتەواوی لەمە تێبگەین، گەر ئەوان تەنیا چواندنیان بۆ مەرجە شێوەکیەکانی سێنسێتیمان و بابەتەکانیش تەنیا چواندنیان بۆ دیاردەکان هەبێت، بەمەش ئیدی دەشێت فۆرمی دیاردە، واتا لێڕوانینی پەتی کە لە خودی ئێمەوە بە ئاپریۆری لەگۆڕێیە، پێشبینی بکرێت.

**ئەدگارەکانی فەزا بە شێوەیەکی تێگەیی هەڵناهێنجرێن، بەڵکو گەرەکە لە لێڕوانینی پەتییەوە پێیان بگەین**

کاتێک دەگوترێت فەزای تەواوەتی (کە خۆی سنووری فەزایەکی دی نییە) سێ کشانی هەیە، هەروەها ناشێت

فەزا بەگشتی زۆرتری لەوە هەبێت، ئەمە تێڕوانینێکی بنیاتنراوە لەسەر ئەو بنەمایە کە دەبێژێت: نەشیاوە جگە لە سێ هێڵ بتوانن یەکتری بە گۆشەوەستاوی لە پنتێکدا ببڕن. بەڵام بە هیچ شێوەیەک ناشێت ئەم بنەمایە لە تێگەوە روونبکرێتەوە، بەڵکو راستەوخۆ بەندە بە لێڕوانینەوە، بێگومان بە لێڕوانینی ئاپریۆریانەی پەتییەوە، چونکە بنەماکە ئاپۆدیکتیانە جەختە. کاتێک دەگۆترێت مرۆ دەتوانێت داوا بکات: گەرەکە هێڵێک هەتا بێدوایەکێتی درێژبکرێتەوە یان گەرەکە ریزێک گۆڕان (بۆ نموونە گرتنەبەری فەزا بە بزووتن) هەتا بێدوایەکێتی بەردەوامیی پێبدرێت، ئەمە داواکارییەکە کە پێشمەرجی هەیە و بریتییە لە پێشبینییەکی فەزا و کات کە تەنیا دەشێت بەند بێت بە لێڕوانینەوە، ئەمە بێگومان گەر هاتوو هیچ شتێک سنووری بۆ پێشبینییەکە لەخۆدا دانەنابێت. ئاخر هەرگیز ناشێت ئەو لە تێگەوە وەک دەرەنجام هەڵبهێنجرێت. کەواتە لێڕوانینی ئاپریۆریانەی پەتی بەڕاستی بناغەی ماتماتیکە. ئەم لێڕوانینانەن کە بڕیارە پێکهاتەیی و ئاپۆدیکتی چواندووەکانی ماتماتیک دەشێنن. بەم شێوەیە هەڵهێنجانی (Deduktion) ترانسێندێنتالی تێگەکانی فەزا و کات کە ئێمە ئەنجاممانداوە، هاوکات شیمانەی ماتماتیکێکی پەتی روونەدەکاتەوە. لە بنەڕەتدا مرۆ ئەوپەڕی دەتوانێت رێ بە هەبوونی ئەم ماتماتیکە بدات بەبێ تێگەیشتن لێی گەر هاتوو ئەم هەڵهێنجانە ترانسێندێنتالە ئەنجام نەدرێت یان گەر ئەم گریمانەیەی خوارەوە نەکرێت: «هەر شتێک بە سێنسەکانمان درابێت (بە سێنسە دەرکیەکانمان لە فەزادا، بە سێنسە ناخەکیەکانمان لە کاتدا)، ئێمە لێیدەڕوانین لەو شێوەیەدا کە چۆن ئەو بە ئێمە دراوە نەک لە شێوەیەدا کە ئەو لەخۆدا چۆنە«.

**بۆ نموونە جیاوازیی نێوان دەستی راست و چەپ تەنیا بە لێڕوانین نەك بە تێگەیی روونەدەکرێتەوە**

ئایا چە شتێک دەشێت بە دەستم یان بە گوێم هاوشێوەتر و لە هەموو بەشێکدا یەکسانتر بێت وەک وێنەیان لە ئاوێنەدا؟ من سەرەڕای ئەمە ناتوانم ئەو دەستە کە لە ئاوێنەدا دەبینرێت، لەبریی سەروێنەکەی دابنێم، چونکە گەر ئەمیان دەستی راست بێت، ئەوا ئەوی نێو ئاوێنەکە دەستی چەپە، هەروەها وێنەی گوێی راست گوێیەکی چەپە و هەرگیز ناتوانێت جێی ئەوی یەکەم بگرێتەوە. بێگومان لێرەدا هیچ جیاوازییەکی ناخەکی لەگۆڕێ نییە کە هیچ زەینێک بتوانێت بۆی بچێت، بەڵام سێنسەکان فێرمان دەکەن کە جیاوازییەکان سەرەڕای ئەوە ناخەکین، چونکە گەرچی دەستی راست و چەپ یەکسان و هاوشێوەی یەکدین، ناشێت پێکەوە لە نێوان هەمان سنووردا دابنرێن (ناشێت یەکبگرنەوە)، ناشێت دەستەوانەی یەکێکیان بۆ ئەویدیکەیان بەکاربرێت. ئایا وەڵامی ئەمە چۆنە؟ ئەم بابەتانە پێشبینیی شتەکان نین کە چۆن ئەوان لەخۆدا هەن و ئەوجا چۆن زەینی پەتی بییانناسێت، بەڵکو لێڕوانینی سێنسین، واتا دیاردەن و شیمانەیان بەندە بەو پەیوەندییەوە کە شتی لەخۆدا نەناسراو بە شتێکی دیکەوە، واتا بە سێنسێتیمانەوە، هەیەتی، لەم سێنسێتییەش فەزا فۆرمی لێڕوانینی دەرەکییە، ئەوجا بە دیاریکردنی ئەو پەیوەندییە دەرەکییە کە بە سەرجەم فەزاوە لەگۆڕێیە و خودی ئەو فەزایەش بەشێکێتی، دەتوانین هەر فەزایەک ناخەکیانە دیاری بکەین.
داکەوتە ئۆبژێکتییەکەی ماتماتیك تەنیا لە جیهانی دیاردەدایە، ئەمیش لە لایەنی خۆیەوە ئاماژە

دەداتەوە بۆ شتەکان لەخۆدا
ماتماتیکی پەتی، بەڵام بە تایبەتی جیۆمەتریی پەتی، تەنیا بەو مەرجە دەتوانێت خاوەنی داکەوتی ئۆبژێکتی بێت، گەر تەنیا رووبکاتە بابەتگەلی سێنسەکان، پەیوەند بەم بابەتانەشەوە ئەم بنەمایە جەختە: پێشبینیی سێنسیمان بە هیچ شێوەیەک پێشبینیی شتەکان لەخۆدا نییە، بەڵکو تەنیا پێشبینیی شێوەی دیاردانی ئەوانە بۆ ئێمە.

**چۆنێتییە «سەرەکییەکان» (فەزاییەکان)ی لۆك بە هەمان شێوەی چۆنێتییە «لاوەکییەکان»ی ئەو (وەك رەنگ و تۆن و هتد) تەنیا ئەدگاری دیاردەیین**

گەرچی شتە دەرەکییەکان بە کردەکی هەن، بەڵام مرۆ سەرەڕای ئەوە دەتوانێت لەبارەی کۆمەڵێکی هەڵگیراوەکانیان ببێژێت: ئەو هەڵگیراوانە سەر بە تەنەکان لەخۆدا نین، بەڵکو تەنیا سەر بە دیاردەکانیانن و لە دەرەوەی پێشبینیی ئێمە هیچ هەبوونێکی خۆییان نییە. ئەم تێڕوانینە زۆر پێش سەردەمانی لۆک، بەڵام بە تایبەتی دوای ئەو سەردەمانە، بەگشتی گریمانە کراوە و ناسێنراوە. گەرمی و رەنگ و تام و هتد سەر بەم هەڵگیراوانەن. بەڵام من هەروەها لەبەر هۆی گرنگ چۆنێتیەکانی (کوالێتییەکانی) دیکەی تەن کە ناودەنرێن سەرەکی، وەک کشان، شوێن (Ort)، بەگشتی فەزا بە سەرجەم ئەدگارەکانیەوە، چڕی یان ماتەریالێتی و شێوە و هتد) سەر بە دیاردەکان دادەنێم، لەدژی ئەم کارەشم مرۆ ناتوانێت کەمترین هۆ ناوببات کە گۆیا کارێکی رێپێنەدراوە. هەروەها چەند کەم دەشێت کەسێک بە ئیدیالیست دابنرێت کە بۆ نموونە قبووڵی ناکات رەنگەکان وەک ئەدگاری سەر بە شتەکان لەخۆدا دابنرێن، بەڵکو تەنیا وەک سەر بە مەغزای بینین وەک وەرگۆڕین (مۆدیفیکاسیۆن) وەریان دەگرێت، بە هەمان شێوە ناشێت تیۆرییەکەی منیش ئیدیالیستی بێت، ئاخر ئەمە ناشێت، چونکە بە دیدی من زۆرتر لەو ئەدگارانە، بەڵێ تەنانەت سەرجەم ئەدگارەکان کە لێڕوانینی تەنێکن، تەنیا سەر بە دیاردەکانی ئەو تەنەن، لێرەشدا هەبوونی شتی دیاردەر نەفی ناکرێت، وەک چۆن ئەمە لە ئیدیالیزمی راستەقینەدا دەکرێت، بەڵکو بەم رێیەوە تەنیا پێشان دەدرێت: ئێمە ناتوانین شتەکە، وەک چۆن ئەو لە خۆدا هەیە، بەرێی سێنسەکانەوە بناسین.

**بەڵام دیاردە رواڵەت نییە، چونکە لە دیاردەدا پەیوەندیگەلی رێسامەند هەن و ئێمە دەتوانین لەبارەی ئەوان بڕیار بدەین، لێرەشدا داوا دەکەین کە بڕیارەکەمان چواندنێکی ئۆبژێکتیانەی هەیە**

دەشێت بەئاسانی پێشبینیی بەربێژیکردنێکی پووچ بکەین کە بەرانبەرمان زیتبکرێتەوە، بەڵام ئێستا دەتوانین لەو تێڕوانینەی سەرەوە بەئاسانی رەتیبکەینەوە؛ دەشێت بگوترێت کە «گۆیا بەرێی ئیدیالێتیی فەزا و کاتەوە سەرجەم جیهانی سێنسی (مەحسوس) وەردەگۆڕرێت بۆ رواڵەت (illusion / Schein)".
گەر دیاردەمان پێدرابێت، ئەوا ئێمە تەواو ئازادین کە چۆن لێرەوە بڕیار بەسەر کەرەسەکەدا دەدەین. دیاردەکە بەندە بە سێنسەکانەوە، بەڵام بڕیاردانەکە بەندە بە زەینەوە. ئێستاش پرسیارەکە ئەوەیە

که داخۆ له دیاریکردنی بابەتەکەدا راستی هەبێت یان نەبێت. بەڵام جیاوازیی نێوان راستی و خەون بەرێی ئەدگاری پێشبینییەکانەوە کە روویان دەکرێتە بابەت، دیاری ناکرێت، چونکە پێشبینییەکان لە هەردووکیاندا هەمان شتن، بەڵکو بەرێی گرێدانی پێشبینییەکانەوە دیاری دەکرێت، گرێدانەکەش بەگوێرەی ئەو رێسایانە ئەنجام دەدرێت کە پەیوەندیی پێشبینیەکان لەنێو تێگەی ئۆبژێکتێکدا دیاری دەکەن، هەروەها رێساکان ئەوەش دیاری دەکەن کە داخۆ تا چەند بشێت پێشبینیەکان لە ئەزموونێکدا پێکەوە بن یان نەبن. بەڵام گەر مەئریفەمان وای دابنێت کە رواڵەت راستییە، ئەوا هۆی ئەم وادانانە بە هیچ شێوەیەک ناگەڕێتەوە بۆ دیاردەکان. سێنسەکان هەندێک جار رەوتی هەسارەکانمان بەرەو راست و هەندێک جاری دی بەرەو پاش بۆ پێشبینی دەکەن، لە ئەمەشدا نە هەڵە و نە راستی هەیە.
سێنسەکان بەرپرس نین لە رواڵەت، بەڵکو زەین بەرپرسە، ئاخر ئەوە زەینە کە گەرەکە لە دیاردەوە بڕیارێکی ئۆبژێکتی بدات. بە هەمان شێوە گەر من سەرجەم پێشبینییەکانی سێنسەکان پێکەوە لەتەک فۆرمەکەیاندا کە فەزا و کاتە، تەنیا بە دیاردە دابنێم و دیاردەش بە فۆرمی سێنسێتی دابنێم، بێگومان فۆرمێک کە بە هیچ شێوەیەک لە دەرەوەی سێنسێتی لە ئۆبژێکتەکاندا پێی ناگەین، ئەوجا منیش ئەم پێشبینیانە تەنیا پەیوەند بە ئەزموونی شیاوەوە بەکار بهێنم، ئەوا لەمەدا کە من بە دیاردەیان دادەنێم، کەمترین لەخشتەبردن بۆ چەوتی یان رواڵەت نییە، ئاخر ئەوان دەشێت سەرباری ئەوە لە ئەزموونڎا بەگوێرەی رێساگەلی راستی بە دروستی پێکەوە پەیوەست بن. کەواتە سەرجەم بڕیارەکانی جیۆمەتری چواندنیان بۆ فەزا و بۆ سەرجەم بابەتانی سێنسەکان هەیە، بەمەش ئەوان پەیوەند بە سەرجەم ئەزموونی شیاوەوە چواندنیان هەیە، جا من فەزا تەنیا وەک فۆرمی سێنسێتی ببینم یان وەک لکاوێک بە شتەکانەوە. گومانی تێدا نییە، من تەنیا لە رەوشی یەکەمیاندا دەتوانم تێبگەم کە چۆن من دەتوانم بە ئاپریۆری ئەو بڕیارانەی سەرجەم بابەتەکانی لێڕوانینی دەرەکی بزانم. بەدەر لەمە هەموو شتێک پەیوەند بە ئەزموونی شیاوەوە ئەوها دەمێنێتەوە هەروەک من بە هیچ شێوەیەک لە بۆچوونی گشتی لامنەدابێت.
بەڵام گەر من بوێرم بە تێگەکانم لەمەڕ فەزا و کات لە سەرجەم ئەزموونی شیاو تێبپەڕم، کە بەبێ شیمانەی رێگری روودەدات هەرئەوەندەی وایدابنێم کە ئەوان ئەدگاری هەڵواسراون بە شتەکان لەخۆداوە (ئاخر ئایا دەبێت چی رێم لێبگرێت کە پەیوەند بە ئەوانیشەوە وایدابنێم گۆیا چواندنیان بۆ شتەکان لەخۆدا هەیە، جا با سێنسەکانم هێشتا هەر بە شێوەیەکی دی پێکهاتبن و بە ئەوان بگونجێن یان نەگونجێن)، ئەوا دەشێت بەدووی ئەمەدا هەڵەیەکی گرنگ سەرهەڵبدات کە بەندە بە رواڵەتێکەوە، هۆی ئەمەش لەوەدایە کە من وامدانا: ئەوە کە مەرجێکە بۆ لێڕوانینی شتەکان و بەندە بە سەبژێکتی منەوە، بەجەختی چواندنی بۆ سەرجەم بابەتانی سێنسەکان هەیە، بەمەش چواندنی گشتیی بۆ سەرجەم ئەزموونی شیاو هەیە، چونکە من پەیوەندم کرد بە شتەکان لەخۆداوە نەک تەرخانی بکەم بۆ مەرجەکانی ئەزموونی شیاو.
کەواتە تیۆرییەکەی من لەمەڕ ئیدیالێتیی فەزا و کات بە هیچ شێوەیەک جیهانی سێنسی ناکات بە رواڵەتی پەتی، تیۆریەکەم بە پێچەوانەوە تەنیا دەسوێژێکە تاکو بەکاربردنی یەکێک لە گرنگترین مەئریفەکان، واتا ئەوە کە ماتماتیک بە ئاپریۆری دەیخاتە بەردەممات، بەسەر بابەتە کردەکیەکاندا مسۆگەر بکەم و بیپارێزم لەوە کە بە مەئریفەی رواڵەتی دابنرێت.

کەواتە کاتێک من کردەکێتیی شتەکانی پێشبینیی سێنسی ناخەمە ژێر پرسیارەوە و روانینی سێنسی لەم شتانە بە چەشنێک سنووردار دەکەم کە ئیدی سێنسەکان لە هیچ روویەکەوە، تەنانەت لە لێڕوانینە پەتییەکانی فەزا و کاتیشدا، هیچ شێک زیاتر لە دیاردەی خودی ئەو شتانە (نەک ئەدگارەکانیان) پێشبینی نەکەن، ئەوا ئەم کارەم رواڵەتێک نییە و من بە ناڕەوا دابێتمە پاڵ سروشت. من خۆم ئەم تیۆرییەمم ناو ناوە ئیدیالیزمی ترانسێندێنتال، بەڵام ئەمە ناشێت رەوایەتی بە هیچ کەسێک بدات بە سەهوو وایدابنێت کە گۆیا هاوشێوەی ئیدیالیزمە پڕسۆزە بە جیهاننامۆکەی بێرکلییە (لە بنەڕەتدا رەخنەکەمان لەدژی ئەو و دژی چەوتەوێنای دیکەی ئەندێشەیی چارەسەری راستەقینە لە خۆ دەگرێت). ئاخر هەرگیز بە هزری مندا نەهاتووە ئەم ئیدیالیزمە ترانسێندێنتالە کە من خۆم ئەوهام ناو ناوە، رووبکاتە هەبوونی (ئێکزیستێنسی) شتەکان و گومانیان لێبکات، بە پێچەوانەوە تەنیا روودەکاتە پێشبینیی سێنسیانەی شتەکان، لێرەشدا فەزا و کات لە باڵاترین ئاستدا سەر بەو پێشبینییەن، جگە لەوە من پەیوەند بە ئەمان هەردووکیان و بەمەش پەیوەند بە دیاردەکانەوە تەنیا پێشانم داوە کە: ئەوان شت نین (بەڵکو تەنیا جۆری (نەوعی) پێشبینین)، ئەوان هەروەها بریتی نین لە ئەدگار بە شتەکان لەخۆداوە. واتای وشەی ترانسێندێنتال هەرگیز لای من بریتی نییە لە هەبوونی پەیوەندیی مەئریفەمان بە شتەکانەوە، بەڵکو تەنیا واتای پەیوەندییەک بە توانستی مەئریفەوە دەگەیەنێت، ئەم واتایەش کە من پێم داوە، گەرەکە رێگری لەو راڤەکردنە چەوتە بکات. بەڵام پێش ئەوەی ئەم ناولێنانەی خۆم ببێت بە پاڵهێز بۆ ئەم راڤەکردنە چەوتە، ئەوا من خۆم دەیکشێنمەوە و ناوی دەنێم ئیدیالیزمی رەخنەیی.

**بەشی دووەمی پرسیارە سەرەکییە ترانسێندێنتالەکە**
**ئایا چۆن زانستی سروشتیی پەتی دەشێت**

**ئەو وەك زانستی یاسا ئاپۆدیکتیەکانی سروشت ناشێت ئەمپیری بێت؛ بەڵام گەر ئەو ئاپریۆری بێت، ئەوا ناشێت رووبکاتە شتەکان لەخۆدا**

گەر سروشت بەگوێرەی یاسای گشتی دیاری کرابێت، ئەوا سروشت بریتییە لە هەبوونی (Existenz) شتەکان. بەڵام گەر سروشت واتای هەبوونی شتەکان لەخۆدا بگەیەنێت، ئەوا ئێمە هەرگیز ناتوانین نە بە ئاپریۆری و نە بە ئاپۆستەریۆری بیناسین. ئێمە ناتوانین بە ئاپریۆری بیناسین، چونکە ئایا چۆن بزانین کە داخۆ چی سەر بە شتەکان لەخۆدا بێت؟
هەروەها بە ئاپۆستەریۆریش مەئریفەیەکی بەم چەشنەی سروشتی شتەکان لەخۆدا ناشێت. ئاخر گەر ئەزموون ئەو یاسایانەم فێربکات کە هەبوونی شتەکان لەژێر رکێفیاندایە، ئەوا گەر یاساکان چواندیان بۆ شتەکان لەخۆدا هەبێت، دەبێت ئەوسا هەروەها لە دەرەوەی ئەزموونی منیش بە زەرووری چواندنیان بۆ ئەوان هەبێت. گومانی تێدا نییە ئەزموون فێرم دەکات کە چی هەیە و چۆنە، بەڵام هەرگیز فێرم ناکات کە ئەو دەبێت بە زەرووری ئەوها بێت نەک بە جۆرێکی دی. کەواتە هەرگیز ئەزموون فێرم ناکات کە داخۆ

سروشتی شتەکان لەخۆدا چی بێت.

**ئەو یاسایانە کە چواندنی گشتییان هەیە، بەتایبەتی یاساکانی جەوهەر و کاوساڵ، بەڕاستی هەن**

کەواتە ئێمە بەڕاستی خاوەنی زانستێکی سروشتیی پەتین، ئەم زانستە بە ئاپریۆری، هەروەها بەو زەروورەیەش کە بۆ بڕیاری (هزردۆزی) ئاپۆدیکتی پێویستە، یاساگەل رادەگەیەنێت و سروشت لەژێر رکێفیاندایە. بەڵام لەنێو پرنسیپە بنەڕەتیەکانی (fundamental princips /Grundsätze) ئەو فیزیکە گشتییەدا چەند دانەیەک هەن بەو گشتێتییەوە کە ئێمە داوای دەکەین، بۆ نموونە بڕیاری: «جەوهەر سرەوتووە و دەمێنێتەوە"، یان: «هەموو رووداوێک هەردەم پێشتر بەڕێی هۆیەکەوە بەگوێرەی یاساگەلی نەگۆڕ دیاری کراوە"، و هتد. ئەمانە بەڕاستی یاساگەلی گشتیی سروشتن و تەواو بە ئاپریۆری هەن. کەواتە بەڕاستی زانستێکی سروشتیی پەتی هەیە، ئێستاش پرسیارەکە ئەوەیە کە: ئایا چۆن ئەو زانستە هەیە؟

یاسامەندیی بابەتەکانی ئەزموون بریتییە لە رووە شێوەکییەکەی سروشت لەم واتا تەسکەدا، ئەوجا گەر ئەو یاسامەندییە بە ئاپریۆری بناسرێت، ئەوا بریتیشە لە یاسامەندییەکی زەروورییی ئەو بابەتانە. بەڵام ئێمە پێشتر گوتمان: گەر ئێمە پەیوەند بە ئەزموونی شیاوەوە لە بابەتەکان نەڕوانین، بەڵکو وەک شت لەخۆدا لێیان بڕوانین، ئەوا هەرگیز ناتوانین بە ئاپریۆری ئەو یاسایانەی سروشت بناسین کە پەیوەندن بە بابەتەکانەوە. بە هەر حاڵ ئێمە لێرەدا خۆمان بە شتان لەخۆداوە خەریک ناکەین (ئێمە ئەم ئەدگارەیان وەلاوە دەنێین)، بەڵکو بە شتانەوە وەک بابەتگەلی ئەزموونکردنێکی شیاو، ئەوجا ئەوە کە ئێمە لێرە ناوی سروشتی لێدەنێین، لە راستیدا تەنیا تێگە گشتییەکەی (Inbegriff) ئەوانە. بەڵام گەر ئێمە لە شیمانەی مەئریفەیەکی ئاپریۆریی سروشت بدوێین، ئەوا پەیوەند بەمەوە دەپرسم کە داخۆ باشتر نەبێت پرسیارەکەمان بەم چەشنە بنیات بنێین: گەر شتەکان وەک بابەتی ئەزموون وەربگرین، ئەوسا ئایا چۆن دەتوانین بە ئاپریۆری یاسامەندیی زەروورییان بناسین؟ یان: ئایا چۆن دەتوانین بە ئاپریۆری یاسامەندیی خودی ئەزموون پەیوەند بە بابەتەکانیەوە بناسین؟

ئایا چۆن ‹ئەزموون› وەك مەئریفەیەك بە چواندنی ئۆبژێکتییەوە دەشێت؟ تەنیا بە بەکاربردنی تێگە ئاپریۆریەکانی زەین کە کاتیگۆریەکانن. ئیدی بەو رێیەوە ‹بڕیارە دەرکییەکان› کە چواندنی سەبژێکتییان هەیە، دەبن بە ‹بڕیاری ئەزموونی› بە چواندنی ئۆبژێکتییەوە

ئێمە دەبێت سەرەتا تێبگەین: گەرچی سەرجەم بڕیارە ئەزموونیەکان ئەمپیرین، واتا بناغەیان لە دەرککردنی راستەوخۆی سێنسەکاندایە، سەرەڕای ئەوە هەموو بڕیارە ئەمپیریەکان بڕیاری ئەزموونی نین، بەڵکو دەبێت جگە لە ئەمپیرێتی و هەروەها جگە لەوەش کە بە لێڕوانینی سێنسی دراوە، تێگەگەلی تایبەتی بۆ ئەو بڕیاردانە چالاک ببن کە سەرچاوەیان تەواو ئاپریۆری لە زەینی پەتیدایە و لەژێریاندا هەموو دەرککردنێک یەکدەخرێت، کە ئیدی پاشان دەشێت دەرککردنکە بەڕێی خودی ئەو تێگانەوە بکرێت

بە ئەزموون.
گەر بڕیاری ئەمپیری چواندنێکی ئۆبژێکتیانەی هەبێت، ئەوا بڕیاری ئەزموونییە. بەڵام من ئەو بڕیارە ئەمپیریانە کە تەنیا چواندنی سەبژێکتییان هەیە، ناو دەنێم بڕیاری دەرکی (ئیدراکی). ئەمان پێویستیان بە تێگەی پەتیی زەینی نییە، بەڵکو تەنیا پێویستیان بە گرێدانی لۆگیکیانەی دەرککردنەکان هەیە لەنێو سەبژێکتێکدا کە دەهزرێت. بەڵام ئەوانەی یەکەم، لەپاڵ پێشبینیەکانی لێڕوانینی سێنسیدا، هەردەم پێویستیان بە تێگە هەیە و ئەو تێگانەش لە بنەڕەتەوە لەنێو زەیندا چێکراون؛ بڕیارە ئەزموونییەکان بەهۆی ئەم تێگانەوە چواندنی ئۆبژێکتییان هەیە.
سەرجەم بڕیارەکانمان سەرەتا بڕیاری دەرکین، ئەوان تەنیا بۆ ئێمە، واتا بۆ سەبژێکتمان، چواندنیان هەیە، ئەوجا ئێمە بەدووی ئەمەدا دەیانخەینە پەیوەندییەکی نوێوە لەتەک ئۆبژێکتێکدا و دەمانەوێت ئەو ئۆبژێکتە هەردەم چواندنی چە بۆ خۆمان و چە بۆ هەر کەسێکی دی هەبێت. ئاخر گەر بڕیارێک لەتەک بابەتێکدا یەکبگرێتەوە، ئەوا دەبێت هەموو بڕیارەکان کە لەبارەی ئەو بابەتە دەدرێن، لەنێو یەکتریدا یەکبگرنەوە، کەواتە چواندنی ئۆبژێکتیانەی بڕیارێکی ئەزموونی تەنیا ئەو واتایە دەگەیەنێت کە بڕیارەکە چواندنێکی گشتیی زەرووری هەیە. ئەوجا گەر ئێمە بە پێچەوانەوە لەبەر هەر هۆیەک بڕیارێک بە چواندووی گشتیی زەرووری دابنێین (بڕیارێک کە هەرگیز بەند نییە بە دەرککردنەوە، بەڵکو بەندە بە تێگەی پەتیی زەینییەوە و هەر لەژێر ئەم تێگەیەشدا دەرککردنەکە یەکدەخرێت)، ئەوا دەبێت ئەو بڕیارە هەروەها بە بڕیارێکی ئۆبژێکتی دابنێین، واتا بڕیارەکە تەنیا پەیوەندیی دەرککردن بە سەبژێکتێکەوە دەرنابڕێت، بەڵکو ئەدگارێکی بابەتەکە دەردەبڕێت. ئاخر هۆی ئەوە کە بڕیارانی کەسانی دی بەزەرووری لەتەک بڕیارەکەی مندا یەکدەگرنەوە، تەنیا دەشێت سەرجەمێتیی/ یەکایەتیی بابەتەکە بێت کە ئەوان هەموویان رووی تێدەکەن و لەتەکیدا یەکدەگرنەوە، هەر لەبەر ئەم هۆیەشە کە دەبێت ئەوان لەنێو یەکتریدا کۆک بن سەبارەت بەو بابەتە.
بۆیە تێگەکانی چواندنی ئۆبژێکتی و چواندنی گشتیی زەرووری (بۆ هەر یەکێک) تێگەی هاوچوون (موتەبادیلن / رێسیپرۆکن). بەڵام گەرچی ئێمە یەکسەر ئۆبژێکت لەخۆدا ناناسین، سەرەڕای ئەوە گەر ئێمە بڕیارێک بە چواندووی گشتی و بەمەش بە زەرووری دابنێین، ئەوا ئێمە لەوە هاوکات چواندنی ئۆبژێکتیی بڕیارەکە تێدەگەین. (گەرچی ئۆبژێکت وەکو دی، جا لەخۆدا چۆن بێت، وەک نەناسراو دەمێنێتەوە)، بەڵام ئێمە بەڕێی ئەم بڕیارەوە ئۆبژێکت دەناسین، ئەویش کاتێک ئێمە دەرکردنە دراوەکان بە شێوەیەکی بەگشتی چواندوو و زەروریی گرێدەدەین، ئەوجا لەبەر ئەوەی ئەم رەوشە هەموو بابەتێکی سێنسەکان دەگرێتەوە، ئەوا بڕیارە ئەزموونییەکان چواندنی ئۆبژێکتیانەیان لە مەئریفەی راستەوخۆی بابەتەوە وەرناگرن (ئاخر ئەمە نەشیاوە)، بەڵکو تەنیا لەو مەرجەوە وەریدەگرن کە بۆ چواندنی گشتیی بڕیارە ئەمپیریەکان لەگۆڕێیە، ئەم مەرجەش وەک گۆتمان بەند نییە بە مەرجگەلی ئەمپیریەوە، بەڵێ بە هیچ شێوەیەک بەند نییە بە مەرجگەلی سێنسیەوە، بەڵکو بەندە بە تێگەیەکی پەتیی زەینییەوە. ئۆبژێکت لەخۆدا هەمیشە وەک نەناسراو دەمێنێتەوە. ئەوە تێگە زەینییەکانن کە پێشبینیەکان دەدەن بە سێنسەکانمان، ئەوجا گەر بەڕێی تێگەی زەینییەوە گرێدانی پێشبینیەکان وەک چواندووی گشتی دیاری

بکرێت، ئەوا بەرێی خودی ئەم پەیوەندییەوە هەروەها بابەتەکە دیاری دەکرێت و بڕیارەکەش ئۆبژێکتییە. با ئەمە روونبکەینەوە. بڕیارەکانی وەک: ژوورەکە گەرمە، شەکر شیرینە، ڤێرموت ([1]) قێزەوەنە، تەنیا چواندنی سەبژێکتییان هەیە. من بە هیچ شێوەیەک داوا ناکەم کە من هەردەم ئەم تێڕوانینەم هەیە یان گەرەکە هەموو یەکێک هەمان تێڕوانینی هەبێت، بڕیارەکان تەنیا پەیوەندییەکی دوو شئوور بە هەمان سەبژێکتەوە، واتا بە من خۆمەوە دەردەبڕن، ئەمەش بێگومان لە دۆخی ئێستای دەرککردنەکەمدا، هەر بۆیە چواندنیان بۆ ئۆبژێکت نیە. من ئەم جۆرە بڕیارانە ناو دەنێم بڕیاری دەرکی (ئیدراکی). بەڵام ئەدگاری بڕیارە ئەزموونییەکان تەواو جیاوازە. ئەوە کە ئەزموون لە رەوشی تایبەتیدا فێرمی دەکات، دەبێت هەردەم فێری من و هەر کەسێکی دیکەی بکات، چواندنی ئەزموونەکەش تەنیا پەیوەست نییە بە سەبژێکت یان بە دۆخی جارەکیی ئەوەوە، بۆیە من چواندنی ئۆبژێکتی بەم جۆرە بڕیارانە دەدەم. بۆ نموونە گەر من ببێژم: هەوا ئێلاستییە (مرن)، ئەوا ئەم بڕیارەم سەرەتا تەنیا بڕیارێکی دەرکییە. من لەنێو سێنسەکانمدا پەیوەندی لە نێوان دوو شئووردا چێدەکەم. بەڵام گەر من بمەوێت ئەو بڕیارە بریتی بێت لە بڕیاری ئەزموونی، ئەوا داوا دەکەم کە ئەم گرێدانە لەژێر مەرجێکدایە و گرێدانەکە دەکات بە چواندووی گشتی. کەواتە من دەمەوێت کە من خۆم و هەروەها هەموو کەسێکی دی دەبێت هەردەم هەمان دەرککردن لە رەوشی تایبەتیدا بە زەرووری گرێبدات.

## کاتێگۆرییەکی بەم چەشنە بریتییە لە کاتێگۆریی کاوساڵێتی

لێڕوانینی دراو پێویستە لەژێر تێگەیەکدا یەکبخرێت، ئەو تێگەیە فۆرمی بڕیاردان پەیوەند بە لێڕوانینەکەوە دیاری دەکات و بەمەش چواندنی گشتی بە بڕیارە ئەمپیریەکان دەدات. خودی ئەو تێگەیە تێگەیەکی ئاپریۆریانەی پەتیی زەینییە و تاکە کاری بریتییە لە دیاریکردنی جۆری لێڕوانینێک بەگشتی، بەڵام دیاریکردنەکە بە چەشنێکە کە ئیدی ئەو جۆرەی لێڕوانین بۆ بڕیاردان بشێت. تێگەیەکی بەم چەشنە بریتییە لە تێگەی هۆ و ئەو لێڕوانینە دیاری دەکات کە لەژێر خۆیدا یەکخراوە.
بەڵام پێش ئەوەی بڕیارێکی دەرکی ببێت بە بڕیاری ئەزموونی، پێویستە سەرەتا دەرککردنەکە لەژێر تێگەیەکی بەو چەشنەی زەینیدا یەکبخرێت: گەر خۆر تیشک بپەخشێنێتە سەر بەرد، ئەوا بەردەکە گەرم دادێت. ئەم بڕیارە تەنیا بڕیارێکی دەرکییە و هیچ زەروورەیەک لە خۆ ناگرێت، جا من چەند زۆر ئەمەم دەرککردبێت و کەسانی دیکەش بە هەمان شێوە چەند زۆر دەرکیان کردبێت. دەرککردنەکان تەنیا بەگوێرەی خوو ئەوها گرێدراون. بەڵام گەر من ببێژم: خۆر بەرد گەرم دەکات، ئەوا جگە لە دەرککردنەکە تێگەی هۆ دێتە پاڵی کە تێگەیەکی زەینییە و بەزەرووری تێگەی گەرمی لەتەک تێگەی تیشکی خۆردا گرێ دەدات، بڕیارە پێکهاتەییەکەش بەزەرووری چواندنی گشتی وەردەگرێت، بەمەش دەبێت بە بڕیاری ئۆبژێکتی و لە دەرککردنەوە دەبێت بە ئەزموون.

[1] بە ئەڵمانی (tumreW)، ناوە نێونەتەوەییەکەی بریتییە لە (htuomreV). جۆرێکی شەرابی تێکەڵە بە بەهارات کە ڕێژەیەکی بەرز ئەلکوهول و شەکر لە خۆ دەگرێت.

**لە هەموو بوارێکدا کاتێگۆری پێویستە، تەنانەت لە ماتماتیکیشدا**

گەر مرۆ بڕیارە پێکهاتەییەکان کە چواندنی ئۆبژێکتییان هەیە، دابەشێنێت، ئەوا دەبینێت کە ئەوان هەرگیز تەنیا لە لێڕوانین پێکنایەن، واتا لەو لێڕوانینانە کە وەک دەگۆترێت گۆیا ئەوان تەنیا بەرێی بەراوردەوە لە بڕیارێکدا گرێدراون، بە پێچەوانەوە بڕیارە پێکهاتەییەکان مەحاڵ دەبوون گەر هاتوو تێگەیەکی پەتیی زەینی نەهاتایەتە پاڵ ئەو تێگانە کە لە لێڕوانینەوە دەرکێشراون و لەژێریدا خودی ئەو تێگانە یەکبخرانایە. بەم شێوەیە تێگەکان کە لە لێڕوانینەوە دەرکێشراون، لە بڕیارێکدا گرێ دەدرێن کە چواندنی ئۆبژێکتیی هەیە. تەنانەت بڕیارەکانی ماتماتیکی پەتی لە سادەترین هزردۆزەکانیدا (ئەکسیۆمەکانیدا) بەدەر نین لەم مەرجە. بۆ نموونە هزردۆزی: «ڕاستەهێڵ کورتترین هێڵە لە نێوان دوو پنتدا»، پێشمەرجەکەی ئەوەیە کە هێڵ لەژێر تێگەی قەوارەدا یەکدەخرێت، ئەم تێگەیەش بەجەختی لێڕوانین نییە، بەڵکو تەنیا لەنێو زەیندایە.

**ئەزموون بەندە بە گرێدانی پێکهاتەییانەی دەرککردنەکانەوە کە بە یاریدەی کاتێگۆری ئەنجام دەدرێت؛ ڕێسا ئاپریۆریەکان کە زەرووەرەی ئەم گرێدانە دەردەبڕن، بریتین لە پرنسیپە بناغەییەکانی زەینی پەتی**

ئەزموون بریتییە لە گرێدانی پێکهاتەیی دیاردەکان (دەرککردنەکان) لەنێو ئاگاییەکدا، ئەمە بێگومان گەر هاتوو گرێدانەکە زەرووری بێت. بۆیە تێگە پەتییە زەینییەکان ئەوانەن کە دەبێت سەرەتا هەموو دەرککردنەکان لەژێریاندا یەکبخرێن، ئیدی بەدووی ئەوەدا دەرککردنەکان دەبن بە دەسوێژ بۆ بڕیاری ئەزموونی کە تێیدا یەکایەتیی پێکهاتەیی دەرککردنەکان وەک زەرووری و چواندووی گشتی پێشبینی دەکرێت ([2]).

گەر بڕیارەکان تەنیا مەرج بن بۆ یەکێتیی پێشبینیگەلی دراو لەنێو ئاگاییەکدا، ئەوا بریتین لە ڕێسا. گەر ئەم ڕێسایانە یەکێتییەکە وەک زەرووری پێشبینی بکەن، ئەوا ڕێسان بە ئاپریۆری، ئەوجا گەر ڕێساگەلی دی لە سەرووی ئەوانەوە نەبن و لێوەیان ئەوان هەڵهێنجرابن، ئەوا بریتین لە پرنسیپی بناغەیی (fundamental principles / Grundsätze).

---

٢) بەڵام ئایا بنەمای: بڕیارە پێکهاتەییەکان گەرەکە لە پێکهێنانی دەرکردنەکاندا زەرووورە لە خۆ بگرن. هەروەها بنەماکەی سەرەوەم کە من بە هەمەلایەنی جەختم لێکردووە و بریتییە لە: ئەزموون وەک مەتریفەی ئاپۆستەریۆری تەنیا پێی دەکرێت بڕیاری بەرێکەوت بخاتەوە، چۆن یەکدەگرنەوە؟ گەر من بێژم: ئەزموون شتێکم فێردەکات، ئەوا من لێرەدا هەردەم مەبەستم لە دەرککردنە کە لەنێو ئەزموونەکەدایە. وەک بۆ نموونە من دەبێژم: گەر تیشکی خۆر بەسەر بەردا بپەخشێت، هەردەم گەرمی دێتەگۆڕێ. کەواتە بڕیارە ئەزموونییەکە هەردەم بەرێکەوتە. بێگومان ئەم گەرمکردنە کە بەزەرووری لە پەخشانی تیشکی خۆرەوە دێتەگۆڕێ، خۆی (بە یاریدەی تێگەی هۆ) لەنێو بڕیارە ئەزموونییەکەدا دەبینێتەوە، بەڵام من بەرێی ئەزموونەوە فێری ئەمە نابم، بەڵکو بە پێچەوانەوە دوای ئەوە کە تێگەکەی زەین (تێگەی هۆ) دێتە پاڵ دەرککردن، ئیدی ئەزموون چێدەبێت.

لەبەر ئەوەی ئەم پرنسیپە بناغەییانەی ئەزموونی شیاو هاوکات یاسای سروشتین (ئاخر سروشت سەرجەمێتیی ئەزموونی شیاوە)، ئەوا پرسیارەکە سەبارەت بە شیمانەی زانستی سروشتیی پەتی وەڵامدرایەوە
بێگومان پرنسیپە بناغەییەکانی ئەزموونی شیاو هاوکات یاسای گشتیی سروشتن و دەشێت بە ئاپریۆری بناسرێن. کەواتە کێشەی ئەم دووەم پرسیارەی بەردەممان، واتا: ئایا چۆن زانستی سروشتیی پەتی دەشێت، بە دروستی چارەسەر کرا.

**کاتێگۆری بۆ دراوی ی دیاردەکان پێویست نییە (بە پێچەوانەی فۆرمەکانی لێروانینەوە کە بۆ ئەو دراوییە پێویستن)، بەڵکو تەنیا بۆ هاتنەئارای «ئەزموون» (لە مەغزای مەئریفەی یاسادا) پێویستە**

تێگەکان لەم پرنسیپە بناغەییانەدا بە چەشنێک تەرخان دەکرێن کە ئیدی سەرجەم شتەکان خۆیان ئاپریۆریانە بەزەرووری تەنیا وەک بابەتگەلی ئەزموون لەژێر ئەو مەرجە نابرراوانەدا دەبیننەوە.
لەمەوە، دووەم، شێوەیەکی تایبەتیی سەلماندنی ئەوان دێتەگۆڕێ: پرنسیپە بناغەییە هزرێنراوەکان راستەوخۆ روویان ناکرێتە دیاردەکان و پەیوەندییان، بەڵکو روویان دەکرێتە شیمانەی ئەزموون، لێرەشدا دیاردەکان تەنیا کەرەسەی (ماتەریی) ئەزموونن نەک فۆرمی ئەزموون، واتا رووی پرنسیپە بناغەییەکان دەکرێتە بڕیاری پێکهاتەیی بە چواندنی ئۆبژێکتی و گشتییەوە، هەر لەمەشدا بڕیاری ئەزموونی لە بڕیاری دەرکی جیادەبێتەوە.

ئێستا دەتوانین هەنگاوبنێین بۆ وەڵامدانەوەی دژە ئەرگومێنتەکانی هیوم

ئێستا ئێرە ئەو شوێنەیە بۆ ئەوە کە ئیدی گومانەکەی هیوم یەکلابکەینەوە. هیوم رەوایە کاتێک دەبێژێت: ئێمە بە هیچ شێوەیەک ناتوانین بە ئاوەز لە شیمانەی کاوساڵێتی تێبگەین، واتا تێبگەین لە شیمانەی پەیوەندیی هەبوونی شتێک بە هەبوونی شتێکی دیکەوە کە ئەوی یەکەمیان دووەمیانی بەزەرووری داناوە.
من سەرەڕای ئەوە زۆر دوورم لەوە گریمانە بکەم کە ئەم تێگانە تەنیا لە ئەزموونەوە وەرگیراون و ئەو زەرووریەیەش کە لە ئەواندا پێشبینی دەکرێت، تەنیا ئەندێشە و رواڵەتی پەتییە، رواڵەتێک کە خووی باو بۆمانی وێنەدەداتەوە. من بە پێچەوانەوە بەتێری پێشانم دا کە ئەو تێگانە، هەروەها پرنسیپە بناغەییەکان کە لەو تێگانەوە دەرکێشراون، بە ئاپریۆری لە پێش سەرجەم ئەزموونەوە بەمسۆگەری لەگۆڕێن، بەڵام هێندە نەبێت کە ئەوان تەنیا پەیوەند بە ئەزموونەوە خاوەنی دروستیی ئۆبژێکتیانەی گومانلێنەکراویانن.

ئەزموون وەك مەئریفەی ئۆبژێکتییانە چواندووی دیاردەکان تەنیا بە یاریدەی کاتێگۆری و پرنسیپی بناغەیی دەشێت؛ بۆ نموونە مەئریفەی رەوتی کاتی دیاردەگەل بە چواندنی ئۆبژێکتییەوە کاتێك لەگۆڕێ دەبێت گەر ئێمە ئەم دیاردانە بەگوێرەی یاسای کاوساڵێتی پێکەوەگرێبدەین

دەشێت مرۆ لە دەرککردندا بە ڕێسایەکی پەیوەندی بگات کە دەبێژێت: بەردەوام بەدووی دیاردەیەکی تایبەتیدا دیاردەیەکی دی دێت (بێگومان نەک بە پێچەوانەوە)، ئەمەش ڕەوشێکە کە وام لێدەکات بڕیاری گریمانەیی (هیپۆتێزی) بەکاربهێنم و بۆ نموونە ببێژم: گەر خۆر بۆ ماوەیەکی کافی تیشک بپەخشێنێتە سەر تەنێک، ئەو تەنە گەرم دادێت. بێگومان جارێ لێرەدا زەرووڕەیەکی گرێدان، بەمەش تێگەی هۆ، لەگۆڕێ نییە. من پەیوەند بەمەوە دەبێژم: گەر گەرەک بێت ئەو بڕیارەی سەرەوە کە تەنیا گرێدانێکی سەبژێکتیانەی دەرکردنەکانە، بڕیارێکی ئەزموونی بێت، ئەوسا دەبێت وەک زەرووری و چاندووی گشتی لێی بڕوانرێت. بڕیارێکی بەم چەشنە ئەوهایە: خۆر بەڕێی تیشکەکەیەوە هۆی گەرمییە. ئێستا ڕێسا ئەمپیریەکەی سەرەوە وەک یاسا لێدەڕوانرێت، بێگومان نەک وەک چواندوو تەنیا بۆ دیاردە، بەڵکو وەک چواندوو بۆ دیاردە بە مەبەستی ئەزموونێکی شیاو کە بەتەواوی، واتە بەزەرووری، پێویستی بە ڕێساگەلی چواندوو هەیە. بەڵام من بە هیچ شێوەیەک واینابینم کە بشێت شتێک بەگشتی هۆ بێت، چونکە تێگەی هۆ ئاماژە نادات بۆ مەرجێکی هەڵواسراو بە شتەکانەوە، بەڵکو دەیدات بۆ مەرجێکی هەڵواسراو بە ئەزموونەوە، واتا ئەوە تەنیا ئەزموونە کە دەشێت بریتی بێت لە مەئریفەیەکی ئۆبژێکتیانە چواندووی دیاردەکان و ڕەوتی کاتەکییان، ئەمەش بێگومان گەر هاتوو دیاردەی ڕابورد و دیاردەی پاشهات پێکەوە بەگوێرەی ڕێسای بڕیارگەلی گریمانەیی (هیپۆتێزی) گرێبدرێن.

**کاتێگۆریەکان تەنیا دەسوێژن بۆ کردنی دیاردە بە «ئەزموون»؛ ئەوان لە ئەزموونەوە هەڵنەهێنجراون، وەك چۆن لە ئەمپیریزمدا دەگۆترێت، بە پێچەوانەوە ئەزموون لە ئەوانەوە هەڵهێنجراوە**

بۆیە گەر تێگە پەتییە زەینییەکان لە بابەتەکانی ئەزموونەوە دەربچن و ڕووبکەنە شتەکان لە خۆدا (نۆمێنا)، ئەوا هیچ واتایەکیان نابێت. ئەوان تەنیا دەسوێژن بۆ هونجەکردنی دیاردەکان تاکو بەم شێوەیە بتوانن وەک ئەزموون بییانخوێننەوە. پرنسیپە بناغەییەکان لەو پەیوەندییەوە سەرهەڵدەدەن کە دیاردەکان بە جیهانی سێنسییەوە هەیانە، بەمەش ئەوان تەنیا دەسوێژن بۆ زەینمان تاکو بۆ ئەزموون بەکاریان بهێنێت. بەدەر لەمە تەنیا گرێدانی هەوەسمەند هەیە بەبێ هیچ داکەوتێکی ئۆبژێکتی.
کەواتە ئەم چارەسەرکردنە تەواوەتییەی کێشەکەی هیوم، کە ئەو خۆی نەیتوانی پێشبینیی بکات، سەرچاوەی ئاپریۆریانەی تێگە پەتییەکانی زەین و هەروەها چواندنی وەک یاسای زەین وەرگیراوی یاسا گشتییەکانی سروشتیش ڕزگار دەکات، ئەویش بەوە کە بەکارهێنانیان تەرخان دەکات بۆ ئەزموون، چونکە شیمانەی هەبوونی ئەوان تەنیا بۆ ئەو پەیوەنییە دەگەڕێتەوە کە زەین بە ئەزموونەوە هەیەتی، کەواتە ڕزگارکردنەکە بە چەشنێک نییە کە هەروەک ئەو تێگانە لە ئەزموونەوە، بەڵکو ئەزموون لە ئەوانەوە هەڵدەهێنجرێت. ئەم گرێدانە پێچەوانەیە هەرگیز بە هزری هیومدا نەهات.
ئێستاش لە سەرجەمی توێژینەوەکانمانەوە کە تا ئێستا ئەنجاممان داون، ئەم سەرەنجامە دەکەوێتەوە: «سەرجەم پرنسیپە پێکهاتەییە ئاپریۆریەکان تەنیا پرنسیپی ئەزموونی شیاون» و هەرگیز ناشێت ڕوویان

بکرێته شتەکان لە خۆدا، بەڵکو تەنیا دەشێت روویان بکرێته دیاردە وەک بابەتی ئەزموون. بۆیە چە ماتماتیکی پەتی و چە زانستی سروشتیی پەتی تەنیا پێیان دەکرێت رووبکەنە دیاردەی پەتی و تەنیا پێشبینیی ئەوە دەکەن کە ئەزموون بەگشتی دەیشێنێت یان دەبێت لە هەر ئەزموونێکی شیاودا پێشبینی بکرێت، چونکە لەم پرنسیپانەوە هەڵهێنجراوە.

**دیاردە ئاماژە بۆ شت لەخۆدایەك دەدات کە سێنسەکانمان بارگاوی دەکات، بەڵام ئێمە بە هیچ شێوەیەك ناتوانین ئەم شت لەخۆدایە بەتەواوی دیاری بکەین، چونکە کاتێگۆریەکانیش تەنیا روودەکەنە بابەتەکانی ئەزموونی شیاو، کەواتە روودەکەنە دیاردە**

گەر ئێمە، جا چەند بە سادەییش بێت، بابەتی سێنسەکان تەنیا بە دیاردە دابنێین، ئەوا ئێمە هاوکات بەم رێیەوە ئیئتراف دەکەین کە شت لەخۆدایەک بناغەی ئەو بابەتانەیە، جا گەرچی ئێمە ئەو شتە لە پێکهاتەی خۆیدا ناناسین، بەڵکو تەنیا دیاردەکەی دەناسین، واتا ئەوە دەناسین کە بە چە شێوەیەک سێنسەکانمان لە لایەن ئەو شتە نەناسراوەوە بارگاوی دەکرێت. کەواتە کاتێک زەین بەو رێیەوە دیاردەگەل وەردەگرێت، ئیدی هەروەها ئیئتراف بە هەبوونی شتەکان لە خۆدا دەکات، بۆیە ئێمە دەتوانین بیبێژین: پێشبینیکردنی ئەو جۆرە کرۆکانە (Wesen) کە بناغەی دیاردەکانن، بەمەش پێشبینیکردنی کرۆکی زەینی، نەک تەنیا رێپێدراوە، بەڵکو پێویستیشە.

هەروەها هەڵهێنجانە (دێدوکسیۆنە) رەخنەییەکەمان بە هیچ شێوەیەک ئەو جۆرە شتانە (نۆمینا) بەدەرناکات، بە پێچەوانەوە هەڵهێنجانەکەمان پرنسیپە بناغەییەکانی ئێستێتیک بە چەشنێک تەرخان دەکات کە ئیدی پەل نەهاون رووەو هەموو شتەکان و ئیدی بەو رێیەشەوە هەموو شتێک ببێت بە دیاردەی پەتی، بەڵکو ئەو پرنسیپە بناغەییانە گەرەکە تەنیا چواندنیان بۆ بابەتەکانی ئەزموونێکی شیاو هەبێت. کەواتە بەم رێیەوە دەرفەت بە هەبوونی کرۆکی زەینی دەدرێت، بەڵام ئەمە تەنیا بە جەختکردن لەم رێسایەی خوارەوە کە هیچ ئاوارتەیەک قبووڵ ناکات: ئێمە نە لەبارەی ئەم کرۆکە زەینییانە هیچ دەزانین و نە دەتوانین بیزانین، چونکە تێگە پەتییە زەینییەکانمان کە لێروانینی پەتین، تەنیا روودەکەنە بابەتەکانی ئەزموونی شیاو، بەمەش تەنیا روودەکەنە کرۆکی سێنسی و هەر ئەوەندەی مرۆ خۆی لەم کرۆکانە دابرێت، ئیدی ئەو تێگانە هیچ واتایەکیان نامێنێت.

**ئێمە سەرچاوەی یاساکانی سروشتین؛ زەین یاسا بەسەر سروشتدا دەسەپێنێت**

تەنانەت خودی بنەما سەرەکییەکە کە بەنێو سەرجەمی ئەم برگەیەدا ئاوەڵاکراوە و دەبێژێت: یاسا گشتییە سروشتییەکان شیاوی ناسینن بە ئاپریۆری، لە خودی خۆیەوە دەمانگەیەنێت بەم بریارە: باڵاترین یاسادانان بۆ سروشت دەبێت لەنێو ئێمەدا بێت، واتا لە زەینماندا بێت، هەروەها ئێمە نابێت لە خودی سروشتەوە بە یاریدەی ئەزموون بۆ یاسا گشتییەکانی ئەو بگەرێین، بەڵکو بە پێچەوانەوە دەبێت لە مەرجەکانی شیمانەی ئەزموونەوە کە خۆیان لەنێو سێنسێتی و زەینماندا دەبیننەوە، بەگوێرەی

ئەو یاسادانانە گشتییە بۆ خودی سروشت بگەڕێین. ئاخر گەر ئەوها نەبێت، ئیدی ئایا چۆن بتوانین ئەم یاسایانە بە ئاپریۆری بناسین کە ڕێسای مەتریفەی شرۆڤەیی نین، بەڵکو پەرەپێدانی پێکهاتەیی ڕاستەقینەی مەتریفەن؟ یەکگرتنەوەیەکی بەم چەشنە زەروریی پرنسیپەکانی ئەزموونی شیاو لەتەک یاساکانی شیمانەی سروشتدا تەنیا لەبەر دوو هۆ شیاوە: یان ئەم یاسایانە لە سروشتەوە بە دەسوێژی ئەزموون وەردەگیرێن، یان بە پێچەوانەوە سروشت لە یاساکانی شیمانەی ئەزموونەوە وەردەگیرێت و تەواو یەکانگیرە بە یاسامەندییە گشتییەکانی ئەزموون. هۆی یەکەمیان دژبێژیی خۆی دەکات، چونکە دەشێت و دەبێت یاسا گشتییەکانی سروشت بە ئاپریۆری (واتا سەربەخۆ لە سەرجەم ئەزموون) بناسرێن و بکرێن بە بناغەی سەرجەم بەکارهێنانی ئەمپیریانەی زەین. کەواتە تەنیا هۆی دووەم دەمێنێتەوە.

ئەوە کە من پەیوەند بە هۆی دووەمەوە دەیبێژم، سەرەتا سەیر دەنوێنێت، بەڵام سەرەڕای ئەوە جەختە: زەین یاساکانی خۆی لە سروشتەوە (بە ئاپریۆری) هەڵناهێنجێت، بەڵکو یاساکانی بەسەر سروشتدا دەسەپێنێت.

بەم شێوەیە زەین بریتییە لە سەرچاوەی ڕێکخراوییە گشتییەکەی سروشت، ئەویش بەوە کە دیاردەکان لەژێر یاساکانی خۆیدا دیاری دەکات، بەو ڕێیەشەوە ئاپریۆریانە ئەزموون (بەگوێرەی فۆرمەکەی) دەهێنێتە ئاراوە، ئیدی هەر شتێک بەڕێی ئەزموونەوە شیاوی ناسین بێت، بەزەرووری دەخرێتە ژێر ڕکێفی یاساکانییەوە.

سەرچاوە

تێبینی:

ئەم ئیشە ڕەخنەییانەی کانت کە بە زنجیرە لە گۆڤاری سەردەمدا بڵاویان دەکەینەوە، کورتکراوەی ئیشەکانی ئەون بە مەبەستی ڕەخساندنی دەرفەتی دیدێکی گشتی بۆ سەرجەم ئیشەکەی کە ئەنجامدراوە لە:

Kant. Ausgewählte Schriften. Die Grundlagen des kritischen Denkens. Hrsg. Von Gerhard Stenzel. Bearbeitung und Einleitung: Walter Del-Negro. Bertelsmann Lesering. 1958.

فەرهەنگۆك

ئەم فەرهەنگۆکە بەگوێرەی ئەلفبای کوردی_لاتینی ڕێکخراوە.

ئاپۆدیکتی: چواندن بێ هیچ شیمانەیەکی گومانلێکردن. بۆ نموونە لە لۆگیکدا گۆتە هەیە کە نەشیاوە پێچەوانەکەی ڕاست بێت.

ئاپۆستەریۆری: پاش ئەزموون. بۆ نموونە گۆتە هەیە کە پاش ئەزموون (دەرککردن) سەرهەڵدەدات.

ئاپریۆری: پێش ئەزموون. لای کانت بڕیاری ئاپریۆری ئەو جۆرەیە کە بەدەر لە ئەزموون سەرهەڵدەدات و تەنانەت پێشمەرجی ئەزموونە، کەواتە دەشێت ئەزموون لەو جۆرە بڕیارانەوە هەڵبهێنجرێت.
بڕیار: (یان حوکم) رستەی لۆگیکییە کە لە بکەر و هەڵگیراو پێکدێت. بۆ نموونە: گوڵەکە بۆنخۆشە. گوڵەکە بریتییە لە بکەر، بۆنخۆش بریتییە لە هەڵگیراو، هەردووکیان بە ڤێربی ناتەواوی «ە« پەیوەند کراون.
ئەریتمێتیک: ئەو بەشەی ماتماتیکە کە بە ژمارە و ژماردنەوە خەریکە.
جیۆمەتری: ئەندازە
چاپاندن: (ئینطیباع / Eindruck / Impression) چاپبوون بەرێی دەرککردنەوە لەنێو کایەی سێنسیدا.
کاوساڵێتی: کاوزا بەواتای هۆکار. تێگەیەکە بۆ هەبوونی پەیوەندی لە نێوان هۆ و ئەنجام یان کردار و پەرچەکرداردا.
کردەکی: (actual / wirklich): لەگۆڕێبووی فاکتی.
ئەمپیری: بەدیهێنراو یان پێگەییو لە ئەزموونەوە. ئاپۆستەریۆری، کەواتە: پاشئەزموونی.
سێنسێتی: توانستی وەرگری فیزیۆلۆگیانەی مرۆڤ بۆ چاپاندن، بۆ چێکردنی شئوور لە دەرککردنی شتە دەرەکییەکانەوە.
ترانسێندێنتال: واتای فەرهەنگی: پەڕینەوە، پەڕییەوە. واتای تێگەیی: لەوبەر ئەزموونەوە، بەدەر لە ئەزموون. لای کانت بەواتای: پێشمەرج بۆ شیمانەی هەبوونی ئەزموون. مەئریفەی ترانسێندێنتال خۆی بە بابەتەکانەوە خەریک ناکات، بەڵکو بە جۆری مەئریفەی بابەتەکانەوە لەو شێوەیەدا کە چۆن ئەو مەئریفەیە بە ئاپریۆری، لە پێش ئەزموونی یان دەرککردنی بابەتەکانی نێو جیهانەوە هەیە. جگە لەوە واتاکەی جیاوازە لە واتای تێگەی «ترانسێندێنت». ئەمیان بەواتای: نەشیاوی زانین. کە دەڵێین جیهان ترانسێندێنتە، مەبەستمان لەوەیە کە ناتوانین لەبارەی ئەو بزانین.

تێبینی
لەم بەشەی دووەمی ئیشەکەی کانتدا وەرگێڕانی ناڵەباری یان تەنانەت هەڵەی هەندێک تێگەی کانت گۆڕراوە یان راستکراوەتەوە (ک.ج.).

# پانۆرامایەکی مێژوویی گشتگیر دەربارەی فەلسەفەی سیاسی

نووسینی: هاشم سالح
لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

(فەلسەفەی سیاسی لە سەردەمی مۆدێرنەدا) کتێبێکی مەنهەجی ئەکادیمی هاوبەشی هەردوو فەیلەسوفی فەرەنسی «لۆک ڤێری» و «ئالان رینۆ»یە. فەیلەسوفی یەکەمیان «لۆک ڤێری» دوای ئەوەی شوێنی سارتەر و فۆکۆ و دۆلۆزی گرتەوە و چووە سەر عەرشی فەلەسەفەی فەرەنسی، ناو و ناوبانگێکی گەورەی لە فەرەنسادا پەیداکرد. بێگومان جگە لە لۆک ڤێری فەیلەسوفی ناودار و بایەخداری دیکە هەیە، بەڵام لە ئێستادا ئەو لە هەمویان دیارترە. ئاشکرایە ئەم فەیلەسوفە لەسەردەمی فەرمانڕەوایی جاک شیراک دا، بووە وەزیری پەروەردەی نیشتیمانی، ئەمەش بۆ یەکەمجار بوو وەزارەتی پەروەردە بدرێت بە فەیلەسوفێک. سەرەڕای ئەوە کتێبە زۆرەکانی ئەم فەیلەسوفە،






بۆ زیاد لە بیست زمانی جیهانی وەرگێڕدراون و لە ناوەوە و لە دەرەوەی فەرەنسا سەرکەوتنێکی گەورەیان بەدەستهێناوە.

هەرچی فەیلەسوفی دووەمــە، واتــە «ئـالان رینۆ» ئەویش فەیلەسوفێکی ناسراوە، بەڵام بە قەبارەی لۆک ڤێری هاوڕێی نییە. ئالان رینۆ لە زانکۆی سۆربۆن مامۆستای فەلسەفەی سیاسییە، هـەروەهـا بـەڕێـوەبـەری ڕوانگەی ئەورووپییە بۆ سیاسەتی زانکۆیی. ئەمەش مانای وایە ئەم فەیلەسوفە هێند گرنگ و بایەخدارە، کە یەکێتی ئەورووپا وەک ڕاوێژکارێکی خۆی داینابوە، بگرە بەرپرسی پلاندانانی سیاسەتە تایبەتەکانی یەکێتی ئـەورووپـایـە لە بـورای خوێندی زانکۆیی. ڤێری و ڕینۆ دوو هاوڕێی یەکترن و دژ بە ڕەوتـی چەپی تـونـدڕەو و هەرزەگۆی فیکری تێدەکۆشن.



لۆک ڤێری

هەر یەک لەم دوو فەیلەسوفە، لە ساڵی ١٩٨٤ دا، کاتێ کتێبێکی بوومەلەرزە ئاسایان دژ بە فەیلەسوفە چەپخوازە توندڕەوەکان بڵاوکردەوە کە لەو سەردەمەدا گۆڕەپانەکەیان کۆنترۆڵ کردبوو، ناوبانگیان پەیداکرد. واتە کتێبەکەیان دژ بە فەیلەسوفانی وەک فۆکۆ و دۆلـۆز و جان فرانسوا لیتوار و جـاک دێریدا و پییر بۆردیۆ و جاک لاکان بوو. هـەنـدێـک پێیان وا بـوو ئەم هـێـرشـە سەرکەوتوانەیە، لە بـەرژەوەنـدی ڕاستڕەوی فەرەنسی بوو کە سەرۆک وەزیرانی کۆچکردوو «ڕیمۆن بار» نوێنەرایەتی دەکرد. پێدەچێ ئەم دوو فەیلەسوفە بەشێوەیەک لە شێوەکان لە «ڕیمۆن بار»ەوە نزیک بووبن.



بەڵام وادیارە فەرەنسا لەو سەردەمەدا، بێزار ببوو بەدەست ئەزمونی چەپ و یاریکردنی منداڵانەی بزووتنەوەی خوێندکارانی ساڵی ١٩٦٨. پێدەچێت فەرەنسا لەو سەردەمەدا پێویستی بە هێمنی و پشوودان و گەڕانەوە بۆ بەها تەقلیدییە چەسپاوەکان بووبێت، لە جۆری ڕێزگرتنی دەسەڵات و خێزان و هاوسەرگیری و دوورکـەوتـنـەوە لە لادانـە سێکسییەکان و کەمکردنەوەی زیـادەڕۆیـیـکـردن لە چێژ و لەززەتە جەستەییەکان. لێرەوە پێویستە بەرهەمە سیاسی و فەلسەفییەکانی لۆک ڤێری و ئالان ڕینۆ، ئا لەو بارودۆخەدا، هەڵسەنگێنین. ئەمە سەرەڕای ئەوەی ئەو دوو فەیلەسوفە، لە لایەنگرانی فەلسەفەی عەقڵانییەتی کانتیزمن نەک فەلسەفەی ناعەقڵانی نیتچە لەسەر شێوازی فۆکۆ و دۆلۆز.

هەر دوو نووسەر لەم کتێبەیاندا کە ئاراستەی خوێندکارانی زانکۆو خوێندی باڵایان کردووە، پانۆرامایەکی مێژوویی گشتگیر دەربارەی فەلسەفەی سیاسی، لە سەدە هەرە کۆنەکانەوە تا ئەمڕۆ، دەخـەنـەڕوو. بەڵام بە پلەی یەکەم بایەخیان زیاتر بە سەردەمی هاوچەرخ داوە، مەبەستمان لە سەردەمی هاوچەرخ، قۆناغی دوای سەرهەڵدانی

مۆدێرنەی ڕۆشنگەرییە تا ڕۆژی ئەمڕۆ.
کتێبەکە لە ڕووی مەنهەجییەوە بۆ سێ بەش و چەند نەسکێک دابەشکراوە. بەشی یەکەم ئەم ناونیشانەی لەخۆگرتووە: (ململانێ تازەکەی نێوان نەوەی کۆن و نەوەی تازە)، هەردوو نووسەر لەم بەشەدا قسە لەسەر ڕەخنەی فۆکۆ و لیوتار و دۆلۆز لە ڕۆشنگەری، دەکەن. بەڵام پێش ئەوە، قسە لەسەر ڕەخنەی مامۆستا گەورەکەیان «مارتن هایدگەر» لە ڕۆشنگەری، دەکەن. ئاشکرایە ئەم فەیلەسوفە ئەڵمانییە بەناوبانگە، ئەو بوو کۆمەڵێ گورزی کەمەرشکێن و بەئازاری سرەواندە ڕۆشنگەری و تەکنەلۆژیای مۆدرێن، گەرچی نیتچە پێش ئەو بەم کارە هەستابوو. لەم ڕووەوە نیتچە باوکی هەموانە، ئەو دەستپێشکەر بوو لە ڕەخنەگرتن لە مۆدێرنە. پێش ئەو کەس بوێری ئەوەی نەدەکرد کارێکی لەو جۆرە بکات. چونکە ئەوە بە پاشەکشەکردن لە هێڵی کانت و هیگڵ دادەنرا، کانت و هیگڵ هەرگیز بەخەیاڵیاندا نەدەهات گومان لە شارستانیەتی مۆدرێن و ڕۆشنگەری بکرێت.

هەردوو نووسەر لە بەشی یەکەمی کتێبەکەیاندا، بە دوور و درێژی لەسەر ڕەخنەی هایدگەر لە مۆدێرنە، ڕادەوەستن. لێرەدا فەیلەسوفی گەورە، واتە هایدگەر، ناڕازییە بە هەیمەنەی تەکنەلۆژیا لەسەر سروشت، بگرە ناڕازییە لەوەی تەکنەلۆژیا، بەرائەتی ڕەسەنی ژیانی سروشتی و مرۆیی لەناوبردووە. لە ڕاستیدا ئەم ڕەخنەیەی هایدگەر، تا ئاستێکی گەورە لە جێی خۆیدابوو. بەڵگەش بۆ ئەوە بریتییە لە



دۆلۆز

دەرکەوتنی پارتی سەوز یان ژینگە کە بەرگری لە سروشت دەکەن. ئەم پارتانە دوای ئەوەی ئەوروپا پێی نایە ناو سەردەمی پیشەسازییەوە، بەرگری لە سروشت و دارستانەکان و کێڵگەکان و گوندەکان دەکەن، چونکە ئەو شوێنانە وردە وردە خەریکە بەرەو لەناوچوون دەچن. ئاشکرایە نەک تەنها سروشت خەریکە لەناو دەچێت، بەڵکو شیعریش خەریکە بەرەو لەناوچوون یان بەرەو پشتگوێخستن دەچێت.

لێرەوە هایدگەر پێمان دەڵێ: (بەڵێ بۆ زانست و تەکنەلۆژیا، بەڵام بەو مەرجەی مرۆڤبوونی

مرۆڤەکان نەهارێت و بەرائەتی سروشت لەناونەبات و دارستانەکان و سەوزایی سەر گۆی زەوی لە ڕەگەوە هەڵنەکێشێت). ئاشکرایە هایدگەر تا ئاستێکی زۆر پەیوەست بوو بە دارستانە جوانەکانی ئەڵمانیاوە، بە تایبەتی ئەو دارستانە ڕەشەی تێیدا کوخێکی بچووکی دروست کرد، تاکو لە خەڵکی دوورکەوێتەوە و بنووسێ و بیربکاتەوە. زۆرجار خووی بەوەوە گرتبوو لەنێو باوەشی سروشتدا، پیاسەی دوور و درێژ بکات، لەمەشدا هەمان خووی مامۆستا گەورەکەی «نیتچە»ی گرتبوو. ئەم خووی پیاسەکردنە بەناو سروشتدا لای جان جاک ڕۆسۆ-ش هەبووە و ناوبانگی پێ دەرکردووە.

سروشت بەلای هەموومانەوە، ئەو دایکە میهرەبان و بەسۆزەیە ئەگەر لەناومانبرد، ئەوا ئێمە بوونی خۆمان دەشێوێنین و بە دەستی خۆمان، خۆمان لەناودەبەین.

دواتر هەردوو نووسەر بەردەوام دەبن و دەڵێن: (ئەم بیروڕایانەی هایدگەر لە سییەکان یان لە چلەکانی سەدەی ڕابردوودا دەرکەوتن، بەڵام ئێمە لە مانا و مەغزا قووڵەکانی تێنەگەشتن، تەنها بەم دوایییانە نەبێت، ئەویش دوای ئەوەی ئاوهەوا پیس بوو، پلەی گەرمی زەوی بەرزبووەوە، تادێت لێرەو لەوێ ژمارەی لافاو



فۆکۆ




و کارەساتە سروشتییەکان لە زۆربــوون و بەرفراوانبووندایە. ئەمەش مانای وایە هایدگەری فەیلەسوف لانی کەم بە ٤٠ یان ٥٠ ساڵ پێش سەردەمەکەی خۆی کەوتبوو. ئائەمەیە سیفەتی فەیلەسوفە گەورەکان، ئەوان بە پێچەوانەی خەڵکانی سادە یان بە پێچەوانەی بیرمەندە بچووکەکان، زۆر دوورتر دەبینن).

نووسەری ئەم کتێبە لە بەشی دووەمدا، قسە لەسەر فەلسەفە گەورەکانی مێژوو دەکات کە بە درێژایی دوو سەدەی ڕابردوو لە ئەورووپادا دەرکەوتن. واتە فەلسەفەی هیگڵ و فەلسەفەی ئۆگشت کۆنت و ئەوانی دیکە. ئاشکرایە هەر فەیلەسوفێکی گــەورە و مــەزن، تێڕوانینێکی گشتگیر دەربارەی مێژووی مرۆڤایەتی و ڕەوتی ڕووداوەکان و ئایندەی ڕۆژگار، گەڵاڵە دەکات. هەندێجار ئەو تێڕوانینە ڕاست دەردەچێت و هەندێجاری دیکە ئایندە بە درۆی دەخاتەوە. بۆ نموونە پێشبینی مارکس بە حەتمیەتی کەوتنی سەرمایەداری نە ڕاست بوو نە هاتەدی. وەلێ هەندێ لە شیکردنەوەکانی دیکەی لەجێی خۆیدا بوو. دەکرێ هەمان شت لەسەر نیتچە بڵێین، نیتچە بە ٤٠ یان ٥٠ ساڵ پێش بەرپابوونی جەنگە جیهانییەکان، پێشبینی بەرپابوونی ئەو جەنگانەی کردبوو. ئەمە لە کاتێکدا بوو، زۆرێک پێیانوابوو ئەورووپا بە تەواوی بووەتە ئەورووپایەکی شارستانی و قۆناغی هەمەجییەتی بە تەواوی تێپەڕاندووە و چیتر ناگەڕێتەوە بۆ ئەو قۆناغە. ئەورووپا دوای سەرکەوتنی ڕۆشنگەری عەقڵانی بەسەر ئسوڵیەتی مەسیحی، چیتر لەناوخۆیاندا دەرگیری یەک نابن و جەنگ لە

دژ یەک بەرپاناکەن. بەڵام دوای مردنی نیتچە لە ساڵی ١٩٠٠، جەنگی جیهانی یەکەم ساڵی ١٩١٤ و جەنگی جیهانی دووەم ساڵی ١٩٣٩ بەرپابوو.

لە ڕاستیدا چەندین فەلسەفەی مێژووی هەیە، چونکە هەر فەیلەسوفێکی گەورە، فەلسەفەکەی لەسەر جووڵەی مێژوو و چارەنوسی ڕەگەزی مرۆڤایەتی، بونیاد دەنێت. بۆ نموونە جان جاک ڕۆسۆ، سەبارەت بە مێژوو، فەلسەفەیەکی تایبەت بەخۆی گەڵاڵەکرد و تێیدا دەڵێ ڕۆژێک دێت شارستانیەتی مۆدرێن دەگاتە دیوارێکی داخراو، ئەگەر شان بەشانی پێشکەوتنە ماددیی و تەکنەلۆژییەکەی، پێشکەوتنێکی ئەخلاقی و مرۆییانە، بە هەمان ئاست، نەیەتەئارا. ئەوەتا ڕۆژگار دوای ٢٠٠ ساڵ تێپەڕین بەسەر ئەو پێشبینییەدا، ڕاستی ئەو پێشبینییەی سەلماند. لە ئێستادا خۆرئاوای لووتبەرز، دووچاری قەیران بووە و قەیرانەکەی بە پلەی یەکەم قەیرانێکی ئەخلاقی و ڕۆحانییە.

لێرەوە ڕەخنەگرتن لە مۆدێرنە و لادانەکانی و لەڕێدەرچوونەکانی، بووەتە مەسەلەیەکی پێویست. لەم دیدگایەوە گواستنەوە بۆ سەردەمی پۆست مۆدێرنە، پرۆژەیەکی ڕەوایە، بەو مەرجەی ئەم پرۆژەیە بۆ ڕاستکردنەوەی لادانەکان بێت و پارێزگاری لە دەستکەوتەکان بکات، نەک پاشەکشەیان لێ بکات. هەروەها بەو مەرجەی نەکەونە خەرەندی عەدەمیەت و ڕێژەگەراییەوە. لە ڕاستیدا چەندین مانا بۆ زاراوەی پۆست مۆدێرنە هەیە، نەک تەنها یەک مانا. ئەم زاراوەیە مانای پۆزەتیڤ و مانای نێگەتیڤی هەیە.

هەنووکە هەموان دان بەوەدا دەنێن کە شارستانیەتی خۆرئاوا، بەدەست قەیرانێکی



لیوتار

ئەخلاقییەوە دەناڵێنێت کە نموونەی نییە. هۆکاری ئەو قەیرانەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئەوروپا تەنها گرنگی و بایەخ بە کێبڕکێ شەڕانگێزە گڕگرتووەکان و سەفقە بازرگانییەکان و قازانجی ماددیی و کەڵەکەکردنی پارەوپوول و سەرمایە دەدات و بیریچووەتەوە ئامانجی بنەڕەتی و سەرەکی شارستانیەت، بریتییە لە بەختیاری هەموو مرۆڤەکانی سەر گۆی زەوی. هەروەها خۆرئاوا بەهاکانی دادپەروەری و یەکسانی و بەزەیی لەبیرچووەتەوە، ئەمەش مەترسیدارترین شتە. لێرەوە لە شارستانیەتی خۆرئاوادا، تێکچوونی هاوسەنگی هەیە و پێویستە ڕێڕەوەکەی ڕاستبکرێتەوە، تا بە ڕاستی ببێت بە شارستانییەتێکی مرۆییانە. ئەم قسانە بۆ جیهانگیری دڕندەش هەر ڕاستە. جیهانگیرییەک تابێت دەوڵەمەندەکان دەوڵەمەندتر و هەژارەکانیش هەژارتر دەبن.

ئەمە بوو جان جاک ڕۆسۆ لە سەردەمەکەی خۆیدا و لە گەرمەی سەدەی ڕۆشنگەری، ئیدانەیکرد، هەربۆیە ئەوانیش لە دژی وەستانەوە و هێندەی نەمابوو لەناوییبەرن، لە هەموو سوچ و کون و قوژبنێکدا بەدوایەوە بوون و ژیانیان لێ تاڵ کردبوو، تەنها لەبەر ئەوەی ڕاستی وتبوو. بەڵام ڕۆسۆ تا دواهەمین چرکەی ژیانی، لەسەر پرنسیپەکانی بەخۆڕاگری مایەوە و قسە بەناوبانگەکەی وت: (لەبەر ئەوە بڕیارمداوە لە پێناو ڕاستیدا، گیانی خۆم بکەم بە قوربانی). ئەوان لەوەی پێیانکرد دەیانتوانی چی تری پێ بکەن؟ بیکوژن؟ دەبا بیکوژن. ئەو لەم جیهانەدا هیچ شتێکی نەبوو دەستی پێوە بگرێت و پەرۆشی بێت، چونکە لە بنەڕەتدا خاوەنی هیچ شتێک نەبوو. ڕۆسۆ هەموو چەواشە و ساختەکارییەکانی سەردەمەکەی ئاشکرا کرد و بە حەقیقەتێکی ڕوون و ئاشکرا شەپازللەیەکی توندی تێسرەواند. ئەو دوای ئەوەی کتێبە سەرەکییەکانی بڵاوکردەوە و لێدانە فەلسەفییە گەورەکەی خۆی وەشاند، چیتر پێویستی بەوە نەبوو زیاتر بژی.

لە بنەڕەتدا ئەگەر لە شارستانیەتی خۆرئاوادا شتێکی پۆزەتیف هەبێت، ئەوا بۆ ڕۆسۆ و کانت و هیگڵ و خەونبینە گەورەکانی دیکە دەگەڕێتەوە. ئاشکرایە شارستانیەتی مۆدرێن، چەندین دەستکەوتی گەورەی بەدەستهێناوە کە گاڵتەی پێ ناکرێت، وەک دەوڵەتی ماف و یاسا و دەستاودەستکردنی دەسەڵات بە شێوەیەکی دیموکراسی و ڕاگەیاندنی جاڕنامەی مافەکانی مرۆڤ و ئازادی بیروڕاو ویژدان و باوەڕ...هتد. ئەوە ئەو دەستکەوتانەیە کە گەلانی ئێمە، لە پێناو بەدیهێنانی قوربانی بە هەموو شتێکی بەنرخ و بێ نرخی خۆیان دەدەن، ئەویش لە میانەی ڕاپەڕینە سەرتاسەریەکان دژ بە سیستمە سەرکوتکەر و ستمگەرەکان.

لێرەوە شتە پۆزەتیڤەکانی شارستانییەت و مۆدێرنە، لە شتە نێگەتیڤەکانی زیاتر و گەورەترە، ڕەخنەگرتن لە شارستانیەت و مۆدێرنەی خۆرائاوا، مانای پاشەکشە نییە لەو دەستکەوتانەی تا ئێستا بەدیهێناوە، بەڵکو تەنها مانای ڕاستکردنەوەی ڕێڕەوەکەیەتی. ئالێرەدا فەیلەسوفانی مێژوو بۆ دوو بەشی سەرەکی دابەش دەبن: بەشێکیان گەشبینن بە

جووڵەی مێژوو، بەشەکەی دیکەیان ڕەشبینن.
لە ڕابـــردودا کانت و هیگڵ، لە ئێستاشدا کاسیرر و هابرماس و هەردوو نووسەری ئەم کتێبە، سەر بە بەشی یەکەمن. ئەوان پێیانوایە باشییەکانی مۆدێرنە زۆر لە خراپەکانی و کەموکورتییەکانی زۆرتـر و زیـاتـرە. وەلـێ کۆمەڵێ فەیلەسوفی دیکەی گەورە، سەر بە بەشی دووەمن و ڕەشبینن بەرامبەر بە جووڵەی مێژوو و چارەنوسی ڕەگەزی مرۆڤایەتی، لەوانە نیتچە یان هایدگەر یاخود میشێل فۆکۆ... هتد. هەر ئەمەیە وایکردووە تا ئێستا ململانێی نێوان گەشبینەکان و ڕەشبینەکان، پێ بە پێ بەردەوامە.

هەردوو نووسەر لە بەشی سێیەم و کۆتایی ئەم کتێبە نایابەدا، قسە لەسەر تیۆرەی مافەکانی مرۆڤ و سیستمی مۆدێرنی فەرەنسا و تەواوی ئەوروپا دەکەن. لێرەدا دژ بە هێرشی فەیلەسوفە نیتچەوییەکانی وەک فۆکۆ و دۆڵۆز و درێدا و ئـەوانـی دیکە، بـەرگـری لە دیموکراتییەت و مافەکانی مـرۆڤ دەکـەن. ئـەوان پێیانوایە ڕوخاندنی سیستمی فیودالّی ئسولّی کۆن، شتێکی زۆر پۆزەتیف بووە، چونکە ئەوە دەرفەتی لەبەردەم هێنانەئارای سیستمێکی دیموکراسی مۆدرێن ڕەخساند کە تێیدا مرۆڤەکان یەکسانن. مەسەلەکە هەرچۆنێک بێت ئەو دوو نووسەرە، کانت دژ بە نیتچە، هابرماس دژ بە فۆکۆ، بەکاردەهێنن. یەکێک لە جەنگە فەلسەفییە گەورەکانی خۆرئاوای هاوچەرخ، ئالێرەدایە و من ناتوانم زیاتر قسەی لەبارەوە بکەم، چونکە ئەوە پێویستی بە چەندین کتێب هەیە.

سەرچاوە:
الشرق الاوسط، ١٠ تەموز، ٢٠١٣، ژمارە ١٢٦٤٣

# ئایا مرۆڤ گورگە یاخود مەڕ؟

نووسینی: ئەریک فرۆم
لەئەڵمانییەوە: کارزان محەمەد

زۆر کەس بڕوایانوایە مرۆڤ مەڕە، کەسانێکیش هەن مرۆڤ بە گورگ دەزانن. هەردوو دەستەش بەڵگەی باشیان بۆ بۆچوونەکانیان هەیە. ئەوانەی مرۆڤ بە مەڕ دادەنێن، تەنها پشت بەوە دەبەستن کە مرۆڤ تەنانەت لەو بوارانەی زیانبەخشە، بە ئاسانی دەکەوێتە ژێر کاریگەری ئەو شتانەی پێی دەڵێن، بەدوای جەنگی ئەو سەرکردانەی خۆی دەکەوێت کە جگە لە وێرانکاریی، چیتری لەگەڵ خۆیدا نەهێناوە. بڕوا بەهەر شتێکی بێ مانا دەکەن کە بە زەبر و هێز بخرێتەڕوو، هەر لە هەڕەشە توندەکانی کەشیش و پادشایانەوە بگرە تا دەنگی نەرمونیانی شاراوە و نیمچە شاراوەی فریودەرانە. وادێتە پێش چاوان زۆرینەی ئەو مرۆڤانەی کارتێکراو و منداڵی نیمچە بێدارن، ئارەزوومەندی ڕادەستکردنی ئیرادەی خۆیانن بەو کەسانەی بەزمانێکی هەڕەشەئامێز یاخود شیرین،





مرۆڤ دەخەنە ژێر کاریگەری خۆیانەوە. لەڕاستیدا ئەو کەسانەی خاوەنی بیروباوەڕێکی جەسورانەن و لەبەرامبەر کۆمەڵگادا ڕادەوەستنەوە، لەبری ئەوەی بناغەی کۆمەڵگاکە بن، ژمارەیان دەگمەنە. ئەو کەسە دەگمەنانەی زۆرجار هاوچەرخەکانیان گاڵتەیان پێدەکەن، بەڵام دوای سەدان ساڵ دەستخۆشیان لێ دەکرێت. لەسەر بنەمای ئەم گریمانەیەیە، مرۆڤ بەمەڕ دادەنێن و «پشکنەرە گەورەکان» و تۆتالیتارەکانیان بۆ سیستەمی حکومڕانی خۆیان خوڵقاندووە، لەوەش پتر...هەر بەهۆی ئەو بۆچوونەوە کە مرۆڤەکان مەڕن و پێویستیان بەو ڕێبەرانە هەیە کە لەبری ئەوان بڕیار بدەن، زۆربەیان ئەم بۆچوونەیان لەنێو ڕێبەرەکاندا هێناوەتە ئارا کە ئەوان ڕێبەرێک بوون لەسەر خواستی مرۆڤ. واتا کاتێ باری بەرپرسیارێتی و ئازادیان لە مرۆڤ ستاندۆتەوە، ئەوا ئەرکی ئەخلاقی خۆیان بەئەنجام گەیاندووە، تەنانەت ئەگەر ئەم ئەرکە ئەخلاقییە کارەساتباریش بووبێ.

لەهەمانکاتدا ئەگەر زۆرینەی مرۆڤەکان مەڕن، کەواتە بۆچی ژیانی مرۆڤ تا ئەم ئەندازەیە لەگەڵ ژیانی مەڕدا جودایە؟ بۆچی مێژووەکەی بەخوێن نوسراوەتەوە؟، مێژوویەکی لێوانلێو لە توندوتیژی هەیە، هەمیشە پەنابردن بۆ ستەم لەپێناو تێکشاندنی ئیرادەی مرۆڤایەتیدا بووە؟. ئایا تەڵعەت پاشا بەتەنها کوشتاری ملیۆنەها ئەرمەنی کرد؟، ئایا هێتلەر هەر خۆی ملیۆنان جولەکەی بۆ کورەکانی سوتاندنی مرۆڤ نارد؟، ئایا ستالین بەتەنها ملیۆنەها نەیاری سیاسی لەنێوبرد؟. ئەم پیاوانە بەتەنیا نەبوون، ئەوان هەزاران کەسیان لەبەردەستدا بوو کوشتن و ئەشکەنجەیان بۆ ئەنجام دەدان، ئەم کارانەیان نەک هەر بەئارەزوومەندانە بەڵکو بەچێژیشەوە ئەنجامیان دەدا.

ئایا ئێمە نامرۆیەتی مرۆڤ بەرامبەر بە مرۆڤ لە هەموو شوێنێکدا (لەجەنگە دڵڕەقەکاندا، لە کوشتن و دەستدرێژیدا، لەخوێنمژینی ستەمکارانەی لاواز بەدەستی بەهێز، لە ئاه و ناڵەی ئەشکەنجەدراوان و ڕەنجدەراندا کە زۆربەیان نابیسترێن و ڕووبەڕووی دڵە بەبەردبووەکان دەبنەوە) نابینین؟. سەرجەم ئەم ڕاستیانە، کۆمەڵێک بیرمەندی وەک هۆبزیان گەیاندە ئەو دەرەنجامەی مرۆڤ هەر لە سروشتەوە شەڕخواز و تێکدەرە، مرۆڤ بکوژێکە تەنها لە ترسی بکوژە دەسەڵاتدارەکان دەتوانرێ مرۆڤ لەو حەزوخولیای کوشتنە دوور بخرێتەوە.

لەگەڵ ئەمەشدا مشتومڕی هەردوو گروپ ئێمەیان بە سەرگەردانی هێشتۆتەوە، لە ڕاستیدا دەشێ کەسە بکوژ و سادیستە ئاشکرا یا بەهێزەکانی وەک

ستالین و هێتلەر بناسین، بەڵام ئەمانەش نمونەی جیاوازن نەک بناغە. ئایا دەبێ من و تۆ و زۆرینەی خەڵکانی ئاسایی، ئەو گورگانەی پۆشاکی مرۆڤیان لەبەردایە ئەگەر ئەو لەمپەرانەی تا ئێستا ئەوانی لە رەفتاری جانەوەرانەیان گێڕاوەتەوە، وەها لێ بکەین (سروشتە راستەقینەکەیان) بخەنەڕوو؟. ڕەت کردنەوەی ئەم گریمانەیە کارێکی دژوارە، بەڵام بەتەواوەتی بەبنچینەش دانانرێ.

لە ژیانی رۆژانەماندا، زۆر فرسەتمان بۆ نامیهرەبانی و دڵڕەقی دێتەپێش کە کەسێک دەتوانێ بەبێ دوودڵی لە کاردانەوەکەی تەسلیمی ببێت، وێڕای ئەمانەش زۆر کەس هەن وەها ناکەن، لە ڕاستیدا ژمارەیەکی زۆر هەن لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوەی دڵڕەقی و سادیزمدا، کاردانەوەیەکی ناڕەزایی و بێزارییانەیان دەبێت.

ئایا ئاراستەیەکی دیکە یاخود باشتر بۆ ئەم ناتەباییە سەرسوڕهێنەرە هەیە؟ ئایا پێویستە ئەم وەڵامە سادەیەی کە کەمینەیەکی گورگ لەتەک زۆرینەیەکی مەڕدا دەژین، بە ڕاست دابنێین؟ گورگەکان حەز بە کوشتن و مەڕەکانیش حەز بە ملکەچی دەکەن. لەم ڕووەوە گورگەکان کوشتن و سەرکوتکردنی مەڕەکان ئەنجام دەدەن، مەڕەکانیش نەک لەبەرئەوەی چێژی لێوەردەگرن بەڵکو لەبەرئەوەی حەز بە ملکەچی دەکەن، گوێڕایەڵی ئەم کارە دەبن. تەنانەت لەو ساتانەشدا بکوژەکان ناچارن دەربارەی رەسەنایەتی کارەکانیان بۆ بەرگریی لەخۆکردنیان لەهەمبەر هەڕەشەدا، سەبارەت بە: ئازادی، تۆڵەسەندنەوە لە منداڵانی چەقۆکێش، ئەو ژنانەی ڕووبەڕووی دەستدرێژی دەبنەوە و ئابروویان لەدەست چوە... کۆمەڵێک چیرۆک دابهێنن تا زۆربەی مەڕەکان وەها



لێ بکەن تا وەک گورگ رەفتار بکەن. ئەم وەڵامە ئەگەرچی بە ماقوڵ دێتە بەرچاوان، بەڵام هێشتا گومانی لەسەرە.
ئایا مانای ناواخنی ئەم کارە لەوەوە نییە کە دوو جۆرە ڕەگەزی مرۆیی، یەکێکیان لەشێوەی گورگ و ئەویتریان لەشێوەی مەڕدا هەیە؟. تەنانەت گریمان جێبەجێکارانی ئەو توندوتیژییە لە ڕوانگەی هاوشێوەی مەڕەکانەوە، بە کارێکی پیرۆز بێتە بەرچاو، ئەگەر ئەم توندوتیژییە لە سروشتی ئەودا نییە، چۆن هەروا بەسانایی خۆی هەڵدەخەڵەتێنێ تا وەک گورگ رەفتار بکات؟.
ئەم گریمانەیەی لەسەر بوونی گورگ و مەڕە، ناشێ بە لۆژیکی دابنرێت، رەنگە هەقیقەتەکەی لەوەدا بێ کە تەنها گورگێتی بەشێوەیەکی ئاشکراتر لە شێوازەکانیتر، ئاستی خودییانەی مرۆڤ بخاتەڕوو؟.
دەشێ سەرەنجام هەموو ئەم ڕێگایانەش نادروست بن، رەنگە مرۆڤ هەم گورگ و هەم مەڕیش بێت، یاخود نە گورگ بێ و نە مەڕیش؟.
ئەمرۆ میللەتان لەپێناو لەناوبردنی (دووژمنان) ی خۆیاندا، بیر لە بەکارهێنانی وێرانکارترین هێز دەکەنەوە، وادێتە پێش چاوان تەنانەت گومانیشیان لەوە نییە لەم کوشتارە بەکۆمەڵەدا خودی خۆیان بە هیلاک بچن. وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە، بایەخێکی چارەنووسیازی هەیە. ئەگەر بەوە ڕازی بین سروشتی مرۆڤ لەناواخندا حەز بە وێرانکاری دەکات، ڕەگوڕیشەی ئەم حەزە بە بەکارهێنانی زۆرەملێ و توندوتیژی لە سروشتی مرۆڤەوە هەڵقوڵاوە، ئەوا لەو ساتەدا بەرەنگاربوونەوەمان دژ بەو خوە جانەوەرانەیەی لەنێوماندا لەپەرەسەندندایە، لاواز و لاوازتر دەبێت. ئەگەر هەمووانمان کەم تا زۆر گورگین، بۆچی بەگژ گورگەکاندا بچینەوە؟. ئەم پرسیارەی داخۆ مرۆڤ گورگە یاخود مەڕ، تەنها پرسیارێکی دووبارەیە کە لە ڕەهەندە بەرفراوان و گشتگیرەکانی خۆیەوە، یەکێک لە بنچینەترین مەسەلە هزرییە تیۆلۆجی و فەلسەفییەکانی خۆرئاوا بووە: ئایا مرۆڤ لە بنچینەدا ناپاک و گەندەڵە یاخود باش و چاکەخوازە؟. بۆچوونی تەورات لەسەر گوناهباری بونیادی مرۆڤ نییە. سەرپێچی ئادەم و حەوا لە خوداوەند، گوناهێکی نائومێدانەیە و لە هیچ شوێنێکدا ئاماژەیەک بۆ ئەوە ناکات کە ئەم سەرپێچییە، مرۆڤی بەرەو بودەڵەیی بردبێت. بەپێچەوانەوە، ئەم سەرپێچییە بووە مەرجێک بۆ هۆشیارکردنەوەی دەروون و توانستی هەڵبژاردن لای مرۆڤ، لەدواشیکردنەوەشدا ئەمە یەکەمین کار یاخود ناڕەزایەتی بووە، یەکەمین هەنگاوی مرۆڤ بووە بەرەو ئازادی. تەنانەت وا شرۆڤە دەکرێت ئەم سەرپێچییەی ئەوان، بەشێک بووە لە بەرنامەی خوداوەند، چونکە بەپێی بەرنامەی خوداوەند، مرۆڤ لە بەهەشت وەدەرنرا هەربۆیە توانی مێژووی خۆی بخوڵقێنێت و هێزە مرۆییەکانی خۆی پەروەردە بکات. لەبری ئەو هاریکارییەی پێشوو کە تیایدا هێشتا مرۆڤ وەک تاکەکەسێک فۆرمەڵە نەببوو، توانی کامڵبوونێکی مرۆییانە بە هاریکارییەکی نوێ لەگەڵ مرۆڤ و سروشتدا دەستەبەر بکات.
ئامۆژگارییەکانی پەیامبەرە مژدەبەخشەکانی مەسیحیش، گرەنتی ئەوەن مرۆڤ لە بنچینەدا بودەڵ نییە و دەتوانێ بەبێ هیچ رەفتارێکی تایبەت، بکەوێتە ژێر میهرەبانی و سۆزی خوداوەند و ڕزگاری ببێت، بەڵام پابەندیش نییە بەوەی ئەم توانایە لەپێناو خێر و شەڕدا بەگرەنتی سەربکەوێت. ئەگەر مرۆڤ شەڕ

بکات، شەڕانگێزتر دەبێت و دڵی فیرعەون (ڕەقتر دەبێت)، چونکە پێداگری لەسەر ئەنجامی شەڕەکە ئەکاتەوە و هێندە سەخت دەبێ کە چیتر گۆڕان یاخود تۆبەکردن قبوڵ ناکات. تەورات بەلایەنی کەمەوە بەو ئەندازەیەی نمونە لەسەر کرداری شەڕ دەهێنێتەوە، کرداری خێریشی لەخۆگرتووە، بۆچوونی تەورات ئەوەیە مرۆڤ خاوەنی توانای خێر و شەڕیشە، دەبێ لە نێوان خێرو شەڕ، بڕواداری و بێ بڕوایی، ژیان و مەرگدا یەکێکیان هەڵببژێرێ. تەنانەت خوداوەند دەستوەرنەداتە چانسی هەڵبژاردن لای مرۆڤ، تەنها بەناردنی پەیامبەران و نێردراوانی خۆی، یاریدەی مرۆڤ دەدات تا فێری ئەو پێوەرانە ببێ کە خێرو شەڕ لێکجودا دەکەنەوە، لەم ساتەشەوە مرۆڤ لە کێشمەکێشمی نێوان خێر و شـەڕدا تەنهایە، دوابڕیاریش لای خودی مرۆڤە.

ڕەوتی فۆرمەڵەبوونی مەسیحییەت جیاواز بوو لە ڕەوتی کامڵبوونی کەنیسەی مەسیحییەت، لاساری باوکە ئادەم بەگوناه دانراوە، لە ڕاستیدا گوناهێکی هێندە مەزن بوو کە نەک تەنها سروشتی باوکە ئـادەم، بەڵکو سـەرجـەم نەوەکانیشی بەلاڕێدا برد، بەمشێوەیە مرۆڤ هەرگیز بە هەوڵی خۆی نەیتوانی لەم بەلاڕێداچوونەدا دەربازی ببێت. تەنها خێروچاکەی خوداوەند لەگەڵ لەدایکبوونی مەسیحدا کە خۆی کردە قوربانی مرۆڤ، بووەمایەی ڕێگەگرتن لە سەرپێچی مرۆڤ، ئەوانەی مەسیحیان پەسەند کرد، ڕزگاریان بوو.

لەهەمانکاتدا گوناهە یەکەمینەکەی باوکە ئادەم، لە کۆمەڵگای مەسیحییەتدا بەبێ ڕەخنە دەربازی نەبوو، یەلاگیۆس هێرشی بردەسەر بەڵام شکستی خوارد. هیومانیستەکانی کەنیسە لە قۆناغی ڕێنسانسدا هەرچەندە نەیانتوانی بەڕاستەوخۆ پەلاماری بدەن یاخود نکۆڵی لێ بکەن، بەڵام دەیانویست لاوازی بکەن. لەکاتێکدا زۆربەی رافزییەکان تەنها نکۆڵیان لێکرد و ڕەخنەیان لێگرت. لۆتەر بۆچوونێکی توندڕەوانەتری سەبارەت بە شەڕانگێزی و لاساریی سروشتیانەی مرۆڤ هەبوو، لە کاتێکدا بیرمەندانی قۆناغی ڕێنسانس و پاشان هزرمەندانی چەرخی ڕۆشنگەری، هەنگاوێکی کاریگەریان بە ئاقارێکی پێچەوانەدا هەڵێنا. هزرمەندانی چەرخی ڕۆشنگەری جەختیان دەکـــردەوە کـە شـەڕانـگـێـزی مـرۆڤ دەرهاویشتەی هەلومەرجەکەیەتی، کەواتە مرۆڤ ناچار نییە ئەو ڕەوتـە بگرێتەبەر. بەتێڕوانینی ئـەوان، ئەگەر ئـەو هەلومەرجانەی شەڕانگێزی دەهێنێتە ئـاراوە، گۆڕانکاری تێدا بکرێت، ئەوا ناواخنە چاکەخوازییەکەی مرۆڤ دەردەکەوێت. ئەم بۆچوونە، بیرکردنەوەی مارکس و شوێنکەوتووانیشی لەخۆدەگرێت. بڕوابوون بە چاکەخوازیی مرۆڤ، بەرهەمی بڕوابوونە بە کەسێتی نوێی مـرۆڤ و دەرەنجامی ئەو پێشکەوتنە مەزنە ئابوری و سیاسییە بوو کە لە قۆناغی ڕێنسانسەوە دەستی پێکردبوو.

لەلایەکی دیکەوە تێکشکانی ئەخلاقی خۆرئاوا کە لـەگـەڵ جەنگی یەکەمی جیهانیدا دەستی پێکرد، بەپەیدابوونی کەسانێکی وەک هێتلەر، ستالین، کاوتسکی و کۆمەڵێک کارەساتی وەک هێرۆشیما تا ئەمرۆش درێژ بۆتەوە کە بووەمایەی وێرانکردنی جیهان، سەرلەنوێ جەختکردنەوەیەکی کلاسیکیانەیەی حەزو خولیای مرۆڤی بۆ شەڕ لەگەڵ خۆیدا هێنا. ئەم جەختکردنەوە نوێیە لەسەر خولیای مرۆڤ بۆ شەڕ، سارێژکردنێکی تەندروستانەیە بۆ وەلانانی حەزی ئامادەباشی مرۆڤ بۆ شەڕ، بەڵام




زۆرجار چ بەهۆی لەیەکتر تێنەگەیشتن یاخودبەهۆی تێڕوانینی خراپەوە وەک گاڵتەکردنێک بەرامبەر بەو کەسانە بەکاردێت کە بڕوایان بە مرۆڤ ماوە.

وەک یەکێک لەو کەسانەی بۆچوونەکانی دەربارەی پەراوێزخستنی حەزی ئامادەباشی بۆ شەڕ لە مرۆڤدا، زۆرجار بە جۆرێکی دیکە خستوویانەتەڕوو، دەمەوێ جەخت لەسەر ئەوە بکەمەوە کە ئەو جۆرە ساویلکەییەی هەست و سۆز و شاعیرانەیی لە ئاکاری بیرکردنەوەی مندا نییە. لە ڕاستیدا هەر کەسێک وەک سایکۆلیژیستێک سود لە ئەزموونە درێژخایەنەکانی چارەسەرکردنی نێو پێخەف وەربگرێت، بەئاستەم دەتوانێ هێزە شەڕانگێزەکانی نێو مرۆڤ وەلابنێت. دەروونزانان ئەم هێزە شەڕانگێزە کارتێکەرانە لەو نەخۆشانەدا دەبینن کە بەسەختی دووچاری تێکچوونی دەروونی هاتوون، ئازارێکی زۆر بەدەست ڕاوەستاندنیان و بە ئاقاربردنی ئەو هێزانە بەرەو بواری داهێنان دەبینن. هەروەها هەر کەسێ لە ساتی دەستپێکی جەنگی جیهانی یەکەمدا شایەتحاڵی هەڵچوون و تەقینەوەی شەڕ و وێرانکاریی بوبێت، نەیدەتوانی هێز و توندوتیژی وێرانکەری مرۆڤ نەبینێت. وێڕای ئەمانەش مەترسی ئەوە لەئارادایە ئەو هەستە لاوازەی ئەمڕۆ هەندێکجار خەڵک و ڕۆشنبیرانی گرتۆتەوە، ڕەنگە هانیان بدات بۆ پەسەندکردنی لێکدانەوەیەکی نوێ لەهەمبەر هەڵەو گوناهی یەکەمجاردا و پاساو بۆ ئەو بۆچوونە نیگەرانانوییە بهێننەوە کە جەنگ بەرهەمی هەستی وێرانکارییانەی سروشتی مرۆڤە، بەڵام ناتوانن پەراوێزی بخەن. ئەم چەشنە بۆچوونە کە هەندێکجار ریالیستیانەشە، بەهۆی دوو فاکتەرەوە ناڕاستە. یەکەمیان: مانای ناواخنی ئەو هەوڵە توندە وێرانکارییانەی مرۆڤ بەهیچ شێوەیەک ئەوە ناگەیەنێ شیاوی شکستپێهێنان نین یاخود ناتوانین بەسەریاندا زاڵ ببین. هەڵەی دووەم ئەو پاساوەیە کە پێیوایە لەبنچینەدا جەنگ بەرهەمی ستەمە سایکۆلۆژییەکانە. توێژینەوەی درێژخایەن دەربارەی نادروستی (سایکۆلۆژیای ئینتیما) بۆ تێگەیشتنی دیاردە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان، هێندە بایەخی پێنەدراوە. جەنگەکان بەرهەمی بڕیارەکانی سەرکردە سیاسی و سەربازی و بازرگانییەکانن بە مەبەستی دەستگرتن بەسەر خاک، سەرچاوەی

سروشتی، دەستکەوتی بازرگانی یاخود بەرگری لەخۆکردن لەهەمبەر هەڕەشە راستەقینە یاخود خەیاڵییەکانی دەسەڵاتدارانیتری وڵاتاندایە، یاخود لەپێناو زیادکردنی پلە و پایەی کەسێتی خۆیدا دەستپێشخەری بۆ جەنگ دەکەن.

ئەم خەڵکانە جیاوازیان لەگەڵ خەڵکی ئاسایی نییە، ئەوانە خودپەرستن و قبوڵیان نییە لەبەر خاتری کەسانی دیکە، چاوپۆشی لە بەرژەوەندییە خودییەکانیان بکەن، بەڵام نە دڵڕەقن و نە شەڕخواز. کاتێک ئەم جۆرە مرۆڤانە (لە ژیانی ئاسایی خۆیاندا رەنگە بەرلەوەی کاری زیانبەخش ئەنجام بدەن، کاری خێر بکەن)، دەسەڵاتێکیان دەکەوێتە دەست کە بتوانن فەرمان بەسەر ملیۆنەها کەسدا بدەن و وێرانکارترین چەکیان بکەوێتە بەردەست، دەتوانن زیانی مەزن بگەیەنن. ئەو کەسانە لە ژیانی تایبەتی خۆیاندا رەنگە رکابەرەکەیان شکست بدەن، بەڵام لە جیهاندا حکومەتە دەسەڵاتخواز و بەهێزەکانمان (دەسەڵاتخواز واتا ملکەچی هیچ یاسایەکی ئەخلاقی نییە کە میکانیزمی کاری حکومەتە دەسەڵاتخوازەکە سنوردار بکات)، لەوانەیە مرۆڤایەتی لەناوببات. مرۆڤی ئاسایی بە دەسەڵاتێکی نائاساییەوە، مەترسیەکی سەرەکییە بۆسەر خودی مرۆڤ ئەگەرچی شەڕخواز و سادیستیش نەبێ. هەروەکچۆن مرۆڤ بۆ جەنگ پێویستی بەچەکە بۆ ئەوەی ملیۆنەها کەس وەها لێ بکات تا ژیانی خۆیان بخەنە مەترسییەوە و ببنە مرۆڤکوژێکی ستەمکار، پێویستیان بە هەستی شەڕانگێزی و وێرانکاری و ترسیش هەیە.

بوونی ئەم هەستانە مەرجی پێویستن بۆ دەستپێشخەری جەنگ واتا فاکتەر نین، هەروەکچۆن خودی چەک و بۆمب هۆکاری جەنگ نین. ژمارەیەکی زۆری چاودێران پێیانوایە جەنگی ئەتۆمی لە جەنگی کلاسیکی جیاوازە، ئەو کەسەی دوگمەی هاویشتنی موشەکە ئەتۆمییەکان دادەگرێ و هەرکامیان لەوانەیە سەدان هەزار کەس بکوژێت، بە ئاستەم دەتوانێ هەستی کوشتن لای سەربازێک تاقی بکاتەوە کە سەرەنێزە یاخود تفەنگەکەی بەکاردێنێت. وێڕای ئەوەش هاویشتنی موشەکێک هیچ نییە جگە لە ملکەچییەکی راستگۆیانە بۆ فەرمانێک، ئەم پرسیارەش دێتەئارا کە ئایا نابێ لە ئاستە قوڵترەکانی کەسێتیدا ئەگەرنا لەسەر ئاستی رەفتارە وێرانکارەکان، جۆرە نابەرپرسیارییەکی قوڵ سەبارەت بەژیان هەبێ تا رێگا بۆ ئەم چەشنە رەفتارانە خۆش بکات؟.

بەتێڕوانینی من ئەو سێ دیاردەیەی بنەمای شەڕانگێزی و ترسناکترین شێوازەکانی ئینتیمای مرۆڤن، بەمجۆرە جودام کردوونەتەوە: عەشق بۆ مەرگ، نارسیسیزم (Narcissism) واتا عاشقەخود و جێگیربوونی پێکەوەژیانی خزمایەتی. کاتێک ئەم سێ ئینتیمایە ئاوێتە ببن، نیشانەکانی بەلارێداچوون دێننەئاراوە کە وا لە مرۆڤ دەکات تا لەبەر خود، ببێتە تێکدەرو لەبەر دەروونی رقاوی، رقلێبوونەوەی هەبێت. بۆ بەگژداچوونەوەی (نیشانەکانی بەلارێداچوون)یش، گفتوگۆ لەسەر (نیشانەکانی گەشە) دەکرێت کە عەشق بۆ ژیان لەخۆدەگرێت، بەڵام ناتوانیت نکۆڵی لەوە بکەین هەموو مرۆڤێ لەو رێگایەدا بەرەوپێش هەنگاو دەنێ کە هەڵیبژاردووە، واتا: ژیان یان مەرگ، خێر یان شەڕ.

سەرچاوە: سایتی ئەریک فرۆم (http://www.erich-fromm.de).

# سنورەکانی سەرپێچی پاساودار

نووسینی: فرانس نۆیمان
لە فارسییەوە: ڕێبین هەردی

کاتێک دەستم بە نووسینی ئەم وتارە کرد، هەستمکرد وەڵامدانەوەی ئەم مەسەلەیە ئاسانە. وام ئەزانی بە ئاسانی ئەتوانرێت بگوترێت کە هاوڵاتی لە چ بارودۆخێکدا ئەتوانێت سەرپێچی لە ملکەچی بۆ یاسا دانراوەکان بکات. بەڵام چەند زیاتر بیرمکردوەوە و لەو بەرهەمانە قوڵبومەوە کە لەم بوارەدا نووسراون، ئەو یەقینەی پێشوم لاوازتر بوو. دیارە بە ئاسانی ئەمتوانی فۆرمەلەیەک پێشکەش بکەم -ئەمتوانی بگەڕێمەوە بۆ یاسای سروشتی یان مافە هەمیشەیەکان- بەڵام فۆرمۆل تەنها بە مەرجێک مانای هەیە کە لە هەلومەرجی واقعی و دیاریکراودا بەکاربهێنرێت، هەر فۆرمولێک بەشێوەیەکی ئەبستراکت و هەمەکی دەرببرێت، هیچ مانایەکی نیە. لێرەوە بە داوای لێبوردنەوە ئەو وەڵامەی ئەمەوێت بیدەمەوە، ئارامبەخش نابێت.



فرانس نۆیمان

سەرنجم لەسەر بیرهێنانەوەی ئەو گرفتە شاراوانەی لەهەر وەڵامێکی پۆزەتیڤ یان نێگەتیڤدا هەیە، چەندانجار زیاترە لە شکڵبەندی تیورەیەکی تایبەت بە خۆم.
دیارە کێشەکە کێشەیەکی کۆن و دێرینە و لە دواجاردا هەڵگری مافی کوشتنی فەرمانڕەوا ستەمکارەکانە. لەو ڕووەوە کە بەشێوەیەکی گشتی بڕوام وایە مەسەلەکانی فەلسەفەی سیاسی کاتێک بە باشترین شێوە قابیلی تێگەیشتنن، کە مەسەلە کۆتایەکان بە ڕوونی دەرببڕێن. لە دوا دەرکەوتی مافی یاخیبونەوە -واتە ئەو مەسەلەیەی بە شا کوشتن یان ستەمکار کوشتن بەناوبانگە- دەست پێئەکەم.

١

مێژووی شا کوشتن بە هەڵەیەکی مێژوویی دەست پێئەکات. لە چێروکە دێرینەکاندا کوشتنی هیپارخۆس (کوڕی پی سیستر ستۆس) بە دەستی هارمۆدیۆس و ئەریستۆ گیتون لە ٥١٤ پێش زایندا، بە یەکەم نمونەی هەنگاوی موئامەرەئاسای عاشقانی ئازادی بۆ لەناوبردنی یەکێک لە ستەمکاران ئەناسرێت و بەرز ئەنرخێنرێت. بەڵام ئەزانین کە پاڵنەری ئەم کوشتنە تەنها کینەی شەخسی بوو بەرامبەر بەم ستەمکارە (واتە هیپارخۆس)، نەک تێبینی سیاسی. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم کوشتنە بووە هۆی پەیدابونی یەکێک لە قوتابخانە فکریە بەهێزەکان کە تا سەدەی حەڤدەهەم (واتە تا دەرکەوتنی حکومەتە نادینیە ڕەهاکان) بەردەوام بوو و پاشتریش بە هۆی باڵاگرتنی کاری تۆتالیتاریسمەوە، گیانێکی تازەی بە بەردا کرایەوە. کاتێک کاردانەوەی ڕای گشتی بەرامبەر بە هەوڵی کوشتنی هیتلەر (لە ٢٠ تەموزی ١٩٤٤دا) شیئەکەینەوە، ئەوەی سەرنجمان ڕائەکێشێت ئەوەیە کە جیهانی ڕۆژئاوا هەرگیز گومانی لە مافی کوشتنی هیتلەر نەبوو، تەنها ڕەخنەی ئەوە بوو بۆچی ئەم هەوڵە بە ئەنجام نەگەیشت.
ئەگەر ئەوەی وتم ڕاست بێت، ئەو مەسەلەیەی دێتە پێشێ کە بەڕاستی چارەنوسسازە. ڕەنگە لەڕێگەی ئەم شیکردنەوەیەوە، مەسەلەی هەمەکی مافی خۆڕاگری کەمێک ڕونتر بێتەوە.
پێدەچێت خەڵکی سەردەمی دێرین کێشەیەکیان لەم بوارەدا نەبینیبێت. ڕەنگە چاوەڕێی ئەوە لە ئەفلاتۆن بکرێت باسی مەسەلەی کوشتنی ستەمکار بکات. بەڵام ئەفلاتۆن باسی ئەم مەسەلەیە ناکات. یەکەم مەسەلەی کوشتنی ستەمکار، کوشتنی یەکێک لە ستەمکارەکان بوو بە دەستی دوان لە قوتابییەکانی. لە ٣٥٣ (ی پێش زایندا) "جیبیون" و "لێۆنیداس"، "کلێ ئەرخۆسی" ستەمکاری هراکلیاپۆنتیایان (لە تورکیای

ئێستادا) به پاڵنەری نیشتیمان پەروەری کوشت. لەم حاڵەدا بە گشتی هەموان هاوڕان کە بە بڕوای ئەفلاتۆن خوێنی ستەمکار لەسەر خۆیەتی. ئەم حاڵە لە کتێبەکانی هەشتەم و نۆهەمی کۆماردا بە ڕوونی دیارە و لەبارەی ئەرستۆشەوە ڕاستە. ئەرستۆ جیاوازی لە نێوان دوو جۆر ستەمکاردا ئەکات. یەکێکیان ستەمکار absque titulo (واتە حوکمڕانی ڕەوا)، بەڵام (واتە داگیرکەر) و ستەمکار quod exercitio دواکەتوو لە یاسا). بەڵام لە بەرهەمەکانی ئەرستۆدا هیچ جۆرە شیکردنەوەیەکی فەلسەفی نابینرێت سەبارەت بەوەی لەچ بارودۆخێکدا ئەشێت هەر یەک لەم دوو جۆرە ستەمکارە لەناو ببرێت.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ناکرێت کوێرانە لاسایی شێوەی بیرکردنەوەی پێشینان لەبارەی ستەمکار کوژیەوە بکرێت، چونکە ئەم مەسەلەیە لای ئەوان پەیوەندی بە تیورەیەکی فەلسەفی ترەوە هەبوو کە بە پێی ئەم تیورەیە مرۆڤ وەک هاوڵاتی شار polis بوونی هەبوو. ئەگەر بوونی مرۆڤ بە شێوەیەکی سەرەکی بونێکی مەدەنی بێت، ئەوا کوشتنی ستەمکار پێویست ئەبێت، چونکە گیانی ستەمکار بەستراوە بە سودمەندی بۆ شار یان دەوڵەتشارەوە.

ئێمە ناتوانین ئەم فەلسەفەیە قەبوڵبکەین. بە بڕوای ئێمە بونی مرۆڤ سەربەخۆیە لەو ڕێکخستنە مەدەنی یان سیاسیەی کە تیایدا ئەژی.

لێرەوە ئەگۆستینۆسی قەدیس1 وەڵامێکی تری بۆ مەسەلەی ستەمکار کوژی هەیە و ئەڵێت خوداوەند هەم ئاوگوستیۆسی بە ڕۆمیەکان دا و هەم نیرۆن، هەم قوستەنتینی پێبەخشین و هەم بولیاتۆسی هەڵگەڕاوە (مورتەد). پاشان ستەمکارکوژی ڕەد ئەکاتەوە و بە دڵنیایەوە ئەڵێت هیچکەس بۆی نیە کەسێکی دی —تەنانەت گەر تاوانبارێکی مەحکومیش بێت— سەرەڕۆیانە بکوژێت. تەنها دوو ئاوارتن ئەهێنێتەوە: ئەگەر یاساکان ڕێگە بدەن و ئەگەر خوداش فەرمان بکات2. بەڵام ئەگۆستینۆس بە تەواوی ئاگای لەو مەترسیانە هەیە کە لەناو ئەم ئاوارتنەدا شاراونەتەوە. بۆ ڕێگریش لە تەفسیر و ڕاڤەکردنی ئەم ئاوارتنانە تەنانەت ڕەخنە لە تەوراتیش ئەگرێت و بە گشتی ئەنجیل بە مەرجەع ئەژمێرێت و گومان ئەکات لەوەی ئایا موسا هەقی هەبووە کە مسریەکانی کوشتووە3.

بەڵام ئەم شێوازە بیرکردنەوە ئەگۆستینیە زۆری نەخایاند. لێرەدا دەرفەتی باسکردنی مێژووی دوورودرێژی تیورە جیاوازەکانی شاکوژیم نیە. هەر ئەوەندە ئەڵێم کە "جۆن سالزبریایی" لە کتێبی "پۆلیکراتیکۆس" دا بە جەختکردنەوە شاکوژی قەبوڵ ئەکات، تۆماس ئەکویناسیش بە هەندێک مەرجەوە ملی بۆ ئەدات، لێرەوە زانینی ئەو حاڵە گرنگە کە ئەو کەسانەی لایەنگری شاکوژی بوون، هەمویان شایەتی لە تەورات و ڕۆژگاری دێرین ئەهێننەوە و پشتیان کردۆتە شێوەی بیرکردنەوەی ئەگۆستینۆس. هەر ناکۆکی نێوان ئەم دوو قوتابخانە فکریە مەسیحیە بوو کە جیهانی مەسیحی لە سەرەتاکانی سەدەی پانزەهەمی میلادیەوە هێنایە لەرزین.

1 ) Max Lossen, Die Lehere vom Tyrannenmord in der christlichen Zeit, Munchen, 1894.
2 )De Civitate, Book I, ch,17,21: Book V, Ch,19,21.
3 ) Ibid, Book I, Ch, 26. Faustum, Book 22, Ch. 70in Migne, 42,444.

رۆژی ٢٣ نۆڤەمبەری ١٤٠٧ (میلادی) دوو کەس لە ئەرەستۆکراتەکان بە جوڵاندنی دۆک ژان دو بوگونی، دۆک لۆیی ئۆرلئانیان کوشت٤. کەسێک بەناوی ژان پتیەوە نامەیەکی لەژێر ناونیشانی "هەقانیەتی دۆک دۆ بۆرگونی" نووسی و تا دە ساڵ هەموانی هەژاند٥. پتی بە کورتی ئەیگوت هەموو کەسێک بۆی هەیە ستەمکاران بکوژێت، سوێندەکانیش (لەم دۆخانەدا) هیچ بایەخێکیان نیە، و لەبەرامبەر ستەمکاراندا سوودوەرگرتن لە هەر هۆکارێکی نائەخلاقیش پاساوی خۆی هەیە. ئەنجومەنی کەنیسەی کاسۆلیک کە لە ١٤١٣وە تا ١٤١٤ لە پاریس دروست بووە، بە تایبەت باسی ئەم مەسەلەیەیان کرد. لەم ئەنجومەنەدا ژان دۆ ژرسن سەرۆکی زانکۆی پاریس هەوڵیدا شێوەی بیرکردنەوەی ئەگۆستینۆس بگەڕێنێتەوە و ئەگەرچی بە شێوەیەکی ڕوکەشی سەرکەوتنی بەدەستهێنا، بەڵام زۆربەی متەکەلیمەکان ئامادەنەبون پەیڕەوی بکەن. ئەنجومەنی کۆنستانس پاساوەکانی ژان پتیان، لانیکەم بەشە گرنگ و هەستیارەکانی لە بارەی ستەمکاری کوژیەوە سەلماند. ئەوەی ئەبێت سەرنجی بدەین جیاوازی بنەڕەتیەکانی نێوان پاساوی ستەمکار کوژیە لە ڕۆژگاری دێرین و سەدەکانی ناوەڕاستدا. لە ڕۆژگاری دێریندا ڕەوایەتی ئەمکارە ئەگەڕایەوە بۆ سود و بەرژەوەندی دەوڵەتشار و لە سەدەکانی ناوەڕاستدا ئەگەڕایەوە بۆ یاسای سروشتی و پەیوەندیە فیودالیەکانی مۆلکدارە گەورەکان


هیپارخۆس

4 ) Friedrich Schoentstedt, Der Tyrannenmord im Spaetmittelalter, Berlin,1938.
5 )A. Coville.jean petit, la question du tyrannicide au commencement du XVe Siecle, Paris, 1932.

لەگەڵ باجوەرگرەکانیاندا. پاشتر ئەبینین کە ئایا هیچ یەک لەم پاساوانە بەسە یان نا.



ئەڵبەتە لەسەردەمی ڕێنیسانسدا مرۆڤکوژی سیاسی بە شێوەیەکی بەرفراوان باوی هەبوو، بەڵام هیچ تیورەیەک لەبارەی ستەمکار کوژیەوە نەبوو. بیری تاکەکان زۆرتر لای ڕەهەندە دەروونناسی و کۆمەڵناسیەکانی ئەمکارە بوو -واتە مەسەلە تەکنیکیەکانی مرۆڤکوژی سیاسی- تاکو گونجان یان نەگونجانی لەگەڵ پێوەرە ئەخلاقیەکاندا. لەبەرئەوە ئەبێت تیورە سیاسیەکانی ئەو سەردەمە بە "نهێنیەکانی" ئەم مەسەلەیە بزانین، چونکە لەو تیۆرانەدا ئامێرەکانی گەیشتن بە فلان ئامانجی سیاسی بە عاقڵانەترین شێوە پێشکەشکراوە.

شەپۆلی تازەی گفتوگۆی تیۆری لەبارەی مافی یاخیبون و مافی کوشتنی ستەمکاران، پاش بزوتنەوەی چاکسازی دینی (یان سەردەمی ڕیفۆرم) دەستی پیکرد. ئەزانین نە لۆسەر لایەنگری یاخیبون بوو بەسەر فەرمانڕەوایاندا و نە کالڤین، و هەردوکیان ستەمکارکوژیان ڕەت ئەکردەوە. دیدی لۆسەر سەبارەت بەم مەسەلەیە بەرێژە دوولایەنە و ئاڵۆزە، بەڵام دیدی کالڤین وا نیە. لە مێژووەکانی بیروڕای سیاسیدا، جەخت لەوە ئەکرێتەوە کە کالڤین یاخیبونی لە لایەن ئەو ئۆرگانە دەوڵەتیانەوە (وەک ئەنجومەنی گشتی چینەکان) بەرێگەپێدراو ئەزانی کە لەڕووی یاساییەوە ئەرکیان سنوردارکردنی دەسەڵاتی پاشایە، بەڵام ئەو قسەیەی فەرامۆش ئەکرا کە لە کۆتایی کتێبی "دەزگاکاندا" ئەڵێت٦: "خوداوەند بە دوو شێوە ڕێگە لە ستەمی ستەمکاران ئەگرێت: یان بە هاندانی تۆڵەکەرانی بێ پەروا لەناو هاوڵاتیانی خودی ستەمکاردا کە خەڵکی لە جەور و ستەمی ڕزگار ئەکەن، یان بە بەکارهێنانی توڕەیی مرۆڤێک کە تەکبیر و بیرکردنەوەکانی ڕاستەوخۆ جیاوازە و لە ئەنجامدا لابردنی جۆرێک جەور و زۆرداری بە جۆرێکی تر". بەشی یەکەمی ئەم قسانە پێشبینی ڕزگارکەرانی نامەزهەبی وەک کرامۆێل ئەکات، بەڵام بەشی دوهەم ڕەنگە تەنها شیکردنەوەیەکی کۆمەڵناسی ئەم دیاردەیە بێت کە ستەمکاری، ستەمکاری بەرامبەر دروست

6 ) Institutes, Book IV, Ch, XX,31, trans. Henery Beveridge.

ئەکات. لەبەرئەوە ناکرێت ئەم قسانەی کالڤین بە پاساوی ستەمکارکوژی وەربگیرێت.

بەڵام بەدەر لە دیدی ئەم ڕیفۆرمخوازانە (واتە لۆسەر و کالڤین)، لایانگرانیان چەندان دیدی جیاوازیان خستە ڕوو: لە ملکەچی ڕەهاوە بۆ سەرچاوەکانی دەسەڵاتی دنیای و نا دینیەوە بگرە تا ملکەچی بێ کردار و ئینفیعالی، تا یاخیبون بەشیوەیەکی چالاک و شاکوژی. پرۆتستانتەکانی دژ بە شا —واتە کەسانی وەک جان پۆینت و کریستۆڤەر گۆدمان لە ئینگلتەرا و ژان دۆ پلترۆ و فرانسوا هۆتمان و ژۆئیۆس بروتوس لە فەڕەنسا- هیچ گومانێکیان لەبارەی مافی یاخیبونەوە بە خۆیان نە ئەدا. تیورەی لایەنگری مافی یاخیبون -لانیکەم بە پێی تەفسیری لایانگرەکانیان- لە بنەڕەتدا کالڤینیە.

بەڵام گروپی کاسۆلیکیش بێکار نەبوون و دوو کەسیان -ژان بۆشە٧ی فەڕەنسی و خوان دی ماریانا٨ی خەڵکی ئیسپانیا- تیورەیەکی تازەیان لەبارەی مافی یاخیبونەوە دروستکرد کە بانگەشەی ئەوە ئەکرا لەسەر بنەمای دیموکراسی دامەزراوە. بە پێی ئەم تیورەیە خوداوەند دەسەڵاتی سیاسی بە خەڵک ئەسپێرێت و لێرەوە مافی ئەوەیان هەیە لە ڕووی ستەم و زۆرداریدا، بەیعەتی خۆیان لە حوکمڕان وەربگرنەوە و لای ببەن و تەنانەت بیکوژن.

٢

ڕێگەبدەن لێرەدا ئەم تاوتوێ مێژووییە کۆتایی پی بێنم، چونکە ئەگەر هیوادار بین تەنها لە ڕێی شیکردنەوەی مێژووییەوە ئەنجامگیری بکەین کە ئایا یاخیبون ڕێگەپێدراوە یان نا، و لە چ بارودۆخیکدا مومکینە، ئەوا ئەم کارە ساردمان ئەکاتەوە و نائومێدمان ئەکات. ئەوەی مێژوو پیشانی ئەدات تەنها ئەوەیە کە سوود لە هەموو تیۆرە سیاسیەکان بۆ گەیشتن بە مەبەستی سیاسی وەرگیراوە. هەرکاتێک یاخیبون لەگەڵ بەرژەوەندی گروپێکی تایبەتدا ئەگونجێت، بە پاساودراو لە قەڵەمدراوە و هەرکاتێکیش نەگونجاوە، ڕەتکراوەتەوە.

لە هەموو ئەو تیۆرانەی کە بە گشتی باسمکردن، ناکرێت وەڵامی پرسیارێکی سادە بدرێتەوە کە ئەویش ئەوەیە: چ کەسێک بڕیار ئەدات کە ئایا -و لە چ کاتێکدا- مافی یاخیبون هەیە.

لە ڕۆژگاری دێریندا: کەسێک ئەم بڕیارە ئەدات کە دیاری ئەکات سود و بەرژەوەندی polis (یان دەوڵەتشار) پێویستی بە چیە، لە تیورەکانی سەدەی ناوەڕستدا: ڕۆحانیەکان یان دەسەڵاتە دینیەکان بانگەشەی ئەوە ئەکەن کە بڕیار بە دەستی ئەوانە، لە خەباتی دژانی شادا: گروپی مەزهەبی بڕیار ئەدات، و لەو تیۆرانەشدا کە بە تیورەی دیموکراسی بەناوبانگە: خەڵک.

تیۆرەی دێرینەکان بە تیۆرەی کردار یان دامەزراو لەسەر وەزیفە ناو ئەنێین، بەو مانایەی یاخیبون پاساوی هەیە ئەگەر-و هەرکاتێک کە- حوکمڕان لە کردار (یان بەجێهێنانی ئەرکەکانی) کورت بێنێت.

<u>تیۆرەکانی سەدەکانی</u> ناوەڕاست بە تیۆرەکانی بونیادنراو لەسەر یاسای سروشتی ناوئەبەین. بەو مانایەی کە

7 ) Jean Boucher, Sermon de la simulee conversion et nullite de la pretendue absolution de Henir de Bourbon, paris, 1594.

8 )juan De Mariana, De Rege et Regis Institutione (trans G. A. Moore as The king and the Education of the King), Washington, D, C, 1948.

یاخیبون پاساوی هەیە گەر-و هەر کاتێک حوکمڕان سنوورداریەکانی یاسای سروشتی فەرامۆش کرد و بە پێی فەرمانەکانی ئەم یاسایە حوکمی نەکرد.
تیۆرەکانی ئەمڕۆ بە تیۆرە دیموکراتیەکان ناو ئەبەین. بۆ دیاریکردنی بەها و بایەخی ئەم سێ شێوە تیوریە ئەبێ دەست بە شیکردنەوەیەکی فراوانتر بکەین.
تەوەرەی سەرەکی لێرەدا شیکردنەوەی زاراوەی "ماف"ە کە ڕەنگە بە یەکێک لەم سێ مانایە بێت: یەکەم. هەڵبژاردنی هەنگاوێک بە پێی یاسا دانراوەکان، دوهەم هەڵبژاردنی هەنگاونان بەپێی یاسای بابەتی سروشت، و سێهەم ئەوەی کە هەڵبژاردنی هەنگاونان بە بەشێک لە خودیتی و خەسڵەتی مرۆیی بزانرێت (کە ئەشێت پێی بگوترێت مافی سروشتی یان خۆڕسک).
ئایا هیچ گرنگە کە "ماف" بە یەکێک لە زاراوەکانی یاسا دانراوەکان دابنێین؟ دوو ئەگەر هەیە. یاسا دانراوەکان ئەشێت بە ڕاشکاوی یان بە ئاماژە بۆ کردن، یاخیبوون قەدەغە بکەن. لەم حاڵەتەدا کێشەی یاسا دانراوەکان بونی نابێت.
یا ئەشێت یاسا دانراوەکان بەڕاشکاوی یان بە ئاماژەبۆکردن، ڕێگە بە یاخیبون بدەن. لە "ڕاگەیاندنی سەربەخۆی" ئەمەریکادا لەیەکەم بەشی بەندی دوهەمدا بە چەند مەرجێک "مافی خەڵک بۆ گۆڕان یان روخانی" هەر شێوەیەکی حکومەت "و دامەزراندنی حکومەتێکی تازە" ڕاگەیەنراوە. بەڵام "ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی" یارمەتی چارەسەری کێشەکەی ئێمە نادات. تەنها "خەڵک" ئەتوانن لەڕووی یاساییەوە شۆڕش بکەن، بەڵام مافی یاخیبونی تاکەکەسی باسنەکراوە.
ڕێگە بدەن بابەتێکی تازە بە نمونە بهێنینەوە. مادەی ١٤٧ی دەستوری هەرێمی هسن لە ئەڵمانیای ڕۆژئاوا ئەڵێت: "هەموو کەسێک مافی هەیە و بگرە ئەرکی ئەوەیە کە کاتێک سوود لە تواناکانی دەوڵەت بە پێچەوانەی دەستورەوە وەرگیرا، سەرپێچی بکات" گومانی تیا نیە ئەم مادەیە پاش قسەکانی نوێنەرێکی کۆمنیست بە ناوی "باور"ەوە لەناو ئەنجومەندا، لە دەستوردا دانرا کە بەوپەڕی نیەت باشی بە جەختکردنەوە وتی هەر کەس مافی هەیە


کانت



و بگرە ئەرکی سەرشانێتی بەرگری لە دەستور لەبەرامبەر هەر جوڵەیەکی نادیموکراتیدا بکات (یەکیتی سۆڤیەت دواتر باوریان لەناوبرد). بەڵام ئایا ئەم مادەیەش مانایەکی هەیە؟ نەخێر. ئەم وەڵامە نێگەتیڤە ئەبێت بە هەموو ئەو کەسانە بدرێتەوە کە چاوەڕێن یاسا دانراوەکان کێشەکەیان بۆ چارەسەر بکات، تەنانەت گەر بڕیارەکانی ئەو یاسایانە لە دەستوری هسن زیاتریش بڕوات. گریمان لە دەستوردا پێشبینی کرابێت کە ئەگەر دەوڵەت دەستدرێژی بۆ مافی لێنەسەندراوی ژیان و ئازادی کەسێک بکات، ئەوا لە ڕووی یاساییەوە ئەرکی سەرشانێتی لەبەرامبەر دەوڵەتدا سەرپێچی بکات. ئەم پێشبینیە تەنها بە مەرجێک مانای هەیە کە یەکێک لە بالاترین دەزگاکان (وەک دەزگای سەربەخۆیی داد) دەست نیشانی بکات کە ئایا دەوڵەت بە شێوەیەکی نادادپەروەرانە دەستدرێژی بۆ مافەکانی من کردووە یان نا، یان لە نمونەی هسندا دیوانی پارێزگاری لە دەستور دواجار بڕیار بدات کە ئایا سود لە تواناکانی دەوڵەت بە پێچەوانەی دەستورەوە وەرگیراوە یان نا. ڕەنگە بڵێین کە هەر ئەوەندە بە تەواوی بەسە. لە کرداریشدا ڕەنگە لە زۆربەی دۆخەکاندا هەر وا بێت. بەڵام هەندێکجار بەس نیە. بێگومان کەسانێک کە دەزگای دادی کۆماری ڤایماریان بە ئەمین ئەزانی و مافەکانی خۆیان بەم دەزگایە سپارد، نەیان ئەتوانی ئومیدیان بە پاراستنی ئەو مافانە هەبێت. دەزگای دادی ئەڵمانیا لەو کاتەدا، بازوی سیاسی بزوتنەوەیەکی دژ بە شۆڕش و دژ بە دیموکراسی بوو، نەک دەسەلاتێکی دادی سەربەخۆ بۆ پاراستن و پارێزگاریکردن لە مافە مەدەنیەکان. ئەستەمە بگوترێت کە ئایا ئەمڕۆ بارودۆخەکە سەرلەبەری گۆڕاوە. بەڵام تەنانەت لە سیستەمی دادی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکادا کە زۆر لە دەزگای دادی ئەڵمانیا پێشکەوتوترە، ڕەنگە بەر ئەو دادوەر و ئەنجومەنی دادوەرانە بکەوین کە ڕەنگدانەوەی هەستی کەسانی پڕوپوچن، لەبری ئەوەی ڕەنگدانەوەی هەڵسەنگاندنی بیرلێکراوەی کەسانێکی عاقڵ و بیرمەند بن.

کەوابو جێکردنەوەی مافی یاخیبون لە یاسا دانراوەکاندا تەنانەت لە کرداریشدا، هەمیشە سودمەند نیە. ئاشکرایە کە ئەمکارە لەڕووی تیۆریشەوە جێگەی ڕەزامەندی نیە، چونکە هەمیشە ئەوەی دەستنیشانکەرە، یەکێک لە دەزگاکانی دەوڵەتە، نەک تاکە کەس.

ئایا تیۆرەکانی پەیوەندیدار بە یاسای سروشتی لە ڕووی تیۆریەوە بناغەیەکی پێویست بۆ ئەم مەبەستە

دروست ئەکەن؟ بە دەربڕینێکی تر ئایا ئەکرێت زاراوەی "ماف" بە جۆرێک تەفسیر بکرێت کە یا بە مانای دەسەڵاتێک بێت کە دەرئەنجامی سیستەمی بابەتی یاسای سروشتیە، یان بکرێت بە بەشێک لە خودێتی سروشتی مرۆڤ بژمێرێت؟ ئەگەر مەبەست لە یاسای سروشتی سیستەمی فکری قوتابخانەی تۆماس ئەکویناس بێت، وەڵامەکەی ئاسانە، بەڵێ، بەڵام تەنها بەو مەرجەی کە هاوکات لەگەڵ یاسای سروشتیدا، ئەوەش قەبوڵبکەین کە کەنیسەی کاسۆلیک ئەبێت دیاری بکات کە چ کاتێک دەسەڵاتە نادینیەکان ئەو فەرمانانە پێشێل ئەکەن کە لە یاسای سروشتیەوە دێن. ئەگەر وا نەکەین. واتە ئەگەر فەرمانەکان بە بێ ڕەهەندی دەزگایی قەبوڵ بکەین، توشی کێشەیەک ئەبین کە کانت لە فەلسەفەی سیاسی خۆیدا بەرەورووی بۆوە. کانت ئەڵێت: "ئازادی بریتیە لە سەربەخۆبوون لە ئیرادەی ناچارکەری ئەوی دی، و تا ئەو کاتەی ئازادی بتوانێت بەپێی یاسای گشتی، هاوکات لەگەڵ ئازادی هەمواندا هەبێت، تاکە مافی بنەڕەتی و ئەزەلی هەموو کەسێکە لەبەرئەوەی مرۆڤە". بەڵام دیاریکردنی ئەوەی ئایا ئازادی من ئەتوانێت هاوکات لەگەڵ ئازادی ئەوانی تردا بوونی هەبێت، تەنها بەدەست دەوڵەتی فەرمانڕەوایە، بۆچی؟ چونکە مافی یاخیبون ناکۆکە بە چەمکی دەوڵەت. بە وتەی کانت: هەر کەسێک بیەوێت دەسەڵاتی باڵای دەوڵەت سنورداربکات، پێویستە دەسەڵاتێکی زۆرتر یان یەکسان بە دەسەڵاتی سنوردارکراوی هەبێت، و ئەگەر دەسەڵاتی ئەوەی هەبێت فەرمانی یاخیبون بە هاوڵاتیان بدات، ئەبێت هەروا توانای پاراستن و پارێزگاری لێکردنیانی هەبێت، و ئەگەر لە هەر حاڵەتێکیشدا ئەوە دیارییکات کە دروست چیە، ئەتوانێت فەرمانی یاخیبون بە هەموان بدات. بەڵام لەم حاڵەتەدا دەسەڵاتی باڵا بە دەست ئەوەوە ئەبێت نەک بە دەست سەرچاوە واقعیەکانی شتەکان. ئەمەش خۆی ناکۆکیە"، ئەم ئەرگۆمێنتە لەڕووی لۆژیکیەوە هیچ جێگەی ڕەخنە نیە، بەڵام ئاشکراکەری گرفتێکە کە زانستی تازەی سیاسەت لە ڕووی تیۆریەوە گیرۆدەی بووە.

کێشەی فەلسەفەی سیاسی -و کێشەی بە ڕووکەش چارەسەر نەکراوی ئەم فەلسەفەیە- ئاشتکردنەوەی ئازادیە لەگەڵ ناچارکردندا. هاوکات لەگەڵ دروستبونی ئابووری پارەدا، دەوڵەت لە سەردەمی تازەدا لە بەرگی ئەو دەزگایانەدا دەرئەکەوێت کە بانگەشەی ئەوە ئەکات کە بۆ ئەوەی بازرگانی لەسەر بنەمایەکی دڵنیا بگەشێتەوە و هاوڵاتیان لە بەرهەمی کار و هەوڵەکانیان بخۆن، ئەوا ئەبێت دەسەڵاتی ناچارکردن بە تۆپزی لەدەستی دەوڵەتدا بێت. هاوڵاتی بە دروستکردنی ئەم دەزگایە و دانانان بە دەسەڵاتی فەرمانڕەوایکردنیدا، لەهەمانکاتدا ئامێرێکیان دروستکردووە کە ئەیتوانی لە ئەنجامی شیرینی هەوڵەکانی و لە پشتیوانی پێویست مەحرومی بکات و زۆرجاریش ئەیکرد. لێرەوە لەهەمانکاتدا کە هەوڵیئەدا پاساو بۆ دەسەڵاتی فەرمانڕەوا بهێنێتەوە، بە نیازبوو پاساو بۆ سنورداربونی دەسەڵاتی دەوڵەت بۆ ناچارکردنیش بهێنێتەوە. مێژووی بیرکردنەوەی سیاسی تازە، مێژووی هەوڵدانە بە مەبەستی پاساوهێنانەوە بۆ ماف و زۆرکردن یان یاسا و دەسـەڵات. هیچ تیۆرەیەک لە زانستی سیاسەتدا نیە کە ئەم دوو کارە بە یەکەوە نەکات. تەنانەت توندڕەوترین تیۆرەکانی لایەنگری دەوڵەتی ڕەها (وەک تیۆرەکانی هۆبز و سپینۆزا) کە سەرەتا بە ڕووکەش مافە فەردیەکان لە دەرگا ئەکاتە دەرەوە، دیسان ئەو مافانە لە پەنجەرەوە ئەکاتە ژورەوە: هۆبز لەو

ڕێگەیەوە کە حاکم ئەکات بە نوێنەر یان کارگوزاری بازرگانی کۆمەڵگا و ئەگەر لەکارەکەیدا سەرکەوتوو بوو، هەموو دەسەڵات و هەڵبژاردنەکانی پێ بسپێرێت و ئەگەر لە سەقامگیری ڕێکخستنی ئاسایشدا شکستی خوارد، هەموو دەسەڵاتەکانی لێ بسەنێتەوە، سپینۆزاش بەوجۆرەی کە بەو پێوەرەی دروستی کردووە و مافی یەکسانکردووە بە زۆرکردن، ڕێگە بە هەر گروپێکی کۆمەڵایەتی خاوەن دەسەڵاتی پێویست ئەدات کە دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی خۆی بە ماف بگۆڕێت و alterius iuris (واتە نەبونی ئەهلیەت بۆ خاوەندارێتی ماف) بگۆڕێت بۆ sui iuris (واتە بونی ئەهلیەت بۆ خاوەندارێتی ماف). تەنانەت لۆک کە لایەنگری ماف و یاسایە، خۆی بە ناچار ئەزانێت کە "دەسەڵاتێکی تایبەت بۆ شا دابنێت و ڕێگەی پێبدات هەرکاتێک ماف و یاسای بوونی دەوڵەت بخاتە مەترسیەوە -و هەندیکجار بە پێچەوانەی یاساوە- دەستبەکار بێت. ئەگەر بمانەوێت بابەتەکە لە چوارچێوەی پێوەرێکدا کورت بکەینەوە، ئەبێت بەمشێوەیە بڵێین کە: ئازادی نەک تەنها ئازادیە لەبەرامبەر دەوڵەتدا، بەڵکو ئازادیە بەهۆی حکومەتەوە. ئەم دوو ڕەهەندە لەهەندێک بارودۆخی مێژوویدا ڕەنگە پێکەوە هاوئاهەنگ و گونجاو بن و لە هەندێک دۆخی تریشدا نا. ڕەنگە بۆ هەندێک لە گروپەکان لە کۆمەڵگادا هاوئاهەنگی و گونجانێکی وا دروست ببێ و بۆ گروپەکانی تر نا.



ئایا ئەتوانین ڕێگەچارەی کانت بۆ چارەسەری ئەم ناکۆکیە قەبوڵبکەین؟ ڕێگەچارەی ناوبراو تەنها فۆرمەلەکردنی سەرلەنوێی بیرکردنەوەی ڕۆسۆیە کە ئیرادەی گشتی بە گەورەترین هاوئاهەنگیکەری بەرژەوەندیە گشتیەکانی نەتەوە و بەرژەوەندیەکانی هاوڵاتیان ئەژمار ئەکرد. بەڵام تیۆرەی لایەنگری دیموکراسی هیچ چارەیەکی بۆ کێشەی مافی یاخیبون نەدۆزیوەتەوە.

تیورەی پێکهاتەیی (واتە تیورەیەک سەبارەت بە بنەما و سەرچاوەی دەسەڵاتی سیاسی) هیچ ڕەوایەتیەک لەم ڕێگەیەوە بۆ کارەکانی دەسەڵات دەستەبەر ناکات. لە دیموکراسیشدا ئەشێت زۆرینە دەستدرێژی بۆ سەر مافی کەسانی تر بکات. هەرگیز هەڵە نابێت بە ڕاست، لەبەرئەوەی زۆرینە ئەیەوێت و بگرە ڕەنگە لەم ڕێگەیەوە ببێت بە هەڵەیەکی گەورەتر.

هەندێک ئەرگۆمێنت ئەهێننەوە کە مافی یاخیبون لەگەڵ ڕژێمە نادیموکراتیەکاندا ئەگونجێت و لە ڕژێمە دیموکراتیەکاندا ئەکرێت چاوپۆشی لێبکرێت، چونکە لەمجۆرە ڕژێمانەدا هەل و دەرفەتی پێویست بۆ دەربڕینی بیروڕای کەمایەتی





هۆبز

دەستەبەر ئەکرێت. لایەنگرانی ئەم بۆچونە بەمشێوەیە دیموکراسی بە بەشێک لە مافی یاخیبون وێنا ئەکەن کە شکڵی دەزگای وەرگرتووە. بەڵام ئەم ئەرگۆمێنتە بێ بایەخە و بە ئەنجامی دروستمان ناگەیەنێت. جگە لەمە گرفتێکی پراکتیکیشی هەیە. ئەوەی کە دیموکراسی بەراستی پارێزگار و بەرگریکاری دیدی کەمایەتی بێت، پەیوەستە بە دیاریکردن و هەڵسەنگاندنەوە. لەبارەی هەر بەشێکی دیموکراسیەوە ڕەنگە ڕووبەڕوی تیورەی جیاواز ببینەوە. لێرەوە لەلای کەسانێک کە بە هەق یان ناهەق بانگەشەی ئەوە بکەن کە ڕژێم بە پێی پێویست مافەکانیان دابین ناکات، مافی یاخیبونی تاکەکەسی هەروا ئەمێنێتەوە. بەو هۆیانەی کە پێشتر باسکرا، ناکرێت وەڵامی ئەمجۆرە کەسانە بە پشتبەستن بە سەربەخۆی داد بدرێتەوە.

لێرەوە دیموکراسی بێگومان ڕودانی گرفتی مافی یاخیبونی تاکەکەسی کەم ئەکاتەوە، بەڵام لەناوی نابات.

کەوابوو بە ناچار ئەگەڕێینەوە بۆ تیورەی مافی خۆڕسک یان سروشتی (واتە یاسای سروشتی). لێرەدا ئەبێ جیاوازیەکی گرنگ بکەین کە ئەویش جیاوازیە لەنێوان بناغەی تیۆری مافە سروشتیەکان و دەرکەوت و دیاردە هەستپیکراوەکانی.

دەرکەوتە دیار و دەرەکیەکانی یاسای سروشتی (واتە سیستەمێکی مافی سروشتی کە هەڵگری فەرمان و قەدەغەکردنی دیاریکراوە) لە رووی تیۆریەوە قابیلی بەرگریکردن نیە. ئەو گرفتانەی هیوم و هیگڵ هێنایانە پێشێ، بێ وەڵامە. هەموو ئەمجۆرە ڕژێمانە لەڕووی فەلسەفیەوە دڵخوازانەن. چەند سیفەتێک لە دۆخی سروشتیدا ئەخەنە پاڵ مرۆڤ و پاشان سیستەمێکی دیاریکراو کە پێکهاتووە لە هەندێک ماف و ئەرکی سروشتی یان خۆڕسک لەوەی بە مەیلی خۆیان لەبارەی سروشتی مرۆڤەوە وتویانە، هەڵئەهێنجێنن. نەک هەر هیوم و هیگڵ

بەڵكو زۆركەسی تر لەوانە ژۆرژ سۆرێلیش ئەو خاڵەیان بە بیر هێناوەتەوە كە ئەكرێت بە دژی ئەو بۆچونەی كە وتران قایل بین. بە وتەی هیگڵ "بنەمای رێنمایكەر بۆ a pirori (واتە شتی پێش ئەزمون)، a posterior (واتە شتی دوای ئەزموون)ە". رۆسۆش بەهەمان شێوە ناڕازیبونی خۆی لە پەیڕەوانی تیورەی یاسای سروشتی دەربڕیوە و ئەڵێت:

"ئەو (واتە ئەو كەسەی پەیڕەوی تیورەی یاسای سروشتیە) سەرەتا بەدوای ڕێسایەكدا ئەگەڕێت كە ڕێكەوتن لەسەریان بە سود و قازانجی خودی مرۆڤەكانە، و پاشان بێ هیچ هۆیەک جگە لە مەزیەتێكی گریمانەی كە بڕیارە لەم ڕێگەیەوە بەدەست بێت، ناوی "یاسای سروشتی" بە ڕێسا ناوبراوەكان ئەدات. هەموو فەیلەسوفانی پەیڕەوی ئەم قوتابخانەیە، پەیرەوی ئەم شیوازەیان كردووە. دەرئەنجامی ئەمە ئەوەیە سەرجەم ئەو پێناسانەی ئەم زانایانە لەگەڵ ئەوەشدا كە ناكۆكن بەیەكتر، تەنها بەو ئەنجامە ئەگات كە بێ ئەوەی كەسێک لە حەكیمە میتافیزیكیە گەورەكان بێت، مەحاڵە لە یاسای سروشتی بگات و بە پەیڕەوكردنی كامەران بێت. ئەمەش دەربرینێكی تری ئەو مانایەیە كە مرۆڤەكان ئەبێت بۆ دامەزراندنی كۆمەڵگا، خاوەن زیرەكی و حیكمەتێک بن كە تەنها هێواش هێواش كەمایەتیەكی بچوكی تاكەكان ئەتوانن بەدەستی بێنن، ئەویش بە زەحمەت و لەناو خودی كۆمەڵگادا"



بە بڕوای من مومكین نیە لەگەڵ ئەم ڕەخنانەدا هاوڕا نەبین كە لەبارەی ڕواقیەكان و تۆماسی وقەدیس و هۆبز و پۆفندرۆف و لۆک و كانت و زۆرێكی ترەوە بەهەمانشێوە ڕاستە.

٣

بەڵام ئەم ڕەخنانە تەنها بەو مەرجە ڕاستە كە ڕووی لە یەكێک لەو سیستەمە دیاریكراوانەی ماف و ئەرک بێت كە لە یاسای سروشتیەوە دەرهێنراوە. ئەگەر ئەم ڕەخنانە ڕووی لە بناغەی فەلسەفی ئەم یاسایە بێت، چیدی ڕاست نیە. بناغەی هەر تیۆرەیەكی لایەنگری مافی سروشتی، بوونی بونەوەرێكی عاقڵە بەناوی مرۆڤەوە كە بوونی سەربەخۆیە لەو كۆمەڵگا مەدەنی یان سیاسیەی تیایدا ئەژی. تەنها لایەنگرانی قوتابخانەی ئەفلاتۆن یان هەمەكیخوازان

(universalism) ڕەنگە ئەم ڕاستیە بنەڕەتیە ڕەت بکەنەوە. کاتێک باسی مرۆڤ ئەکەین، باسی بونەوەرێک ئەکەین کە خاوەنی بەهرەی عەقڵە (بە جیا لە بونەوەرە زیندوەکانی تر). بەڵام ئەگەر ڕاستیی ئەم مەسەلەیە قەبوڵبکەین، ئەبێت لانیکەمی ئەو شتانەش قەبوڵبکەین کە دەرئەنجامی ئەم قەبوڵکردنەیە. ئەم لانیکەمە (کە گرنگ نیە لەزگەی مافی سروشتی لێبدەین یان نا) لەبەرانبەر هەر سیستەمێکی سیاسیدا، بەدەر لە ناوەڕۆکەکەی، تەنانەت لە بەرامبەر سیستەمە دیموکراتیەکاندا ڕاستی و بایەخی خۆی ئەبێت.

تەنها تاکەکانی مرۆڤ -نەک کەسی یاسایی و دەوڵەتەکان و لەم بابەتە- ڕەنگە خاوەنی ئەم لانیکەمە بین.

چوار مەسەلەمان بەم ڕونکردنەوانە هەیە:

یەکەم) ناوەڕۆکی واقعی و دیاریکراوی ئەم لانیکەمە، سەرەتا تیورەی یەکسانی یاسایی هەموو تاکەکانی مرۆڤە. وەک چۆن مرۆڤ عاقڵە، ئەوا هەموو مرۆڤەکان عاقڵن. ناکرێت هیچ مرۆڤێک کۆیلە بکرێت. نەک هەر ئەو کەسەی ئەکرێتە ئامانج، بەڵکو هەموو کەسێک خاوەنی مافی یاخیبونە لە یاسایەک کە ئامانجی کۆیلەکردنی بەشێک لە تاکەکانی مرۆڤە. بابەتی ئەم مافە، مرۆڤایەتیە کە هەر تاکێکی مرۆڤ، دەرکەوت و نوێنەرێتی.

دوهەم) هەر یاسایەک کە کاریگەری لەسەر گیان و ئازادی خەڵک هەبێت، ئەبێت خەسڵەتێکی گشتی هەبێت. یاسای تایبەت یاسایەکە کە کەسانێک بەناو و بێ ئەوەی پێویستی بە دادگایکردن لە دادگای داد هەبێت بە تاوانبار ئەژمار ئەکات، و بنەمای یەکسانی پێشێل ئەکات. یاخیبون لەمجۆرە یاسایانە، ڕەوایە.



سێهەم) هەر یاسایەک بگەڕێتەوە بۆ دواوە، بە مانای یاساڕێژیە لەپاش تاوانە کە مرۆڤ لە ژیان و ئازادی مەحروم ئەکات و پێشێلکەری بنەمای گشتیبونی یاسایە، لەبەرئەوە ڕەوایەتی نیە و یاخیبون لێی ڕەوایە.

چوارەهەم) جێبەجێکردنی یاسا کاریگەرەکان لە گیان و ئازادی خەڵکدا، ئەبێت بە دەزگایەکی جیاواز لە دەزگا دەوڵەتیە بڕیاردەرەکان بسپێرێت. تیورەی جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان تا ئەم ئاستە (تەنهاش تا ئەم ئاستە) لە مەسەلەی دوهەم (واتە ئەو مەسەلەیەی کە ئەو یاسایانەی کاریگەریان لەسەر گیان و ئازادی خەڵک هەیە، ئەبێت خەسڵەتی گشتیان هەبێت)- بە پێویست ئەزانرێت.

بە بڕوای من ئەو لانیکەمەی ناوەڕۆکی سیاسی کە لە عاقڵبونی مرۆڤەوە بەدەست دێت، لەم چوار مەسەلەیەدا -نەک زۆرتر- کورت ئەبێتەوە. پێشێلکردنی هەر یەکێک لەم چوار مەسەلەیە، پراکتیکی دەسەڵاتی سیاسی ناڕەوا ئەکات و لێرەوە بە هەر کەسێک (جا چ پێی خۆی لە ئارادا بێت یان نەبێت) مافی یاخیبون ئەدات. بەڵام ئەوەی ئایا ئەم مافە قەبوڵبکرێت و بخرێتە پراکتیکەوە، مەسەلەیەکی ترە.

٢- ئەوەی وتمان ڕەنگە زۆر کەم مایە دەرکەوێت و کەس ڕازی نەکات. بەڵام تەنها بە مەرجێک وا دەرئەکەوێت کە ئەوە فەرامۆش بکەین ڕەوایە مرۆڤ سەرپێچی لە هەر فەرمانێکی حکومەتی خۆی بکات، ئەگەر ویژدانی ناچار بەمەی بکات. تەنانەت هیگڵیش دانی بەم مەسەلەیەدا ناوە. بە بڕوای هیگڵ "بانگی دەرونی" مرۆڤ ڕەنگە ناکۆک بێت لەگەڵ یاسا دانراوەکاندا. بەڵام ئەبێت تێبینی ئەوە بکەین کە

مەسەلە، مەسەلەی "ماف" نیە. ناتوانرێت حوکمێکی گشتی دەربکرێت کە پێمان بڵێت چ کاتێک ڕەوایە کە ویژدانی کەسێک فەرمانی پێبکات کە ملکەچی یاساکانی دەوڵەت نەبێت. ئەبێت هەر کەس بە تەنیایی لەگەڵ ئەم مەسەلەیەدا دەست و پەنجە نەرم بکات. ئەگەر بەو ئەنجامە بگات کە ئەبێت سەرپێچی بکات، ناتوانێت پشت بە هیچ "هەقێک" ببەستێت، هەرچەندە ڕەزامەندی و ئارەزوی سەرکەوتن لە ئێمەوە بەدەست دێنێت. جگە لەو چوار مەسەلەیە لەبارەی مافی بی قەید و شەرتی سەرپێچیەوە، هەر کەس ئەبێت بە شەخسی بڕیار بدات. لۆک و هیگڵ هاوڕان کە ئەگەر دەوڵەت بەهێز بێت، سەبارەت بەو کەسانەی کە بە حوکمی ویژدان ناچارن سەرپێچی لە فەرمانەکانی حکومەت بکەن، نەرمی ئەنوێنێت. ئەگەر نەرمیشی نەنواند، دیسان کەسی یاخی لەبری ئەوەی گۆێڕایەڵ بێت و بە هێمنی بمێنیتەوە، یاخی ئەبێتەوە و خۆی ئەخاتە مەرسیەوە.

هیچ تیورەیەک ناتوانێت لەبەردەم دووڕیانی ویژدان و ڕێکخستنی کۆمەڵایەتیدا، ڕێگەیەک بخاتە بەردەمان، ئەگەر وای پیشان بدات کە ئەتوانێت، هیچ کارێک ناکات جگە لە دوبارە کردنەوەی فورمۆلە هەمەکی و بەتاڵەکان کە بڕیارە تەنیا ئەو ڕاستیە بشارنەوە کە ئەمکارە مەحاڵە.

بەم ئاوازە گومانکاریانە، کۆتای بەم وتارە دێنم.

وەرگێڕانی فەسڵێکە لەم کتێبەی خوارەوە:

فرانس نۆیمان:ازادی و قدرت و قانون. ترجمە: عزت الله فولادوند. شرکت سهامی انتشرات خوارزمی. چاپ اول /تهران ١٣٧٣.

# دەربارەی سیگموند فرۆید

نووسینی: ویلیام ئی. دێل و تیمۆتی کەی. بێل
لە ئینگلیزییەوە: پێشڕەو محەمەد

سیگموند فرۆید (١٨٥٦-١٩٣٩) لە خێزانێکی جولەکە لە فرایبورگی ئەڵمانیا لەدایکبووە. کاتێک فرۆید تەمەنی چوار ساڵان بوو، خێزانەکەی ڕۆیشتن بۆ ڤییەنا. لە تەواوی ساڵەکانی فێرگەدا، فرۆید فێرخوازێکی بەبڕشت و لێهاتوو بوو. فرۆید لە ساڵی ١٨٧٨دا، لەبواری پەروەردەی جەستەییدا بڕوانامەی وەرگرتووە و هاوکات بڕوانامەی پزیشکی لە زانکۆی ڤییەنا، لە ساڵی ١٨٨١دا بەدەستهێناوە. لە ساڵی ١٨٨٥دا، فرۆید لە بەدەستهێنانی بڕوانامەی سکۆلاری پزیشکیدا سەرکەوتوو دەبێت و پاشان بەرەو پاریس سەفەر دەکات، بۆ ئەوەی لە پاریس لەژێر چاودێری ژان مارتین شارکۆ (١٨٢٥-١٨٩٣) لە نەخۆشخانەی سالپێتریە کاربکات. شارکۆ کاری لەسەر هیستریا دەکرد و بە گشتی سەرنجی فرۆیدی بەلای خۆیدا




ڕاکێشا، چونکە هیستریای وەکو نەخۆشییەک دەبینی و هەروەها هیپۆنۆتیزمی بەکاردەهێنا بۆ کەمکردنەوەی سیمپتۆمی (نیشانەکانی) هیستریا لە نەخۆشەکاندا. لە ساڵی ١٨٨٦دا، فرۆید لە ڤییەنا وەکو پزیشکێک دەستی بەکارکرد و لەوێ بەگشتی سەرنجی کارەکەی خۆی لەسەر تێکچوونی سیستەمی دەماری چڕ کردەوە. ئەو لە ڤییەنا مایەوە تا ساڵی ١٩٣٨، واتا ئەو کاتەی نەمسا لەلایەن نازییەکانەوە داگیرکرا، فرۆید کۆچی کرد بۆ ئینگلاند. لە لەندەن کۆچی دوایی کرد.

فرۆید دامەزرێنەری دەروونشیکارییە. لە ساڵی ١٩٢٢دا، وتارێکی گشتی نووسی، لەو وتارەدا سێ پێناسەی بەیەکەوەبەستراو بۆ دەروونشیکاری زیتدەکاتەوە: (١) لقێکە کارەکەی لەسەر توێژینەوە لە ناخودئاگا چڕکردۆتەوە، (٢) مێتۆدێکی چارەسەرکردنی دەرمانییە بۆ ڕەفتارکردن لەگەڵ تێکچوونی سیستەمی دەماری، (٣) هەروەها کۆمەڵێک داتای لێکۆڵینەوەیە، کە بەرەوپەرەسەندنە. ئەم سێ پێناسەیە بەیەکەوە یارمەتیمان دەدات وەکو دەروازەیەک بچینە ناو کارەکەی فرۆیدەوە.

فرۆید لە پێناسەی یەکەمدا، دەروونشیکاری وەکو دیسپلینێکی (لقێکی) ئەکادیمی دەبینێت، کە ئامانجەکەی بریتییە لە توێژینەوە و شرۆڤەکردنی ئەو پرۆسە مێنتەڵ(هۆش)یانەی زانستەکانی دیکە ناتوانن بەئاسانی دەستیان پێی بگات، فرۆید ئەمانە بۆ کارکردن لەسەر ناخودئاگا وەسف دەکات. ئەگەر بەساناهی بڵێین، ناخودئاگا، بریتییە لە هەمان بەشی ناخودئاگای هۆش. بەمجۆرە، ناخودئاگا کاریگەریی لەسەر خودئاگا و ڕەفتار بەجێدەهێڵێت، بەڵام ئەمە ڕاستەوخۆ ناگاتە دەستی کەسی لێکدەرەوە و ڕاڤەکار. داهێنانەکانی فرۆید لە سایکۆلۆژییدا تەواو بریتی نەبوو لە دۆزینەوەی ناخودئاگا (بۆنموونە، نیتچەش لەبارەی ناخودئاگا نووسیبووی). بەڵام دۆزینەوە و داهێنانەکانی فرۆید ئامرازێکیان خستەڕوو بۆ ڕاڤەکردن و لێکدانەوەی ناخودئاگا. ئەو شرۆڤەکردنی لوغزە زمانییەکان، نوکتەکان، و لەهەمووان گرنگتر، خەونەکانی وەکو «شاڕێ» ی گەیشتن بە ناخودئاگا دادەنا. فرۆید باوەڕی وابوو خەونەکان، دەبنە هۆی دەرکەوتنی حەز و ئارەزووەکانی ناخودئاگا. هۆشی خودئاگا دەکەوێتە سانسۆرکردنی ئەم حەز و ئارەزووانە،

چونکە ئەوانە وەکو تابوویەکی کۆمەڵایەتی دەردەکەون و هەرەشە لە تەواویێتی «خود» دەکەن. بۆ فرۆید، ناوەڕۆکی ناخودئاگا بریتییە لە جەوهەری ئەو بزوێنەرانەی لەڕوانگەی خودی خودئاگاوە ڕەتکراوە و ناپەسەندن و لەم ڕووەوە، خودئاگا بە سوودوەرگرتن لە میکانیزمەکانی چەپاندن، ئەم بزوێنەرانە دەخاتە دەرەوەی خودئاگاوە. ئەم بزوێنەرانە، هەڵگری ئەو بزوێنەر و یادەوەرییانەن، کە پەیوەستن بە «قۆناغی سەرەتایی» (واتا هەموو یادەوەرییەکانی قۆناغی منداڵێتی لە بینینی سێکسی دایک و باوکدا) و هەروەها حەز و ئارەزووە تابووەکان، کە ئەمانەش پەیوەستن بە گرێی ئۆدیپەوە. ئەم بزوێنەرانە، ئەگەرچی چەپێنراون، بەڵام لە خەونەکان و «لوغزە فرۆیدییەکان» و فۆرمەکانی دیکەدا، جارێکی دی بە زەرووڕەت دەردەکەونەوە.

گرێی ئۆدیپ بەشێکی گرنگی تێگەیشتنی فرۆیدە لە خودئاگایی مرۆڤ و بنەڕەتی تێکچوونی سیستەمی دەماری. ناوی ئەم گرێیە، لە ئەفسانەیەکی گریکی بەناوی ئۆدیپوسەوە هاتووە، ئۆدیپ بێ هۆش و ئاگا باوکی خۆی دەکوژێت و دایکی دەکات بە ژنی خۆی، و کاتێک ڕاستی ئەو کارەی بۆ دەردەکەوێت، کە کردوویەتی، یەکسەر خۆی کوێر دەکات. بۆ فرۆید، گرێی ئۆدیپ بریتییە لە کێشکردنی منداڵ بۆ دایک و باوکی ڕەگەزی پێچەوانە و ئیرەییبردنی منداڵەکەیە بۆ هاوڕەگەزی خۆی. هەرچەند کچان و کوڕان بەشێوەیەکی جیاواز ئەزموونی ئەم کێشکردنە دەکەن، بەڵام لەهەردوو لایەندا ئامانجەکە ئەوەیە، کە لە ئیرەییبردن بە دایک و باوکی هاوڕەگەز بپەڕنەوە بۆ دایک و باوکی ئەم یان ئەو. فرۆید باوەڕی وایە گرێی ئۆدیپ شتێکی گشتگیر و یونیڤێرسەلە، ئەگەر کچەکە یان کوڕەکە سەرکەوتوو نەبێت لە سەرکەوتن بەسەر ئەوەدا، دەبێتە هۆی ئەوەی تووشی تێکچوونی سیستەمی دەماری ببێت.

پێناسەی دووەمی فرۆید بۆدەروونشیکاریی بریتییە لە مێتۆدی چارەسەرکردنی دەرمانی بۆ تێکچوونی سیستەمی دەماری. ئەم مێتۆدە پێویستی بە دامەزراندنی پەیوەندییەکی سانسۆرنەکراو و ئازاد هەیە لەگەڵ نەخۆشدا (یان ئەوەی شیکاری لەسەر دەکرێت). کچ یان کوڕە نەخۆشەکە لەسەر تەختەخەوێک پاڵدەکەوێت و دەروونشیکار لەتەنیشتییەوە دادەنیشێت و گوێ لە نموونە ورد و زیرەک و ئاشکراکانی پرۆسەی ناخودئاگای نەخۆشەکە دەگرێت، ئەمانەش سەرچاوەی تێکچوونی سیستەمی دەمارییین. کەواتە میدیای بنەڕەتی دەروونشیکاری، بریتییە لە گوتار و دەربڕینی وشەکان. لەڕاستیدا، یەکێک لە نەخۆشە یەکەمینەکانی فرۆید بەڕاشکاوییەوە گوتبووی تایبەتمەندی دەروونشیکاریی بریتییە لە «دەرمانکردن بەڕێی دواندن»ـەوە. ئەم گوتنە لە ڕاستیدا گرنگییەکی بەهێزی نییە، بەڵام سوود لەزمانی هۆشی خودئاگا وەردەگیرێت بۆ ئەوەی نیشانەکانی ناخودئاگا دەربکەون. سەبژێکتی مرۆڤی بێژەر وەکو سەبژێکتێکی پەرتبوو لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکرێت، واتا وەکو شوێنی ململانێی نێوان بزوێنەرە خودئاگا و ناخودئاگاکان، چونکە ئەم بزوێنەرانە بەیەکەوە نایەنە نێو «خود»ێکی تاک و تەنها

و تەواو. لەسەر ئەم بنەمایە، هەندێک باسیان لەوە کردووە، ئاراستەکەی فرۆید ئەوە بووە، کە سوودی لە مێتۆدی لێکدانەوەی خاخامە جولەکەکانی پێش خۆی وەرگرتووە، چونکە خاخامەکان تێکستێکی کتێبی پیرۆز وەکو سەرچاوەیەکی ناسنووورداری واتایی دەبینن، و باس لە باڵاترین تایبەتمەندییەکان و پەیوەندییە زمانییەکانی نێوان تێکستەکان دەکەن.

پێناسەی سێیەمی فرۆید بۆ دەروونشیکاریی بریتییە لە کۆمەڵەیەکی پەرەسەندووی لێتوێژینەوەی ئەکتیڤی زانستی، کە توێژینەوەی تایبەت، لێکۆڵینەوەی داتایی لە هۆش و مێشک و لێکدانەوە و تەفسیری لایەنەکانی دیکەی کاری کولتووری لەخۆدەگرێت. لەڕاستیدا، فرۆید خۆی سنووردارنەکرد بە شرۆڤەکردنی سەبژێکتە تاکە مرۆییەکانەوە، هەروەها چاوپۆشیشی نەکرد لە توێژینەوەی بوارە ئەکادیمییەکانی دیکەی زانستە سروشتی و مرۆییەکان. لەڕاستیدا، ئەو، ڕاڤەکارێکی بەتوانای کولتوور بوو، و بە بەکارهێنانی ئەرکیۆلۆژیی (دێرینەناسی)، ئەنترۆپۆلۆژیی (مرۆڤناسی)، زمانناسیی و ئەدەبیاتەوە، خەریکی توێژینەوەی کولتوور دەبوو.

فرۆید ئیشی تایبەتی لەسەر ئایین دەکرد. سەرباری کۆمەڵێک وتار، کە پەیوەندیدارن بە فەنکشنە (ئەرکە) کەسێتی و کۆمەڵایەتییەکانی ئایین، ئەو سێ کتێبی سەرەکیشی لەم بارەیەوە نووسیوە. یەکەمیان، بریتییە لە کتێبی تەوتەم و تابوو (یەکەمجار لە ئەڵمانیا لە ساڵی ١٩١٣دا بڵاوکرایەوە)، فرۆید لەو کتێبەدا پەرە بە تیۆریی ئایینی دەدات و بونیادی سەرچاوە سایکۆلۆژییەکانی کۆمەڵگەی سەرەتایی دادەمەزرێنێتەوە، فرۆید، وەکو ئایینناسەکانی دیکەی هاوچەرخی خۆی، ئاماژە بۆ دوو حەرامکردن یان تابوو دەکات، کە لە نێوان کولتووورە خێڵەکییەکاندا هاوبەش بووە، ئەوانیش: زیناکردن لەگەڵ مەحرەم و خزماندا و خواردنی ئاژەڵی تەوتەمی خێڵ. جیاواز لە ئەوانیدی، فرۆید جەخت دەکاتەوە لەسەر ئەوەی ئەو حەرامکردنانە جێبەجێ نەدەکران، بەگشتی ئەگەر هاتبا و حەزێک بۆ ئەنجامدانی ئەم تابووانە نەبووایە. فرۆید وایدەبینێت ئەم دوو حەرامکردنانە بەیەکەوە گرێی ئۆدیپ نیشان دەدەن. لە پشتی ئەم حەرامکردنانەوە، ئەو گریمانەی ئەوەی دەکرد، کە لەو قۆناغە خێڵەکییەدا بوو کاتێک کوڕەکان بە گشتی باوکانی خۆیان، یان سەرۆکەکانیان دەکوشت بۆ ئەوەی ببنە خاوەنی ژنەکانی ئەوان/واتا دایکی خۆیان. پاشان، گرفتاری شکست و گوناە دەهاتن، و پەیکەری تەوتەمێکیان بۆ ناساندنی باوکیان دادەنا بۆ ئەوەی ببێتە سیمبولی پیرۆزیی خێڵەکە. بەمجۆرە، سەرچاوەکانی باوککوژی بەشێوەیەکی سیمبولییانە قەدەغەکرا. بەم هۆیەوە، دوو تابوو داهێنران، و سەپێنران بۆ ئەوەی ئەندامانی خێڵ نەکەونە نێو گوناهی ئۆدیپییەوە، ئەوانیش: حەزی زیناکردن لەگەڵا دایک و باوککوژی.

فرۆید بەردەوام دەبێت لە لێکۆڵینەوە لەبارەی ئایین، ئەویش لەکتێبەکەی دیکەیدا بەناوی «ئایەندەی وەهمێک» (١٩٢٧). لەکاتێکدا لە

کتێبی «تەوتەم و تابوو»دا خەریکی ڕاڤەکردنی پێشمێژوویی ڕابوردووی شارستانێتیی مرۆیی دەبێت، ئەوا لە کتێبی «ئایەندەی وەهمێک»دا لێکۆڵینەوەکەی لەسەر ڕەوشی ئەمڕۆیی ئایین چڕدەکاتەوە -بۆنموونە، باوەڕبوون بە خودا- و لەم کتێبەدا خەریکی نیشاندانی پرۆجەکشن (خستنەسەر)ی ئایەندەی ئایین دەبێت لە کۆمەڵگەی مۆدێرندا. بەدیدی فرۆید، ئەگەر وەهمێک ئەو شتە بێت کاتێ کەسێک ئارەزووی ڕاستیبوونی دەکات، کەواتە باوەڕبوون بەخوداش بڕێتییە لە وەهمێک.

ڕاستی ژیان لەم جیهانەدا، جۆرێکە لە درندایەتی و کۆتاییهاتن، لەم ڕووەوە، ئێمەی مرۆڤەکان بەدوای شتێکدا دەگەڕێین بۆ ئەوەی یارمەتیدەرمان بێت تا بتوانین بەرگەی ئەم ڕاستییە بگرین.


فرۆید

کاتێ منداڵین، دایک و باوکمان لەبەرانبەر ئەم ڕاستییەدا دەمانپارێزن، لەهەمووی زێتر، یارمەتیمان دەدەن بۆ ئەوەی باوەڕ بەوە بهێنین، کە هەموو شتێک باشە، و ئێمە بەمجۆرە لە بەرانبەر تۆفاندا هەست بە سەلامەتی دەکەین. (بێگومان، دایک و باوکمان دەزانن وەها ئاساییش و سەلامەتییەک لەکۆتاییدا جگە لە وەهمێک شتێکی دیکە نییە). کاتێک دەگەینە تەمەنی هەرزەکاری، ئەوا دووبارە پێویستمان بە ئاساییش و سەلامەتی هەیە لەمجۆرە وەهمە، بەڵام دایک و باوکانمان بۆ ماوەیەکی درێژ پارێزگاری لە ئێمە ناکەن. کەواتە ئەم ئەرکە دەکەوێتە ئەستۆی ئایین.

ئایین پرۆجەکشن (خستنەسەر)ی ئەو شتەیە، کە ئێمە دەخوازین ڕاست و دروست بێت، پرۆجەکشنی ئەو خودایەی دایک و باوکی کۆتایی و ئایدیالییە. ئایین گوزارشتکردنە لە ویستی گەیشتن بە ئاواتەکان. بۆیە فرۆید پێیوایە نهێنیی هێزی ئایین «لە هێزی گەیشتن بەم ئاواتانە» دایە. (ئایەندەی وەهمێک، ل٣٠).

لەم ڕووەوە، بەدیدی فرۆید، باوەڕی کۆمەڵگە بە خودا شتێکە، هاوشێوەی تێکچوونی سیستەمی دەماری دەستەجەمعییە، کە لە گرێی ئۆدیپەوە سەرچاوە دەگرێت. بەم جۆرەی کۆمەڵگەی مرۆیی بەردەوام دەبێت لە پەرەسەندن و وردە وردە گەورە دەبێت، ئەوا بەم هۆیەوە حەز و ئارەزووە منداڵانەکەیشی لەتەکیدا گەورەتر دەبێت، فرۆید باوەڕی وایە ئەم کۆمەڵگایانە پێداویستییەکانیان هاوتەریب لەگەڵ

شێوازی باوکانیان بەرەوپێشەوە دەبەن. عەقڵی مۆدێرن، وەهم دەکاتە جێگرەوە.

ناسراوترین و داهێنەرانەترین کاری فرۆید لەبارەی ئایین، بریتییە لە کتێبی «موسا و یەکتاپەرستی» (ئەم کتێبە لە نێوان ساڵانی ١٩٣٤ و ١٩٣٨دا نووسراوە)، فرۆید لەم کتێبەدا هەڵدەستێت بە بونیادنانەوەی بنەڕەتەکانی ئایینی کۆنی ئیسرائیلی، ئەویش بەڕێی خوێندنەوەی سفری دەرچوونی کتێبی تەورات. وەک چاوەڕوان دەکرا، فرۆید گرنگییەکی زۆر نادات بە ڕوانگەی تەوراتیی بۆ موسا و دەرچوونی گەلەکەی، بەڵکو هەوڵدەدات نیشانەکانی چیرۆکی تا ئاستێک فەرامۆشکراوی سەرچاوەی حەقیقی ئایینی ئیسرائیلی بدۆزێتەوە. فرۆید دەڵێت موسا بە ئەسڵ یەهودی نەبوو. ئەو شازادەیەکی میسری بوو پەیڕەوی لە فێرکارییەکانی ئەخناتونی فیرعەون دەکرد، ئەو بەڕێی شۆڕشێکی ئایینییەوە، ویستی پەرستنی ئاتوون، خودای تاک، خودای خۆشەویستی و خودای چاکە و مۆراڵ، بکاتە جێگرەوەی پۆلیتەییزمی (فرەخوداپەرستی) میسری. ئەخناتوون کۆچی دوایی کرد و لایەنگرانی یەکتاپەرستییەکەیشی لەمیسر کەم بوونەوە. حەوارییەکەی، واتا موسا، کۆیلە ئیسرائیلییەکانی خستە ژێر پەیڕەوی خۆیەوە و لەتەکیاندا بەرەو سەحراکان ڕایکرد. بەڵام ئەو کاتە هات، کە جولەکەکان لە موسا و یەکتاپەرستییەکەی بێزار و هیوابڕاو بوون. ئەوان موسایان کوشت، یەهوایان کردە خوای خۆیان، بەڵام پێشتر ئەو خوایەیان بەخوای جەنگ دانابوو و ناوی پەیامهێنەری ئەو خودایەشیان بەسەر موسادا سەپاند. فرۆید دەڵێت کۆدی یاسا و ریتواڵە ئاڵۆزەکانی قوربانیکردن لە تەوراتدا، یاسای ئەو قۆناغەی مێژووی ئیسرائیلییە، کە ماوەتەوە. دوای چەندین سەدە، پێغەمبەرانی وەکو عاموس و ئەشعیا دەرکەوتن و کەوتنە ڕەتکردنەوەی ڕیتواڵە خوێناوییەکانی ئەم خودایە و بانگەشەی گەڕانەوەیان کرد بۆ تاقەخودای خۆشەویستی و مۆراڵ، واتا هەمان ئەو خودا ڕەسەنەی موسای میسریی بانگەشەی بۆ دەکرد. چاکسازانی دواتر، ڕێبەرایەتی مۆراڵێکی باڵاتری ئایینی یەکتاپەرستی جوولەکایەتی و مەسیحایەتییان کرد.

پێویست بە گوتن ناکات، کە هەندێک لە مێژوونووسانی ئایینیی کۆنی ئیسرائیلی ناچاربوون دۆزینەوە بونیادنەرانەکانی فرۆید بۆ بنەڕەتەکانی یەکتاپەرستی جوولەکایەتی قبوڵ بکەن. هەرچەندە سەرباری هەندێک لە دەرەنجامگیرییەکانی، ئەوا ئاراستە تەفسیرکارییەکەی ئەم بوو بۆ ئەو ئەدەبیاتە، کە ڕێگەیەکی سەرنجڕاکێشی بۆ لێکۆڵینەوەی ئایینەکانی جوولەکایەتی و مەسیحایەتی خستەڕوو وەکو ڕووکردنە کانوونی کتێبی پیرۆز. ئەدەبیاتی کتێبی پیرۆز، بەدیدی فرۆید، وەکو نموونەیەکی ململانێ دەردەکەوێت، کە لە نێوان دوو فۆرمی جیاواز لە باوەڕی ئایینی و پراکسیسدا ئامادەیی هەیە. فرۆید باس لە ئەدەبیاتی کتێبی پیرۆز دەکات وەکو پێگەیەک، کە ململانێ و دوولایەنی (یان دەمدەمی و مەزاجی) بەیەکەوە دەردەکەون، هاوشێوەی خەونەکان و لوغزە زمانییەکانی نەخۆشەکانی ئەو، ئەمەش شتێکی زێتر لە خودئاگایی دەردەخات.

ســـەرچاوەی ئەم وەرگێرانە

William E.Deal and Timothy K.Beal: THEORY FOR RELIGIOUS STUDIES. ROUTLEDGE New York • London. 2005. .6-pp.2

سەرچاوەکانی نووسەر

بۆ خوێندنەوەی زیاتر

By Freud

The Interpretation of Dreams. First Part. In The Standard Edition. IV London: Hogarth Press. 1953–74. Obsessive Actions and Religious Practices. In The Standard Edition. IX. London: Hogarth .Press. 1953–74

Totem and Taboo: Some Points of Agreement between the Mental Lives of .Savages and Neurotics

In The Standard Edition. XIII. London: .Hogarth Press. 1953–74

Introductory Lectures on Psycho-Analysis. In The Standard Edition. XV–XVI. London: Hogarth .Press. 1953–74

The Uncanny." In The Standard Edition." .XVII. London: Hogarth Press. 1953–74

Two Encyclopedia Articles." In The" Standard Edition. edited and translated by James Strachey in collaboration with Anna Freud. XVIII. .London: Hogarth Press. 1953–74

The Future of an Illusion. In The Standard Edition. XXI. London: Hogarth Press. .1953–74

Moses and Monotheism: Three Essays. In The Standard Edition. XXIII. London: . Hogarth Press .74–1953

About Freud

Boyarin. Daniel. "An Imaginary and Desirable Converse: Moses and Monotheism as Family Romance." In Reading Bibles. Writing Bodies: Identity and The Book. edited by Timothy K.Beal and David M.Gunn. London and .New York: Roudedge. 1996

Capps. Donald. ed. Freud and Freudians on Religion: A Reader. New Haven: Yale University .Press. 2001

Dicenso. James. The Other Freud: Religion. Culture. and Psychoanalysis. . New York: Routledge .1998

Gay. Peter. Freud: A Life for Our Times. .New York: W.W.Norton. 1988

Handelman. Susan A. The Slayers of Moses: The Emergence of Rabbinic Interpretation in Modern Literary Theory. Albany: State University .of New York Press. 1982

Pals. Daniel. "Religion and Personality: Sigmund Freud." In Seven Theories of Religion. New .York: Oxford University Press. 1996

Rashkow. Ilona N. Taboo or Not Taboo: Sexuality and Family in the Hebrew Bible. :Philadelphia .Fortress Press. 2000

Ricoeur. Paul. Freud and Philosophy: An Essay on Interpretation. Translated by .Denis Savage .New Haven: Yale University Press. 1970

# مارسێل پڕووست و میراتیەکانی

نووسینی: مەهدی سەحابی
لە فارسییەوە: بریا کاکەسووری

ژیانی کەسەکی (شخسی) نووسەرێک، هێمایەکی گرینگ لە کاری ئەو نییە، تەنیا ئەمە گرینگە کە کام نووسەر ئەم قسانە دەکا و لە بەرچی ئەوجۆرە قسەیە دەکا یا جۆرێکی تر قسە ناکا، هەرچەند ناسینی ئێمەش لە بەدیهێنەر بۆ ناسینی بەرهەمەکەی ئەو گرینگە. پڕووست و ئەدەبیات و تەنانەت هونەرەکانی کەش لە شوێنێکی دیاری کراو لە مێژوو و چۆنیەتی نواندنی و راستێتی (واقعیت) راوەستاون. پڕووست لە کام شوێنی ئەدەبیات راوەستاوە و زۆرتر بەرەو کام لا مەیلی هەیە؟ جیهانی کۆنتر یان ئەو جیهانەی کە تازە دەسی پێ کردبوو؟ ئەمە زیاتر باسێکی «شوێنی»یە؛ یانی کەسێک کە لەسەر ناوەندێکی ئاوڕدانەوەی کۆمەڵایەتی راوەستاوە، ئایا زیاتر نوێنەری داهاتووە یان ئێستا، یان هی رابردوو؟ رەنگە هەموو داستانی کتێبی «بەدووی کاتی لە دەس چووەوە« لە بیست یان سی دێڕدا بگێڕدرێتەوە، بەڵام بابەت لەبارەی ئەو شتەوەیە کە کتێب نوێنەری ئەوە؛ کە باسی جۆرێکی تازە لە نواندنی راستێتی‌یە. باسێکی تازە بۆ دەربڕینی راستێتی نییە، بەڵکوو دەکرێ بڵێین



مەهدی سەحابی

باسی وێژانی (بیان) ڕاستێتی‌یە لە گۆشەنیگایەکی تازەوە، چونکە ئەو گۆشەنیگا تازەیە دەکرێ بڵێین ڕاستێتی و واقعیەتێکی تازەیە. با کورتی کەمەوە؛ باسی دەربڕینی ڕاستێتی لەدەروونەوەیە.
لـە لایـەکـەوە نـاکـرێ بڵێین باسی ڕاستێتی لە دەروونەوە باسێکی تازەیە، چونکە هەر لە کۆنەوە، باسی ڕاستێتی و واقعیەت لە دەروونەوە بە جۆرێک، نووسەران، فەیلەسوفان و پێغەمبەران کاریان پێ کردووە، بەڵام بە زمانێکی دەرەکییەوە و بە یارمەتی وەرگرتن لە کەرەسەکانی دەرەوە.
ئەوشتەی وا بە ئاڵوگۆڕی پرووست ناوی دەبەن -نـامـەوێ بـەوە بڵێم دۆزینـەوە (کـشـف)- ئەوەیە پرووست باشترین نوێنەری ئەم بزاڤ و تەڤگەڕەیە، یان لانیکەم کتێبی «بەدووی کاتی لە دەس چووەوە» باشترین نوێنەری ئەو، یانی نواندنی ڕاستێتی لە دەروونەوەیە. دەورەیەکی زۆر دووروودرێژ، ڕاستێتی بە یارمەتی ئامرازەکان، هێما و باروودۆخەکانی دەرەوە، کە بەناچار ڕەنگە خودی ڕاستێتی نەبوون بەڵکوو ئامرازگەلێک، هۆگەلێک، ڕێکارەکان و فێڵەکان بوون، دەریان دەبڕین. سەدەی نۆزدە لە چەند لایەنەوە گەیشتبووە جێگایەک کە لە ئەدەبیاتدا دەبـوو کەسانێکی وەک پرووست بێن. ئەگەر بمانەوێ لە ڕوانگەیەکی ئەرێنییەوە بڕوانین، شتێک نەمابوو کە سەبارەت بە واقعیەت و ڕاستێتی دەرەوە نەگوترابێ و کە ئێستا دەبوو بگوترایە. ڕەنگە بتواندرێ بڵێی سەدەی نۆزدە، لە جیهاندا سەدەی لووتکەی ئەدەبیات بوو. گەورەکانی ئەدەبیاتی سەدەی نۆزدە، بە تایبەت لە ئەدەبیاتی فەڕانسەدا، بە کردەوە هەمووی ئەوان، ئەوشتانەی کە دەبوو بە ئامراز و هێماکانی دەرەکی بگوترێن، گوتبوویان. ئەدەبیاتی ئەوکاتی فەڕانسە ئەگەر لە ئەدەبیاتی وڵاتانی دیکە سەروتر نەبوو، بەڵام لانیکەم بە لایەنی ناوەڕۆک و بابەت و تەنانەت لە ڕوانگەی ناوبانگیشەوە لە هەموویان لەسەروتر بوو.
لە لایەنی نەرێنیشەوە دەتوانین بڵێین کە زمانی ئەو شێوازی دەربڕینی ڕاستێتی‌یە، ئیدی لەوە زیاتر کێشی نەمابوو. هەمووشتێ گوترابوو، هەمووشتێ ئەو جـۆرەی وادەبـوو لە کەوشەنی توانستەکانی زماندا بگوترێ گوتبوویان. بەواتایەکی دیکە دەتوانین بڵێین کە ئیدی زەمانی زمانی ڕاستێتی دیار و بەرچاو گەیشتبووە کۆتایی. ڕەنگە کەسانێک ئەم بیرۆکەیە نەسەلمێنن، بەڵام ئەمە حاشا هەڵنەگرە. نواندنی ڕاستێتی بەرچاو، کەم و زۆر هەمووشتێکی لە خۆگرتبوو. هەر ڕاستێتییەکی بەرچاو گەیشتبووە کۆتایی؛ هـەر ڕاستێتییەکی بـەرچـاو و تایبەتی

گوتن، پێشووتر گوترابوو، [ئێستا] پێویست بوو له روانگەیەکی دیکەوە بدیترێ (چاولێبکرێ). لەو بەینەدا باروودۆخی کۆتایی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستەم و دەسکەوتە زانستیەکان، لە بوارەجۆراوجۆرەکانەوە و بەتایبەت پێشکەوتنی کەم وێنەی لە بواری زانستە مرۆییەکانەوە و بە تایبەت سەرهەڵدانی دەروونناسی و دەروون شیکاریش هێندێ بابەتی تازەی لە بەردەمی نووسەردا بەرز کردبۆوە؛ جیا لەوانەش تێپەڕاندنی دەورانێک کە لە روانگەی فەلسەفییەوە زۆرێک لە ئەزموونە کۆمەڵایەتی‌یەکانی بە گشتی بردبووە ژێر پرسیارەوە و بابەتی تازەی هێنابووە گۆڕێ، کاریگەریان هەبوو.

[هەم رۆمانی] بە دووی کاتی لە دەس چووەوە و [هەم] خودی مارسێل پڕووست و کەسانێکی وەک ئەو، لە شوێنێکی مێژوودا وەستابوون کە زۆرشت بە «راستێتیەوە« زیاد ببوو؛ شت گەلێ کە پێشووتر باسیان نەبوو.

هەڵبەتە زانستی دەروون ناسی لە کۆنەوە سەرنجی بیرمەندان، نووسەران و فیلسوفانی بۆلای خۆی راکێشابوو. چەند لێکدانەوەی تایبەتیش لە پشکنین و ناسینی دەروون و رەنگدانەوەی لە کارکرد و کردەوەی مرۆڤدا هەبوو؛ بەڵام وەک زانستێک و کۆمەڵەیەکی رێسامەند کە خاوەنی تاریفێکی سنووردار بێ و بتوانرێ بە هۆی توانایی‌یەکانی ئەوەوە، شتگەلێ یان هەموو راستێتی دەربڕی، دەسکەوتی ئەم ساڵانەی دوایی سەدەی نۆزدەیە. جیا لەم دوو دنیایە، یانی کۆتایی پێهاتنی هەموو تواناییەکانی زمانی راستێتی بەرچاو لە لایەک و باسی بە کۆتایی گەیاندنی جوان و درەشاوەینواندنی راستێتی لە لایەن هەموو گەورەکانی سەدەی نۆزدەوە، لایەنێکی سێهەمیش لێرەدا دێتە مەیدانەوە، ئەویش باسی ئەو کەرەسە تازانە بوو کە هاتبوونە ناو جیهان و روانگەی جیهان و شێوازی دەربڕینی راستێتییەوە.

پێشکەوتن و ئاڵوگۆڕی دەربڕین لە نقاشی و شێوەکاری سەدەی نوزدەدا، ئێستا لە ئیمپرسیۆنیسمەوە بگرە هەتا هونەری سەڵت (انتزاعی)، یەکێ لە هاندەرە هەرەگەورەکانی سەرهەڵدان، یان لانیکەم یەکێ لە دنـەدەرە بەهێزەکانی پەرەپێدان و دزەکردنی شێوەکاری و نقاشی، هەست بە مەترسی کردن لە وێنەگری بوو. ئەوشتەی کە دواتر بوو بە سینەما؛ یانی ئەوشتەی کە لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدە و سەرەتاکانی سەدەی بیست لە نقاشیدا بەدیهات، جۆرێک بەرەنگاری لە بەرانبەر وێنەگەری دا بوو.

لێکدانەوەیەک هەیە کە دەڵـێ باڵندەی «قـوو»، پێش ئـەوەی بـمرێ، جوانترین بەستەی خۆی دەچریکێنێ. مەترسی سەرهەڵدانی وێنەگەری، هەست بە سەرهەڵدانی ئامرازێکی دەربڕینی زۆر بەهێز بوو کە شێوەکاری لە سەر تەختی گەورەییەوە حەواداتە خوارێ. ئەمە هونەری شێوەکاری بوو کە پێی وابوو ئەو دەتوانێ راستێتی و واقعیەت دەرببڕێ و بە باشترین شێوەنیشانی بدا. هەر ئەم بابەتەش بووە هۆی ئەوەی کە نقاشی ئەو هەنگاوە گەورانە هەڵبێنێتەوە. ئایا ئەم جۆرە تازەدەربڕینەی راستێتی لە ئەدەبیاتدا، ئەم جۆرە چوونە ناو دەروونی تاکەوە، ئەمجار ئینسان و راستێتی لە دەروونی ئینسانەوە دیتن، نەک لە دەرەوە، ئایا ئەمەش بە هۆی هەست بەمەترسی کردن و وەپێشکەوتنێکنەبووە لە ئامرازێکی دەربڕینیدیکە -بۆوێنە، شتێکی وەک سینەما-؟ بە بڕوای من پرسیارێکی سەیرە و جێگای تێفکرینە. لە سەر بناغەی ئەم سێ یان چوار لەبەرچاوگرتنە، لەگەڵ باروودۆخێکی تازە لە ئەدەبیاتی ئوورووپادا رووبەڕوو دەبینەوە کە نوێنەرایەتی ئەو لە پڕووستدا دەبینین؛

یانی هەرجۆرە دەبڕینێکی ڕاستێتی خستنەلاوە و ڕاستێتی و واقعیەتی ناوەوەی مرۆ، لە ناوەوە دیتن. کەوایە بە لایەنی مرۆڤەوە، ئەم ڕاستێتی‌یە، دەبێتە ڕاستێتی هەموو جیهان. ئەگەر پێشتر کەسانێکی وەک باڵزاک، تۆلستۆی و... بە نواندنی بارودۆخێکی گشتی جوغرافیایی -وەکو کتێبی «شەڕ و ئاشتی»- یان هەموو بەرهەمەکانی باڵزاک یا نەخشاندنی ڕوانگەیەکی تەنانەت جوغرافیایی گشتگیر، دەیانتوانی ئینسان بنوێنن، ئێستا ڕاست بەپێچەوانەی ئەو بارودۆخە کاردەکەین؛ یانی بە کۆڵینەوەی قوڵایی دەروونی ئینسان تەواوی دنیای دەرەوە دەنوێنینەوە.
هەموو چیرۆکی کتێبیبەدووی کاتی لە دەسچووەوە، تەنیا ئەمەیە، داستانێکی بێ داستان. بە هیچ کولۆجێ چیرۆکێ لە ئارادا نییە. ڕاستی ئەمە کە لایەنی داستانی هەموو کتێبی بەدووی کاتی لەدەسچووەوە ڕەنگە بکرێ لە دوو لاپەڕەدا کورت کرێتەوە. لایەنی داستانی و بە وتەی لایەنگرانی سینەما «ئەکشێن»ی ئەو کەمە. بەرزونەوی و یان ناوەرۆک و گەلاڵەی ئەم کتێبە، ڕەنگە دەقێکی دوو سێ لاپەڕەیی بێ و ڕەنگە کزولاواز لەچاوبدا. هەتا چەنەها ساڵیش کەسانێک لە کۆمەڵگای ئەدەبیاتدا گاڵتەیان پێ دەکرد و دەیانگوت پێداویستی چییە لەمەڕ خووساندنی لەتە نانێکی شیرینەوە، لە ناو فینجانێک چایی یان قاوە و وەبیرهێنانەوەی شت گەلێک کە لە خووساندنی ئەو شیرینییە لەو چاییەدا وەبیری پیاو بێتەوە و نزیک بە پەنجا لاپەڕە قسەی لێ بکەی.
بەڵام داستان و گێچەڵ لە کتێبەکەدا هەیە، لە هەق لانەدەین تیاشیایەتی (چونکە ئێمە خەریکین لە ناوەوە دەیبینین) و ڕەنگە یەکێ لە ویستکاریەکانی (ئیدعا) پرووست کە زۆریش بە جوانی سەلماندوویەتی، ئەمەیە کە لەم کتێبەدا، زۆر گێچەڵ، کەفوکوڵ و داستان هەیە و ئەگەر بیویستایە بەو ڕوانگەیەوە بنووسێ ڕەنگە بە قەرایی کورتکراوەی «شەڕوئاشتی»یش درێژتر دەبوو، بەڵام ناوەوە و دەرەوەی بابەتەکە لە بارەی شت گەلێکەوەیە کە هاوسەنگی و جێگری داستانی نییە.
بەڵام لە لایەنی کۆمەڵایەتیشەوە خاڵێک هەیە کە دەڵێن: «ئەسەڵەن ئەم کتێبە سەر بەکام کۆمەڵگایە؟ کۆمەڵگایەکی داخراو و چکۆلە کە بە



کردەوە پەیوەندی بە جیهانی دەرەوە نییە. ئێستا بەم شێوەیە کەسانێک ئەم ئیرادە لە پڕووست دەرگرن؛ ئیرادێک لە کۆنەوە زۆرکەس لە شاعیرانی ئێرانیان دەگرت کە بۆچی کارەساتی هێرشی موغول بۆ ئێران لە دیوانێکی گەورەی وەک دیوانی حافیزدا نەهاتووە. رەنگە بتوانرێ هەر ئەو جوابەی کەوا حافیزناسەکان بەم پرسیارەی دەدەنــەوە، لەمەڕ کتێبەکەی پڕووستیشەوە بدرێتەوە کە باسی ناو کتێبی «بەدوو کاتی لەدەسچووەوە» بەهیچ جۆرێ باسێکی دەرەکی نییە؛ باسی هاتووچوو، لەشکرکێشی و شکان و سووتاندنەکان نییە، بەڵکوو باسی دەروونە. بڕیارە بچینە ناو دەروونی ئینسانەوە و لە ناوەوە رەهەندێک دروست بکەین و ئەمجار لە ناوەوە تەماشای دەرەوە بکەین. هەڵبەتە لێرەدا رەهەند بەو مانا دەروون شیکاریە نییە، رەنگە باسەکە بە خەسارناسی نزیک بێتەوە و بە باسکردن لە بارەی شێواویەکانی (پەرێشانییەکان)ناوەوە و بەتایبەت ئەو بیرۆێنەیەی (تحسور) کە لە کەسایەتی پڕووستمان هەیە وەکو پیاوێکی هەمیشە نەخۆش. یانی ئەم بیروێنە چەوتە کە ئەو «دیتن لە ناوەوە»یە و لە روانگەی دەروونــەوە تەماشاکردن، لایەنێکی خەسارناسانەی ببێ؛ بە هیچ کولۆجێمەنزورێکی وام نییە، بەڵکوو تەنیا گۆڕانی خاڵی دیتن و لەوەش سەرتر گۆڕانی شوێنی دیتنە. داستانی کتێبی «بــەدوو کاتی لەدەسچووەوە» ئەئمەیە، داستانی یەک «من» بەو مانای دەروونناسی و فەلسەفیەوەیە. داستانی پیاوێکی زۆر کورت کراوە کە لە دنیایەکی تەنگەبەر وکورت کــراوەدا دەژی. دنیای هاتووچووگەلێک کە



ڕه‌نگه له چه‌ند شه‌قام و دووشار و چه‌نددانه شوێن زیاتر نه‌بێ. په‌یوه‌ندگه‌لێک که ڕه‌نگه له چه‌ند ئیشق و مه‌رگ و نامورادی زیاتر واوه‌تر نه‌چێ. لایه‌نی ده‌ره‌کی دنیای ئه‌م کتێبه ته‌نیا هه‌تا ئه‌م که‌وشه‌نه‌یه. به‌ڵام لایه‌نی ناوه‌وه‌ی ئه‌و زۆر گرینگه.

له جیهان و هه‌روه‌ها له ئێرانیشدا له‌م دووسه‌دساڵه‌ی رابـردوودا، ئه‌م ئیراده زۆر ده‌گرن که ئایا مرۆ یان «من» دروسته تا ئه‌و راده‌یه بکرێته ناوه‌ند؟ ئایا زێـده‌کـاری له ئاکار و قوتابخانه‌یه‌کی فه‌لسه‌فی و ئه‌ده‌بیدا هه‌تا ئه‌و که‌وشه‌نه دروسته؟ زۆرکه‌س له بابه‌ت ئه‌م کێشه‌وه باس ده‌کـه‌ن. له خوددی رۆژئـاواشـدا ئـه‌م پرسیاره له لایه‌نێکی دیکه‌وه، هه‌ڵبه‌ته به روانگه‌گه‌لێکی دیکه‌وه و هه‌ڵبه‌ته به ئاکامگه‌لێکی دیکه‌وه له ئارادایه. ئه‌م هه‌موو ئینسان به ناوه‌ندکردنه، ئه‌و هه‌موو گه‌وره‌کردنه‌وه‌ی «من»ه، منی ده‌روونناس، منی فه‌لسه‌فی، منی سیاسی، و ته‌نانه‌ت منی کۆمه‌ڵایه‌تی ئایا زێده‌کاری نییه؟

له‌وێش ئه‌م باسه هه‌میشه هه‌بووه، ئه‌م کێشه‌یه جۆرێک راگره (ترمز) و خاوکه‌رێکه، بۆ ئه‌و ڕه‌وته‌ی که له زه‌مانی رێنسانسه‌وه ده‌ستی پێکردبوو. ئه‌م کێشه‌یه له‌م به‌شه‌ی دنیا و له روانگه‌یه‌کی تره‌وه و به تـه‌واوی به‌ئاکامگه‌یشتنێکی جیـاوازه‌وه، به هانده‌رگه‌لێکی جیاوازه‌وه له وڵاتی ئێمه‌ش باسی لێده‌کرێ؛ که ئایا تا ئه‌م راده‌یه دروسته ئینسان بکرێته ناوه‌ند؟

کتێبی «به‌دوو کاتی له‌ده‌س چووه‌وه» داستانی یه‌ک ره‌وشت، یه‌ک سه‌فه‌ر و دۆزینه‌وه‌ی ده‌روونییه. ناسینی راستێتی ده‌ره‌کی و هه‌ڵبه‌ته نواندنی ئه‌و راستێته له رێگای ئه‌م به‌شه‌وه؛ ئه‌م ده‌سکه‌وته زۆر بچووکه، له‌گه‌ڵ ئـه‌وه‌ی زۆر بچووکه، له لایه‌نێکی دیکه‌وه ناوه‌ندی جیهان یان لانیکه‌م ناوه‌ندی ئه‌ده‌بیاتێکه که خودی ئینسان خه‌ریکه ده‌یخولقێنێ.

ئیزن بده‌ن من وه‌کو که‌سێک که ده‌مه‌وێ له رێگای ئه‌ده‌بیاته‌وه خۆم بنوێنم، خۆم له سه‌ر بناغه‌ی ئه‌م ده‌سکه‌وته تاکه، یانی «منی» ده‌روونناس و وه‌کو نووسه‌رێک، که‌سایه‌تی و پرسۆناژی سه‌ره‌کی و که‌سایه‌تی تاک، راستێتی نیشان بده‌م. یانی ئیزن بده‌ن که هه‌موو ئه‌و رمبازێنانه، ره‌وه‌ی ناوده‌شته‌کان، له‌شکرکێشیه‌کان، ناوه‌رۆک و حه‌ماسه‌کانی نواندنی راستێتی له رێگای ده‌ره‌کی یان له ده‌ره‌وه بخه‌مه لاوه. هه‌موو ئه‌م کۆمه‌ڵانه -به‌ڕاستی- له هێندێ لایه‌ن، له ناوه‌وه، له سه‌ر بناغه‌ی منیخۆم ده‌رببڕم، چونکه به جۆرێکی باش نوێندراوه، ناچار ده‌بێ ئه‌و بخوێندرێته‌وه و ئێستا بۆته ئـه‌وه و ئه‌مه‌ی لێده‌رهاتووه. بۆچی؟ به هۆی ئـه‌وه‌ی که باسی ده‌روونێکی تاکه.

ساڵانێک له نووسین کتێبی «به‌دوو کاتی له‌ده‌س چووه‌وه» تێده‌په‌ڕێ. بزووتنه‌وه‌گه‌لێکی زۆرهاتن و رۆیشتن، له بیرچوونه‌وه و کۆن بوون. ناوه‌رۆکی رواڵه‌تی کتێبی «به‌دوو کاتی له‌ده‌س چووه‌وه» له باره‌ی کۆمه‌ڵگایه‌کی زۆر داخراو و پاوانکراوه‌وه، یانی ئورووپای کۆتاییه‌کانی سه‌ده‌ی نۆزده و ته‌نانه‌ت به مانایه‌ک، پاریسی کۆتاییه‌کانی سه‌ده‌ی نۆزده‌یه که به‌ستراوه به دووسه‌د یان ره‌نگه، سێسه‌د که‌س زیاتر نییه؛ به‌ڵام ئه‌م که‌سه‌که‌مانه و که‌ره‌سه‌داستانیانه، که ڕه‌نگه له دوو یان سێ لاپه‌ڕه‌دا جێی ببێته‌وه، بۆته به‌هانه و ئامرازی نواندنی قوڵاییه‌ک و کاکڵێکی له ناونه‌چوو و بێ کۆتایی. مرۆ، من، جیهان، جیهانی راستێتی، به‌رچاوه‌کان و هه‌موو ئه‌وشتانه‌ی که ده‌وران ده‌وری ئینسانیان ته‌نیوه؛ هه‌ڵبه‌ت ده‌وران ده‌وری ئه‌و کاکڵه چکۆله لاواز و له‌تێپه‌ڕبوونه‌شدا هه‌ر ته‌ندراوه. که‌وایه چون باسی ناوکێکی ده‌روونییه وا له ته‌واوی

لایەنەکانی کۆمەڵایەتی، ناوچەیی، تایبەتی، قەومی، زمانی، سیاسی و تەنانەت زەمانی (کاتی) بە مانای گشتگیریەکەیەوە، یانی بە مانای ئەوەی سەدان ساڵ داماڵدراوە و ئێستا بۆتە ئەو شتە کە کاکڵ و جەوهەری مرۆڤ، کە دیسان لە سەدان هەزارساڵ لەوە پێشەوە دەیانپشکنی -هەڵبەت بە شێوەگەلی تر- هەروەها ئەم کێشکردنە (راکێشانە) جێگای ئەوەی هەیە کە داستانێکی چوار هەزار لاپەڕەیی بگرێتەوە.

چونکە ئەو کتێبە لە بارەی «من»ێکەوەیە کە داستانەکەی تەواو نەبووە، «من»ێک [مرۆڤێک] کە هەم خۆی قسەی زۆری بۆ گوتن پێیە، هەمیش بابەتی بۆ باسکردن زۆر لەسەرە. هێندێ لە هەوێنە سەرەکیەکانی پرووست رەنگە هەوێنی سەرەکی «من» بێ؛ یانی «من»ەکانی وا بە بەردەوام دووی یەکدا دێن.

بۆچی ئـەم شتە بـە رواڵــەت کـەمـە لـە بـارەی کۆمەڵگایەکی بەستراو و داخراوەوە هەتا ئەم سنوورە درێژبۆتەوە و لەم هەموو لاپەڕەیەدا جێگای گرتووە و بۆچی رەنگە نزیک بە سەدساڵ لەوە پێشترەوە هەتا ئێستا وەکو یەکێ لە بناغە و ئەستوونەکانی ئەدەبیاتی رۆژئاوا و رەنگە بە لێکدانەوەیەکی تر هەموو جیهان و بە یەکێ لە کۆڵەکە گەورەکانی ئەم ئەدەبیاتە ناسراوە؟ هەربەم هۆیەش کە ناکرێ بڵێی کە ئەم داهێنانە، خولقاندن و تازەگەرییە، بەڵام رەنگە پرووست یەکێ لە باشترین نوێنەرەکانی ئەو بێ.

چەند بابەتی سەرەکی لەو کتێبەدا هەیە؛ هەر ئەوجۆرەی کە چیرۆکە نەریتەکان، وەرز و کاتی جۆراوجـۆریـان هەبوو کە خـاوەنـی مـەیـدان، یان کەسایەتی گەلی جۆراوجۆر بوون، گەورە دەبوون و جێگای خۆیان دەدا بە کەسانی تر، لە کتێبی «بەدوو کاتی لەدەس چووەوە» من ئەوجۆرە (بە وتەی کانگا ناسەکانیش) ئاوای لێدەردەکێشم کە چەند بابەت و نـاوەرۆک هەن. یەکێ لە سەرەکیترین تەوەرەکانی کتێبەکە، کە لە چەند جێگادا خوێندوومەتەوە لە ژێر سەردێڕی «دۆزانـدنـەوەی پرووست» (کشف) نـاودێـریـان کـردووە، بوونی «مـن» گەلێکی بێ ئەژمارە. داستانەکە بە گشتی لە بارەی وەسف و




تاریفی «من»ێکەوەیە؛ بـەڵام مەنزوور لەو «من»ە چییە؟ یەک «منی» نموونەیە. بەڵام ئەم «منە« نموونە هەمیشەییە، ئەم «منە« مرۆڤەی هەموو جیهان، لە داستانی پرووستدا، لەو شتەی کە ئەو وەکو راستێتی باسی دەکا، منێکی زیندووە.

یانی مرۆیەک یان مرۆگەلێک هەن کە ئاوەها دەژین. پڕووست لە بارەی ئەمانەوە دەڵێ چی؟ دۆزینەوە یان داهێنانی پڕووست چییە؟ ئەوەیە کە یەک تاک بریتیە لە منگەلێکی بێئەژمارە؛ هەر بەو هۆیەشەوەیە ناسەقامگیر بـوون و سـۆز و هەستەکانی ئەو؛ ناسەقامگیری ئەوینەکانی ئەو- کە ئەمەش یەکێ لە بابەتە سەرەکییەکانی کتێبەکەیە، کە ئەوینەکان و سۆزەکان ناسەقامگیرن، بۆچی؟ نەک لە بەر ئەوەی کە سۆزەکان بە هۆی جۆرێک کاروکاردانەوی شیمیایی یان بە هۆی جۆرێک سوانەوەی (فرسایش) فیزیکی، کەمە کەمە لە ناو دەچێ. نە بەهۆی ئەوەی کە تۆ پیر بووی یان گراوەکەت ناحەز بووە، بەڵکوو باس لە تەواوبوونی «منە« جۆراوجۆرەکاندایە. باسەکە ئەسەڵەن کۆمەڵایەتی نییە، بەڵام بەوجۆرە رەنگدانەوەی لە تـەواوی کتێبەکەدا هەیە، بەهۆی تێپەڕبوونی زەمـان و بەهۆی ئاڵوگۆڕی مرۆڤ، بەهۆی ئەو شتەی کە پڕووست نـاوی دەنـێ «شیمی سـۆزەکـان». رۆژبـەرۆژ هێندێ مرۆی تازە لە دەروونـی تۆدا دروست دەبن. تۆیەک کە دەگەڕێیەوە بۆ یادی رابردوو، دەبینی کە لەو گـوزەراوە، ئەو هەستەت نییە لە بیرتدا، دەبوو وەبیری بێنیەوە. بەم هۆیە زۆر ساکارە کە تۆ ئەو مرۆیەی رابردوونیت؛ تۆ کەسێکی تری، رەنگە ئێستاش ناوتان مارسێل پڕووست یان مەهدی سەحابی یان... هەر ناوێکی تر بێ؛ بەڵام تۆ گۆڕاوی، بەهۆی ئەوەی کە تۆ بە زەماندا تێپەڕیوی. بەهۆی ئەوەی کە ئەو شیمیە، لە دەروونی تۆدا کاروکاردانەوەیەک و خڵتە و بنگرەکانی (رسوب) خۆی هەبووە. یانی تۆ بەرهەمی کاروکاردانەوەی ساڵانێک-نەک هەر کاروکاردانەوەی ساڵەکانی دەرەوەت - چونکە باسەکە، باسی لە ناوەوە بینینی راستێتییە. باسی ئەو ساڵانەیە کە بە سەر کۆمەڵگادا تێپەڕیوە، شەڕێک کە تەواو بووە، گەنجێ کە گەیشتووە بە پیری و جوانیەک کە لەناوچووە.

ئەوشتەی کە لە دەروونـی تـۆدا تاقەتی زەمانی هێناوە، ئەوشتەی وا زەمـان لە دەروونـی تۆدا بە سەر ئـەودا کاریگەری هەبووە، ئەمە یەکێ لە هەوێنە سەرەکییەکانی کتێبی «بـەدووی کاتی لەدەس چووەوە» یانی ئەوەی کە تۆ ئەمڕۆ، منێک، مرۆیەکی، سبەینێ کەسێکی تر و دووسبەی کەسێکی تر. زۆرجار ئەو مرۆیەی پێشوو بیردەکاتەوە کە ئەو



بناسێ، لە کاتێکدا بۆی ناناسرێ. هەر بەوهۆیەوە بیردەکاتەوە ئاشقی ئەو گراوەی دەساڵ لەوەپێشە، لە کاتێکدا وانییە. داستان، داستانی دوو مرۆی دیکەیە. داستانی مرۆیەکی دەساڵ لەوەپێشە کە مرۆیەک دەساڵ لەوەپێش ئەوی خۆشویستووە؛ هەڵبەتە زۆریش سەرنجی زەمان مەدەن، لەبەرئەوەی رەنگە هی دوێنێ بێ؛ دەتوانێ هەر هی ئەمرۆ بەیانی بێ؛ ئەوینێک کە ئەمرۆ نیوەڕۆ کۆتایی پێهاتووە، بە وتەی پرووست، هۆیەکەشی ئەوەیە کە بەیانی ئەوینێک هەبووە و ئەمرۆ دوانیوەڕۆ ئیدی بوونی نییە.

سووانەوەی فیزیکی و بە دووی دا سووانەوەی سۆزداری و.... ئەو «من»ە بێئەژمارانە. ئەم خاڵەی دووهەمیشیان هەیە کە پرووست لە دەربڕینەکانی دا زۆر بە دەرووندا ڕۆچووە. شوێن هاتەکەشی ئەو «من»ە بێئەژمارانە، ناسەقامگیری سۆزەکانی ئەو «من»نانەیە؛ یانی بە شێوەی گشتی ناسەقامگیری هەستەکان و سۆزدارییەک کە مرۆ هەست دەکا هەیەتی. رەنگە یەکێ لە لایەنە زۆر بەژانەکانی کتێبەکە، ئەو غەمە شاراوەیەیە لە ناو وشەی «بەدووی کاتی لەدەس چووەوە«.

وێژیاری (راوی) کتێبی مارسێل پرووست، بە ناهومێدییەوە، بە شتێکی زۆر سەرتر لە غەم و پەژارەوە، بە داغ، بە شینگێڕی بەردەوام دەیەوێ زەمان بە چنگ بگرێ. بە هۆی ئەوەی کە سۆزەکانی نامێنێ، کەوایە هەموو ئەم گەڕانە، هەموو ئەم پەژارەیە، هەموو ئەم داغە گەورەی کتێبەکە ئەوەیە. دەکرێ بڵێین بە جۆرێک گەڕانێکی لە پێشدا مەحکووم کراو بە شکان و لە ناوچوون.

بە «بەدووی کاتی لەدەس چووەوە«، نەک ون بوو، کە کتێبەکە بخوێنیەوە کاکڵ و ناوەئاخنی کتێبەکە دەڵێ کە زەمان ون نابێ، لەبەرئەوەی کە زەمان شتێک نییە کە ون بێ. چونکە ئەسەڵەن بە جۆرێک دەکرێ بڵێین، بوونی نییە هەتا ون بێ. ئەوە مرۆیە بوونی هەیە، کە ئیدی پەیوەندی بە زەمانەوە نییە و لەمەڕ کتێبی لەبەردەست و لە ناو مرۆی حازردا، یانی مارسێل پرووستی نووسەر، بە گشتی باسی کاتی لە دەس چوو، بە مانای بە فیڕۆچووە. باسی مرۆیەکە کە رۆژگاری ئەمرۆ دەخاتە سبەینێ. بە بەتاڵی، بە تێپەڕاندنی ئەو ژیانە لە جیهانی زۆر تەنگەبەر و وێکهاتووی کۆڕوکۆبوونەوەکانی کۆتایی سەدەی نوزدە، باسی کاتی لە دەسچووە.

پرووست زەمانێ بیری کردبۆوە، ناوی کتێبەکەی بنێ «نۆرەکردنەکانی دڵ». ئەم تابلۆ غەماوییە، ئەم باروودۆخە مسۆگەرە، ئەم چارەنووسە نەگەڕاوە و بەڕاستی چارەنەکراوە، بۆچی ئەوەندە ناهومێدانەیە؟ ئەوەسا چارەی چ بێ؟ یانی ئایا تەنیا بە بۆنەی وەبیرهێنانەوەی بیرەوەری، ئەوجۆرەی پرووست لە شوێنێکدا دەڵێ کە بە وەبیرهێنانەوەی زەمان بتوانم مرۆکان، شوێنەکان و باروودۆخەکانی رابردوو لە گێژەنی لەبیرکران رزگار بکەم؛ ئایا تەنیا ئەوەی بەسە؟ یانی بە تەنیا وەبیرهێنانەوەی رابردوو تەواوە؟ چونکە لەم حاڵەتەی کە ئێمە گیای مەرگین، وای دانێین کە سەردەمانێک وەبیربهێنینەوە، سەردەمانێک و چەند ساتێک، بەڵام ئاخری دەمرین. ئەی کەوایە ئەوەی دیکەی چی؟

باسی وەبیرهێنانەوە و بیرەوەری و بیردانە (حاف×ە)، باسێکی بەربڵاوە کە باسی رەوتی (مکانیزم) وەبیرهێنانەوەی نەخوازراو یان نەویستراوی دوو سێ داستانی بەناوبانگ لە کتێبەکەی پرووستدامەیە؛ یەکیان داستانی فنجانی چاییەکە بە تامی شیرنی تەرکراو لە ناو چاییەکەدا، بۆ ئەو گەنجە، یان ئەو نوێ جوانە، بە لێکدانەوەیەکی تر هەموو ئەو

داستانە چوارهەزار لاپەڕەییە، وەبیردێتەوە و یەک دوو ڕووداوی لەوجۆرە کە دەکرێ بڵێین باسی ڕەوتی وەبیرهێنانەوەیە. هێندێک باسی فەننی و هێندێکیش باسی دەروونناسیە.

ئەم پەڕژارەیە، قەبووڵی ئەم بارودۆخە مسۆگەر و بەژانەیە کە بەڕاستی هیچ شتێکی لەگەڵ ناکرێ؛ لە بواری فیزیکییەوە نەک مەرگێک، بەڵکوو چەندین مەرگە و نە تەنیا مەرگی من و چەندین مەرگی منەکانیتری منە، بەڵکوو مەرگی هەموو کەسانێکە کە لەناو مندا و لەگەڵ من دەژیان. هەڵبەتە باسی متافیزیک نییە، باس لە ڕوانین و ڕوانگەی پرووستە، لەگەڵ ئەوەی بە مانای شتێک بێ کە ئەمڕۆ دەیناسین و ماتریالیسمیش نییە. بە مانایەکی ئەمڕۆییانە کە ئێمە دەتوانین بەو وشەیەی بدەین بێ خوداییش نییە، بەڵام ئاوا وەکو نووسەرێکی لادینە؛ دەتوانێ باسەکە لێرەدا کۆتایی پێ بێ. چونکە بە مەرگی من و منەکانی من، هەموو شتێک تەواو دەبێ. ئالێرەدایە کە هەموو داستان، بە ڕێ کارێکی (شگرد) زۆر جوان کە ئێستاش ڕەنگە بۆ بەعزێک جێگای سەرسووڕمان بێ؛ ڕێ کارێک کە خودی کتێبەکە بەڕاستی نوێنەریەتی، دەڵێ من چ بکەم کە لە لاپەڕەی کۆتایی کتێبەکەدا دەبینین ئەم کارەی کردووە؟ یانی جۆرێک سەرسووڕێنی و هەژەندیی تێدایە. یانی هەرئەم کتێبە و باسی ئەوەی کە دەبێ چ بکەین کە زەمان تێنەپەڕێ، یانی ئەوەی کە زەمان نەگوزەرا. بەتایبەت ئەوەیکە هاتەسەرکاغەز و بوو بە نووسراوە؛ بەتایبەت ئەوەی کە بووە هەمیشەیی و ئەوە یانی ئەو مزگێنییە، ئەو قەرەبووکرنەوە، ئەو توخمەی کە لە هەر ڕوانگەیەکەوە، چ عیرفانی، چ دینی و چ فەلسەفی و ... ئەو بمێنی و هەرمانەی کە ڕاستێنەکەی (م×داق) ئەو چوارهەزار لاپەڕەیە. پرووست ئەوە دەڵێ، شتێک کە ئەم گەڕانەی بە ئاکام گەیاندووە ئەوەیە. ئەمە باسێکی کۆنی فەلسەفیە؛ بەتایبەت لە عیرفانی ئێرانیدا ڕەنگدانەوەی زۆرە. باسی خوددی نەفسگەڕان و ڕەوشتە، ڕەنگە لە هەمووی بەناوبانگتر داستانی سیمورغە لە «مەنتق ولتەریر»ی عەتتاردا. ڕەنگە ماکە و بنەڕەت خوددی گەڕان بێ. ڕەنگە باس، باسی ڕەوشت بێ؛ نەئەوەی کە بگەی بە شتێک، بە تایبەت ئەگەر باسی زەمان بێ کە ئیدی پێگەیشتنێک لە گۆڕێدا نییە. خۆشمان دەزانین کە نییە؛ کەوایە باسی ڕەوشت دەمێنێتەوە، باسی ڕۆیشتن دەمێنێتەوە، باسی گەڕان دەمێنێتەوە بەبێ گەیشتن.

یەکێ لە هەوێنەکانی پرووست ئەسڵەن ئەمە بوو کە چونکە زەین هەیە و هەمووشت دروست دەکا، ئەم ئیشقەش ئەسڵەن دروستکراوی خودی تۆیە؛ کەم تا زۆریش سەربەخۆ لە گراو.

خاڵێکیش کە ئێستا کەم و زۆر جێکەوتووە و قوتابخانەی ڕێژەیی بۆچوون و هەڵکڕاندن لە ئامرازی دەربڕینە، ئەوەیە کە وێژەر، ئەوەیکە پیاوێکی چۆن بووە، زۆر گرینگ نییە و بایەخێکی وای نییە؛ بەڵام لە زەمانی پرووستدا ئەم مەسەلەیە هێندە ئاوا ڕۆشن و ئاشکرا نەبوو. پرووست ڕەنگە لە هەوەڵین کەسانێک بوو کە مودێڕن و تەواو و سەرڕەوانە، باوەڕی وابوو کە ناسینی وێژەر بە کردەوە پێویست ناکا. تەنانەت ڕەنگە بکرێ بڵێین کە ئەگەر ئەو نەناسین، باشتریش بێ. ئەوەی کە بە بڕوای من لە بارەی گەڕاندا ڕاستە -ئەمەیە کە پێویستی نییە لە بارەی پرووستەوە شتێک ڕوون بکەمەوە؛ لەبەر ئەوەیکە جۆرێک دژایەتی بناغەیی لە نێوان کەسێ کە شتێک دەڵێت و ئەوشتەی کە گوتارەکە هەیە. شتێک وەکو کردەوکاردانەوەیەکی شیمیایی، کە بەڕاستی هیچ پەیوەندییەکیان بە توخمەکانی هەوەڵی پێش تێکڵاوبوونەوە نییە.

پرووست بـاوەڕی وایە و بە باشیش نیشانی دەدا کە ناسینی «من»، منی نووسەر، منی شاعیر، منی شێوەکار، نە تەنیا پێویست نییە، بەڵکوو لە زۆربەی جێگاکاندا ئەگەر ئەو نەناسین تەنانەت باشتریشە. ئەمە لە بارەی خودی پرووستیشەوە هەربەڕاستی بە جوانترین جۆر خۆی نیشان داوە. لە کتێبەکەدا نموونەیەکی زۆر جوانی تێدایە، یەکێ لە کەسایەتی‌یە سەرەکی‌یەکانی کتێبەکە، شێوەکارێکە بە ناوی ئەلستیر، کە تێکڵاوێکە لە چەند نقاشی نـاوداری ئەوکات، تێکڵاوییەک لە چەند ئیمپرسیۆنیستی وەک مۆنە و مانە و ڕێنوار و ...

لە بەشێکە کتێبەکە، وتووێژێکی تێدایە کە وێژیار بە ئەلستیر دەڵێ لە بیرمە ساڵان پیاوێک بە ناوی ئەلستیر لە کۆڕەکانی ماڵی خانمی وێردوێرن بەشداری دەکرد، پیاوێکی بەرەڵڵای هیچ و پووچی جلفی گاڵتەچی و ..... ە وانییە ئەتۆ ئەوبی. ئەلستیر دەڵێ هـ خۆمم. دەبوو ئەو بوایەم، هەتا «ئەوە ئێستا هەم، مانا پەیدا بکا. من دەبـ دەوری بەتاڵی و هیچ و پووچیەم تێپ هەتا ئێستا دەرکەوێ کە چ شۆڕشێکم نیشان بدرێ من چۆن ژیانم لەوپەڕی کام تێپەڕاندووە هەتا بێرەگەیشتووم.

باسیش ئەوەیە کە بۆچی بزانین؟ یانی ، پێویستی نیە و ڕەنگە ئەسڵەن بەرهە هەرئەوە. یانی ناسینی بەرهەم بەوجۆ «سێنت بوو» دەیگوت [هەرچەند] ئێس بووە، ڕەنگە بە جۆرێک شتێک لە بەر بکا، بڕیاروایە بەرهەمەکە پەردەی ئەو ر بێ. بڕیارە بەرهەم نەتەنیا بە ئاگا رابردووە، نەتەنیا دەسکەوتی ئەو رابرد

قەرەبووکەرەوەی ئەو رابـردووە بێ؛ هەروەک گوتم هەموو ئەو چوارهەزار لاپەڕەیە قەرەبووکەرەوەی بەتاڵەت و ژیـانـی کـۆڕوکـۆبـوونـەوە بـورژوایـی و ئەشرافیەکانی پیاوێکە بە ناوی مارسێل پرووست.

باس ئەوەیەکە بەڕاستی مانا، جەوهەر و چەمکی بەرهەمی هونەری یانی ئەمە؛ یانی بەرهەمی هونەری، پاکانە و شیکەرەوەی رابـردوو نییە. بەڵکوو داپـۆشـەر و جـۆرێـک بانگهێشتنە بۆ لەبیرکردنی رابردوو.



که تۆ نەتەنیا رابردوو بە رووی پیاودا نەدەیەوە، بەڵکوو قەبووڵی بکەی کە ئەم بەرهەمە قەرەبووی رابردووە. لەمەش زیاتر، بەرهەم ئەگەرچی دەسکەوت و بەرهەمی رابردووە، دوایەش فێڵێکی داپۆشەرانەی رابردووشە.

باسێک کە پرووست دەیکا و هەڵبەتە لە هەموو جێیەک ئەم جۆرە باسە لە ئارادا بووە و ئەسڵەن هەموو مێژووی خولقاندی بەشەر بە جۆرێک خەبات و بەربەرەکانێ لەگەڵ مەرگ و یان لانیکەم تێکۆشانە دژی فەرامۆشی هونەرمەند. شتێک کە لە بارەی کتێبیبەدووی کاتی لەدەسچووەوە رەنگە تازەیی تێدابێ، یان رەنگە شیرن بێ، ئەوەیە کە ئەویش هەر ئەوە دەڵێ و هەڵبەتە بە جوانترین دەربڕین.

لە بەرگی کۆتایی کتێبەکەدا، دوو لاپەڕە هەیە کە وەسفی بەهارە لە شاری ونیز، ئەوجۆرەوا نووسەر بە ئێمە دەڵــێ، ونیز شارێکە کە نە لەوێ مستێ خۆڵی لێیە، نە دارێک و نە بستێ زەوی. چونکە تەواوەتی‌یەکەی ئاو و بەردە. هەروەها ئەم بەشە بە تەواوی وەسفی بەهار لە شارێکدایە کە ئەسڵەن هیچ جۆرە شتێکی باوی بەهاری تێدانییە.

بە بــڕوای من ئەمە سەرسوورهێنەرە؛ وەسفی بەهارێکی ون لە شارێکی بێ بەهاردا. پرووست خەریکە دەڵێ کە ئەوەی هیچی لێنایە سازکراوی دەستی بەشەرە؛ وەئــەوەی کە چۆن لە زەمان و لە ژێر گەنکاوی فەرامۆشی‌دا، لە دەستی مەرگ و لە قــورووی مەرگ دەری‌دەکێشێ. سەرنجراکێشی تایبەتی کتێبەکە رەنگە ئەوە بێ کە تازە لە ئاخری کتێبەوە بە جۆرێک لە ناو گێژەنی‌پۆلیسی‌دا بە ئێمە دەگوترێ، ئەمە بوو ئەوکارەی کە تازە من دەمویست بیکەم.

*سەرچاوە:
ماهنامە نقد هنری فرهنگی بیدار/ شمارە [ ٢ ] شهریورومهر ١٣٧٩

مەهدی سەحابی نووسەر، شێوەکار و وەرگێڕی گەورەی ئەدەبیاتی فارسییە کە یەکێ لە کارەمەزنەکانی وەرگێڕانی «بەدووی کاتی لەدەس چووی» مارسێل پرووستە و دەیان رۆمانی لە زمانی فەڕەنسییەوە کردووە بە فارسی بۆ وێنە مادام بواری، راهێناسی هەستەکانی فلۆوبێر و مەرگی قیستی، قەسر بە قەسر، دەستەی گەمەچییەکانی، لۆیی فەردینان سیلین. «سوور و شەڕی» ئیستاندال و ....

ئەم هونەرمەندە خۆشەویستە لە ١٨/رەزبەری/١٣٨٨ هەتاوی لە فەڕانسە بۆ هۆی سەکتەی دڵەوە کۆچی دوایی کرد.

ئەم وەرگێڕانە مژولیایشێکە (سخنرانی) لە کۆمەڵەیەک مژولیایش کە لە ژێر سەردێڕی «رۆژی ئەدەبیاتی فەڕانسە«لە پێشانگای کتێبی نێونەتەویی تاران لە ساڵی ١٣٧٩ کــراوەوە و دوایــەش هەر بەوشێوەی دەربڕینی زارەکی‌یە خراوەتە سەر کاغەز و لە گۆڤاری بیداری شمار (٢) خەرمانە و رەزبەری ساڵی ١٣٧٩ دا بڵاوبۆتەوە. ناوەکەشی ئاوا بوو «لە بارەی مارسێل پرووست و میراتی پــرووســت» و «راستێتی لە دەروونەوە و بە ئامرازی دەروونەوە« کە من پێموابوو ئاواش خراپ نابێ.

# ئێتیك، فەلسەفەی پراکتیکی و گۆڕینی جیهان:

## دیالۆگی نێوان هایدێگەر و مارکوزە

نووسینی: ئاننا پیە رووپۆ
لە ئینگلیزییەوە: کامەران خالید

## پوختە

ئەم گۆتارە خستنەڕووی کاریگەرییەکی جووتسەرییە لە نێوان هایدێگەر و مارکوزەدا لەبارەی ئیدێی فەلسەفەی پراکتیکی. ئەم نووسینە سەرەتا هەڵدەستێت بە نرخاندنی شیمانەی راڤەیەکی ئێتیکیی «بوون و کات» و بەدوویدا وەرگرتنی (پەرەپێدانی) لە لایەن مارکوزەوە. پاشان دیاریکردنی توخمە بناغەییەکانی راڤەی هایدێگەر بۆ مارکس، وەڵامی (هایدێگەر) بۆ مارکسیزمی هێگڵی و تێگەییشتنی بۆ تێگەی پراکسیس.

واژە کلیلیەکان: ئێتیک، پراکسیس، فینۆمێنۆلۆگی، هایدێگەر، مارکوزە.



هایدێگەر



مارکوزە

## پێشگۆتن

ئەوە ساغبووەتەوە کە هایدێگەر بە تەواوی دژی دابەشکردنی هزرین بوو بۆ دیسیپلینەکان و لەوێشەوە بۆ فۆرمولەکردنی ئاشکرای ئێتیکێک. سەرباری ئەمە دانوستان لەبارەی کاریگەرییە ئێتیکییەکانی فەلسەفەی هایدێگەر لە یەکەم چاپی «بوون و کات» (١٩٢٧) ەوە سەرەتا دەگرێت. هایدێگەر خۆی گوزارشت دەکات و دەبێژێ کە راستەوخۆ پاش چاپکردن (ی بوون و کات) کاتێک کە خەریکی نووسینی ئێتیکێک بووە، «دۆستێکی گەنج» هاتووە و پرسیاری لێکردووە، پرسیارێک کە بە روونی لە «نامەیەک لەبارەی هومانیزم» دا رووبەڕووبوونەوەی کردووەتەوە. لەم کۆنتێکستەدا پرسیارە گشتییەکە لە دوو رووەوە روونکراوەتەوە: لە لایەکەوە رووبەڕووی پەیوەندی ئێتیک و ئۆنتۆلۆگی، لە لایەکەی دی شرۆڤەی ئەدگاری تێگەیشتن لە واتای ئێتیکێکدا دەکات. پاشان راستەوخۆ رووبەڕووی پەیوەندی نێوان ئۆنتۆلۆگی و ئێتیک پابەند بە شرۆڤەی ئەکزیستێنسیال (شرۆڤەی لێرەبوونی مرۆڤ)، هەروەها کۆشش دەکەم رۆشنایی بدەم بە ئەدگاری تێگەیشتن وەک بالاترین فۆرمی پراکسیس (praxis/کرداری).

ئامانجی سەرەکی ئەم نووسینە، نرخاندنی کاریگەرییە ئێتیکییەکانی هزرینی هایدێگەرە

لەتەک وەرگرتنی بوون وکات لە لایەن مارکوزەوە. مارکوزە لە سەرەتاکانی هزرینیدا، لە شرۆڤە ئەکزیستێنسیالەکەی هایدێگەردا پشتگیری بۆ فەلسەفەی شۆڕشی رەخنەییەکەی دۆزییەوە و لە میانەی هەوڵدانیدا بۆ پێکهێنانی (سەنتێزی) مارکسیزمی هێگڵی و ئۆنتۆلۆگیی ئەکزیستێنسیال، کۆنسێپتی لێکدراوی مارکسیسزمی ئەکزیستێنسیال کەوتەوە. ئەم خستنەڕووە بە تایبەتی نموونەی بەسودی ئەوەیە، کە چۆن تاکە فەیلەسوفان تێگە کلیلیەکانی ئیشەکانیان لە وەڵامی فەلسەفەی هایدێگەردا فۆرمولە کردووە. لە ساڵانی بیستەکاندا کاتێک کە تێگەکانی «ژیانی نارەسەن» و «ژیانی نامۆبوو» وەک پنتێکی دەرچوون (بە گشتی) بە هاوتا دادەنران، مارکوزە دەیروانییە هزری هایدێگەر وەک زەمینەیەک بۆ چێکردنی فەلسەفەیەکی کۆنکرێت. هایدێگەر پاش ئەوەی کە زانی مارکوزە بوون و کات ی وەرگرتووە، هەڵەکەی قۆستەوە بۆ وەڵامی ئەوە کە بۆچی لە راڤەکردنیدا بۆ مارکس بەر جیاوازییەکی راستەوخۆی هزریی دەکەوێت. ئەو لە نامەیەک لەبارەی هومانیزم دا و هەروەها لە سەمینارەکانیدا روویکردە ئەو پرسیارە. بۆ ئەوەی کاریگەرییە جووتسەرییەکە بخەینەڕوو، گەرەکە سەرەتا نرخاندنی شیمانەی راڤەیەکی ئێتیکی «بوون وکات» و بەدوویدا وەرگرتنی لە لایەن مارکوزەوە بکەین. پاشان دیاریکردنی توخمە بناغەییەکانی راڤەی هایدێگەر بۆ مارکس، وەڵامی بۆ مارکسیزمی هێگڵی و تێگەیشتنی بۆ تێگەی پراکسیس.

## ١- ئێتیك و ئۆنتۆلۆگی

سەرچاوەی فەلسەفەی هایدێگەر لە دژبەرییە هزرمەندانەکەیدایە بەرانبەر بە پۆزەتیڤیزم و ئامانجیشی بریتییە لە تێگەیشتن بۆ ژیان لە سەرجەمێتییەکەیدا (Heidegger ١٩٩٢; Heidegger ١٩٩٣). لە پرۆگرامە فەلسەفەییەکەی هایدێگەردا دیاریکردنی ئیدێی فەلسەفە تەریب بە کۆی کاتیگۆرییەکانی ژیان بەگەڕدەخرێت. یەکێک لە گرنگترین روانگەکانی دیاریکردنی ئەو بۆ ژیان، خۆی لە گرتنی/ تێگەیشتنی رەهەندە مێژووییەکەی ژیاندا دەبینێتەوە (Heidegger ٢٠٠٦).

هایدێگەر لە دەرسگوتارەکانی هەرە سەرەتایدا لە راڤەی فێنۆمێنۆلۆگییانەی ئایینەوە رەچاوی ئاراستەی رەهەندی مێژوویی ژیانی کرد (Heidegger ١٩٩٥) و بە رێی شرۆڤەی بۆ پەیمانی نوێ (ی کتێبی پیرۆز) پەرەی بە ئیدێی کاتێتیی کایرۆلۆگیکال (کاتێتیی ناقەدەری/ نازنجیرەیی) دا. هایدێگەر بۆ تێگەیشتن لە ژیان بە چەشنێکی گونجاو لە توێژینەوەی تێگە فەلسەفەییەکاندا گەڕایەوە بۆ ئەریستۆتێلیس و لە پەرەپێدانیدا بە تێگەی بوون وەک ئامادەی سادە (simple presence) و بەرئەنجامی پێشەمێتی فۆرمی ژیانی تیۆریی ئاراستەیدا بە ئۆنتۆلۆگییەک کە پنتی نێوەندیی هزرینی درەنگتری ئەوی دیاریکرد.

بە پێچەوانەی ئەریستۆتێلیسەوە، هایدێگەر مەئریفەی پراکتیکی (فرۆنێزیس) وەک شێوازە مەئریفەیەکی فەلسەفەیی دادەنێت و ئاماژە دەدات بە هزرینی ساغ نەبووەوەی ئەریستۆتێلیس لە جیاوازیکردنیدا بۆ ئۆنتۆلۆگیی پرۆدوکسیۆن و ئۆنتۆلۆگیی ژیان (واتە هایدێگەر بۆ هەر یەکێک لە تێکستەکانی فیزیک و مێتافیزیک سەرچاوەی پەیوەندیدار بە بناغەکانی ئەنیما، رێتۆریک و

ئێتیکی نیکۆماخی، دەبینی).

بە گۆتەی هایدێگەر خۆی، لە شرۆڤەکردنیدا بۆ ئەنیما گەییشتووەتە تێگەییشتنێکی جەوهەریی لێرەبوون (ئەکزیستێنس)، ئەو کاتەی کە لە ئەنیمادا «دۆکترینی زیندەیی بوون» رووەو « ژیان وەک ئۆنتۆلۆگییەکی بوونی کاراکتەریزەکراو» پەرەپێدەدات (Heidegger ٢٠٠٥ a , ١٠١).

پاشان مێتۆدێک دادەمەزرێنێت - کە هەمان ئەو مێتۆدەیە کە درەنگتر لە بوون و کاتدا بۆی دەگەڕێتەوە - و دەگەڕێتەوە بۆ رێتۆریک و وەک راڤەیەکی دازایـن لە «رۆژانەیێتی» (Alltäglichkeit) ەکەیدا لێیدەڕوانێت (Heidegger ٢٠٠٥ a , ١١١). لەم کۆنتێکستەدا هایدێگەر رەچاوی پوخت ئاڕاستەی راڤەی ئەریستۆتێلیانەی پاتۆس (سۆز) دەکـات لـەو جێیەدا کە دەگـات بە بنەمایەکی زەمینەیی بـۆ تێگەیشتنی حاڵی هەستەکی (Befindlichkeit). هەروەها کاتێک کە بەڕێی ئاوێتەکردنی توخمە تێگەییەکانەوە لە ئێتیکی نیکۆماخیدا، تێگەی پاتۆسی لەنێو تێرمەکانی میزاج یان مەیل بۆ ئەکتدا راڤە کرد، ئاسۆیەکی فراوان بۆ کێشەی رەهەندە ئێتیکییەکەی شرۆڤەی ئەکزیستێنسیال، ئاوەڵا بوو.

تـەنـانـەت سـەربـاری ئـەو سـاتـگـەلـە هزرینە ئەریستۆتێلیانە — دۆکترینی پاتۆسی رێتۆریک، شرۆڤەکانی ژیانی زیندەوەر (ئەنیما) و ساتی کایرۆلۆگیکالی کتێبی شەشەمی ئێتیکی نیکۆماخی — کە وەک زەمینە بۆ تێگەیشتنی کاتیگۆریی بناغەیی ژیان داڕێژرابوون، بەڵام بە دیدی هایدێگەر، ئەریستۆتێلیس ناتوانێت ئەم ئینتوئیسیۆنە گرنگانە لە نێو دۆکترینی سەرجەمێتی ژیانی مرۆڤدا یەکبخات. بۆ ئەم یەکخستنە زەحمەتە، هایدێگەر خۆی لە نێو شرۆڤەیەکی ئەکزیستێنسیالدا دادەنێت. ئەو لەم کردنەشدا دەسبەرداری کاتیگۆرییە بناغەییەکەی ئەریستۆتێلیس واتا سەرجەمێتی ژیان لە کۆنتێکستە رەسەنەکەی بوون وەک پرۆدوکسیۆن نابێت، بەڵام هایدێگەر سەرجەمێتی ژیان لە ئاسۆی بووندا وەک «بوون رووەو مەرگ» تێدەگات.

هەروەها بۆ هێنانەپێشەوەی ئۆنتۆلۆگییەکی ژیان وەک دژبەری ئۆنتۆلۆگیی پرۆدوکسیۆن، هایدێگەر لە شیمانەکانی پێگەییشتن یان پێنەگەییشتن بە ئەوە، کە ناوی دەنێت « ئەکزیستێنسی رەسەن»، دەتوێژێتەوە، کە بە رێیەوە ئاسۆی رەسەنێتی بە رەهـەنـدی مێژوویی ئەکزیستێنس دەگـات. ئەمەیە جیاوازیی نێوان رەسەنێتی و ناڕەسەنێتی ئەکزیستێنس، کە بناغەی داڕشتنی زۆربەی هەرە زۆری راڤەکانە بۆ بوون و کات وەک فەلسەفەیەکی پراکتیکی.

مارکوزە بە وەرگرتنی ئەو جیاوازییە وەک بناغەیەک لەتەک نزیکایەتی نێوان تێگەی رەسەنێتیی هایدێگەر و تێگەی نامۆبوونی مارکسدا، شرۆڤەی ئەکزیستێنسیال وەک «کۆششێکی رادیکاڵ بۆ داڕشتنی فەلسەفە لە سەر بناغەیەکی کۆنکرێتی راستەقینە» تێگەیشت (Marcuse ٢٠٠٥ , ١٦٦) کە گونجاو بوو بۆ پشتیوانیی فەلسەفەی شۆڕشی رەخنەییەکەی، کە کۆششکردن بوو بۆ پێکهێنانی (سەنتێزی) مارکسیزمی هێگڵی و ئۆنتۆلۆگیی ئەکزیستێنسیال.

ئەوە زانراوە، کە مارکوزە لە ١٩٢٢ پاش نووسینی تێزی دکتۆراکەی، لە فرایبورگ دەگوازێتەوە بۆ بەرلین و لەوێ وەک ئەنتیکەناس (متخ×× فی الاثریات) ئیش دەکات و هاوکات دەستدەکات بە توێژینەوەی ئیشەکانی کارڵ مارکس. مارکوزە لە ١٩٢٧ دا لە ژێر کاریگەریی سەروبەندی نەشری بوون و کات دا، قەرار دەدات کە بگەڕێتەوە بۆ فرایبورگ

به مەبەستی ئیشکردن لەتەک هایدێگەردا، کە ئەمە بە تایبەتی درەنگتر کاریگەریی ئاشکرای لەسەر مارکوزەی گەنج بەجێهێشت لە خۆ خەریککردنیدا بۆ مێژوویێتی وەک رەهەندی مرۆڤیانە.

کەواتە مارکوزە ئۆنتۆلۆگیی هێگڵ و تیۆریی مێژوویێتی لەتەک کاریگەریی ئاشکرای هایدێگەردا دەنووسێت، ئەمە بە ئاشکرا لە پێشگۆتنەکەی نـــووســـەردا هـــەیـــە: ئۆنتۆلۆگیی هێگڵ و تیۆریی مێژوویێتی، توێژینەوەیەکە لـــەبـــارەی تـــیـــۆریـــی مێژوویێتیی هـــێـــگـــڵ ئـــەنـــجـــام دراوە بە سەرپەرشتی هایدێگەر، بە مەبەستی پێدانی هابیلیتاسیۆن بە مـارکـوزە. بـەڵام جگە لەمە ژمـارەیـەک نووسینی سـەرەتـای مـارکـوزە هەن، کە لەم دواییانەدا کەوتوونەتە بەردەستی گەلی ئەمەریکا (Marcuse ۲۰۰۵) و بەسوودن بۆ هەڵسەنگاندنی ئەو کاریگەرییەی کە هایدێگەر لە سەر فۆرمولەکردنی هەرە سەرەتاکانی هزری مارکوزەدا هەیبووە. بۆ نموونە یەکێک لە ئیشە سەرەتاکانی مارکوزە بە ناونیشانی گۆتارگەلێک لەبارەی فینۆمینۆلۆگیی ماتەریالیزمی مێژوویی (۱۹۲۸)، کە دەشێت لەوبارەیەوە زۆر بە روونی لێی بتوێژرێتەوە.

مارکوزە، مارکسیزم وەک تیۆریی ئەکتی سۆسیال و ئەکتی مێژوویی پیشان دەدات، کە بە هۆیەوە ئەکت لە سەر سەرجەم مێژوویێتی ئەکزیستێنسی مرۆڤ دارێـژراوە. فەلسەفەی هایدێگەر بریتییە لە راڤەیەکی راستەقینەی زانستی پراکتیکی، واتـە زانستی شیمانەکانی بوونی رەسـەن و بە هەقیقیکردنی ئەو بوونە لە نێو ئەکتی رەسەندا. بە دیدی مارکوزە، ئەکتی رادیکال بریتییە لە ئەکتێکی مێژوویی، کە سەرئەنجامی ئاشکراکردنی مێژوویێتییە وەک کاتیگۆریی بناغەیی ئەکزیستێنسی مرۆڤ. ئەکتی رادیکال زەروورییە و نێوەندی ئەم زەروورەتەش بریتییە لە مێژوو. ئەم حوکمە دیاریکراوە مێژووییەی ئەکزیستێنسە، کە ریشەیەکی قووڵی لە حەزی مارکوزە بۆ بوون و کـات ـی هایدێگەردایە. مارکوزە بـەدووی هەنگاوەکانی هایدێگەردا، رەهەندی رەسەنی ئەکزیستێنس لەتەک ناچاریی (دێتەرمین) ەکەی مێژوودا یەکدەخات. مارکوزە لە دیاریکردنەکەی هایدێگەردا بۆ مێژوویێتی وەک پێکهاتەی دازاین، زۆرتـریـن پـەرەپـێدان بە فەلسەفەی بـۆرژوایـی



مارکس

دەبینێت، بەڵام لە هەمان کاتدا بڕنەکردنەکانی هزری هایدێگەر لە ناتواناییەکەیدا بۆ تێگەیشتنی ناوەڕۆکە ماتەریالەکەی مێژوویێتی، دەناسێتەوە.
«ناسینەوەی بەرگی مێژوویی دازاین و ناچارییە مێژووییەکەی لە نێو (قـەدەر) ی کۆمەڵگەدا، توێژینەوە رادیکالەکەی هایدێگەری ئاڕاستەکردووە رووەو زۆرترین پەرەپێدان بە فەلسەفەی بۆرژوایی کە هەتا ئێستا پێیگەییشتبێ- و بتوانێت پێیبگات -. ئەو، شێوازی تیۆرییانەی رەفتاری مرۆی وەک (سـەرچـاوە) وەرگرتبوو بۆ داڕشتنی (مەرجە -چێکردن) ی پراکتیکی و بەم رێیەوە پراکسیس وەک رووبەری بڕیار پیشان دەدرێ. ئەو، ساتی بڕیار (چارەسەر) ی وەک دۆخێکی مێژوویی و چارەسەریی خۆی بۆ ئاڕاستەدانی قەدەرێکی مێژوویی، دیاریکرد. ئەو لە دژی تێگە بۆرژواییەکانی ئازادی و ناچاری، واپیشان دەدات کە پێناسەیەکی نوێی بوون-ی ئازادی کردووە: توانایی بۆ هەڵبژاردنی زەرووڕەت وەک توانستی راستەقینە بۆ گرتنی ئەو شیمانانەی کە رەچەتەیی و دیاریکراوەن. هەروەها ئەو مێژووی وەک تاکە ئۆتۆریتی لە پەیوەندیدا بە: (وەفاداری بۆ ئەکزیستێنسی کەسێک) داڕشت. لێرەدا ئیدی ئیمپولزی (هەژانی) رادیکال دەگاتە کۆتایی» (Marcuse ٢٠٠٥ , ١٥).

کەواتە هەوڵی مارکوزە بریتییە لە پێکهێنانی مارکسیزمی هێگڵی و ئۆنتۆلۆگیی ئەکزیستێنسیال، بە مەبەستی «راستکردنەوە» ی هەردووکیان. زەحمەتییەکەی بریتی بوو لە جەختکردنەوە لەسەر ناوەرۆکی ماتەریالی مێژوویێتی و وەرگرتنی مێتۆدی دیالێکتیکی وەک گونجاو بۆ ئـەم ئۆبژێکتیڤە (بابەتە). مارکوزە لە داڕشتنە تەرییبەکەی نێوان ئەکزیستێنسیالیزم و مارکسیزمدا و جەختکردنەوە لە ساتی سەبژێکتیڤی لە مارکسیزمدا، دەگات بە توخمێکی نـوێ لەتەک ئاڕاستەیەک رووەو زەرووڕەتی مێژوویی لە ئەکتی مرۆڤدا. ئەم ئەکتە بریتییە لە نێگاسیۆنی (نەرێکردنی) ئەو دۆخەی کە هەیە، لە هەمان تێگەییشتنی دیدی هایدێگەردا بۆ بڕیاردان رووەو ئەکزیستێنسی رەسەن کە وەک «نکۆڵیلێکردن» ی رابوردوو لێیتێگەیشتبوو:
«ریشەی ئەم زەرووڕەتـــەی ناخی مێژوو لە نێو ئەدگاری بناغەیی مێژوویێتیدایە، کە بە روونترین شێوە لە فاکتدا دیاردەدات و هۆگەلی بزووتنەوەی مێژوویین لە دۆخی هەیەوە (status quo) کە پێشتر بـەتـەواوی دۆخـی ئێستایی بـووە لە جیهاندا، وەک ئـەوەی بژییێت لە دۆخی هەیەدا. ئەو هۆگەلە تەنیا لە دەرەوەی ئەو دۆخەدا پەرە دەسێنن. ئەمەش تەنیا بە هۆی ئەو پرنسیپە، کە: (دۆخە هەیەکان- و) ترانسێندێنت، مێتامێژوویی، هەژانی نامێژوویی و پچڕان لەخۆ دەگرن. سەرباری ئەمە ئەو پەرەسەندنە تەنیا هەتا ئەو رادەیە دەهەقیقەتێت کە لە میانەی ئەکتی مێژوویی مرۆڤدا بێت، کە ئەمەش هەمیشە فۆرمی «نێگاسیۆنی دۆخی هەیە» وەردەگرێت. ئێمە گەرەکە ئەوەمان لە یاد بێ کە — وەک چۆن هایدێگەر بە روونی پێیگەییشت — چارەسەریی رووەو ئەکزیستێنسی رەسـەن کە بریتییە لە ئاگایی بۆ مـەرگ، تەنیا بە رێی نکۆڵیکردن لە رابـوردوو دەشێت، ئەو رابـــوردووەی کـە هەمیشە سـەروەرییـەکـەی لە بەردەم نشوستیهێناندایە. ئەمە کاتێک پابەند بە ئاوەڵاکردنە نوێیەکەی مارکس بۆ بەرجەستەکردنی پراکتیکی، وەربگرین، بریتییە لە تیۆریی شۆڕش.» (Marcuse ٢٠٠٥ , ١٨-١٩)

مارکوزە لەتەک هایدێگەردا دەبێژێت کە گەر دازاین لە بوونە تایبەتییەکەیدا مێژووییە، ئەوا هەموو ساتێک لە دۆخی مێژوویی کۆنکرێتدا دەمێنێتەوە. بە بێ

ئەو بونیادە بناغەیییەی دازاین، دەبێ دۆخەکەش لەناو بچێت. مێتۆدی مارکوزە لەبارەی لەناوچوونی مێژوو، هێرمینیۆتیک نییە بەڵکو دیالێکتیکییە، مێتۆدێکی کردارییە پابەند بە مەئریفەوە، کە لە توانایدایە لەسەر بنەمای سەرجەمێتی دۆخی کۆنکرێتی مێژوویی بگات بە دەرئەنجامگەلی ڕاست لەبارەی کایەی پراکسیس. کەواتە بە پێی ئەو شرۆڤەیە، مارکوزە لە نووسینەکانی سەرەتایدا کۆششی بۆ سەنتێزی ئۆنتۆلۆگیی ئەکزیستێنسیال و مارکسیزم کردووە:

« گەر ئێمە بخوازین لەلایەک، فێنۆمێنۆلۆگیی دازاینی مرۆڤ کە سەرەتا بە ڕێی هایدێگەرەوە پــەرەی پێدرا، وەرگـریـن بۆ تەکمیلەکردنی لە نێو فێنۆمێنۆلۆگیی دازاینی کۆنکرێت و کرداری کۆنکرێتی مێژوویی بە پێی خواستی مێژوو لە هەر دۆخێکی مێژووییدا، کەواتە لە لایەکی دی دەبێ بخوازین فێنۆمێنۆلۆگی ببێتە مێتۆدی دیالێکتیکیی مەئریفە، کە ئــەوەش خزینە بۆ نێو نەسازیی ڕاستەوخۆ، کە بە هۆیەوە ئاشکرا دەبێت کە یەکخستنە کۆنکرێتییەکە، سەرجەمێتییەکی تەواو ئۆبژێکتە.» (Marcuse ٢٠٠٥ , ٢٠)

## ٢- هزرین وەك پراكسیس

سەرباری ئەوەی هایدێگەر لە نامەیەک لەبارەی هومانیزم دا دەریدەبڕێت، کە ئەو خۆی پنتی هاوبەش لە نێوان هزری خۆی و مارکسیزم لە تێگەیشتنی ڕەهــەنـدی مێژوویی بوونی مـرۆڤ و ڕیالێتیدا، دەبینێت، بەڵام ئەو بە توندی ڕوانگە سەرەکییەکەی شرۆڤەی ئەکزیستێنسیالی مارکوزە ڕەتدەکاتەوە و لە سەمینارەکاندا (Hiedegger ٢٠٠٥ b) — بەتایبەت لە گەشتە سەمینارییەکەی ١٩٦٩ دا — و هەڤپەیڤینی تەلەڤیزیۆنی لەتەک ریچارد ویسەر (Hiedegger ٢٠٠٠)دا بە ئاماژەپێکردنی بۆ جیاوازی نێوان نامۆبوون (Entfremdung) و ناڕەسەنێتی (Uneigentlichkeit)، سوورە لە سەر خۆبەدوورگرتن لە ئەرێدان بەو شرۆڤەیە.

شـێـوازە مـرۆڤـگـەرایـانـەکـەی هایدێگەر بۆ دیاریکردنی جەوهەری بوونی مرۆڤ، مێتافیزیکە ڕەهاکەی هێگڵ دەڕووخێنێت و هەروەها (بە دیدی هایدێگەر) ماتەریالیزم لە پێکهاتەکانیدا جەوهەری تەکنیکی مۆدێرنەیە و هـزری مارکس بەقووڵی لە نێو مێژووی مێتافیزیکدایە. کەواتە مارکسیزم ناتوانێت ڕەچاوی فێنۆمێنی سیاسیی/ جیهانبینی (Weltanschauung) بکات و لەبری ئەوە تێگەییشتنەکەی، لە جەوهەری تەکنیکەوە وەک تاکە شێوازی پەرەسەندنی مێتافیزیک، سەرەتا دەگرێت. لێرەوە نەشیاوە مارکسیزم لە ئاستی سیاسیدا بەرهەم بخاتەوە، بەڵام دەشێت لە ئاستی هزردا لە پەیوەندییەکەیدا بە بوونەوە بەتوانا بێت. کاتێک کە لە هەڤپەیڤینە ئاماژەپێدراوەکەی سەرەوەدا بە ئاشکرا پرسیاری شیمانەی ئەرکی سۆسیالی فەلسەفە ڕووبەڕووی هایدێگەر دەکرێتەوە، لە وەڵامدا هەر یەکێک لە ئەرکەکان لە سەرجەمێتی جەوهەری ئەوەدا کە دەگۆڕێت، دیاریدەکات و بەم ڕێیەوە پێشبینیکردنی گۆڕین بریتی دەبێت لە هزرینێک کە لە میانەی ڕاڤەیەکی نوێی جیهاندا مسۆگەر دەکرێ کە جیاوازە لەوە، کە مارکس بۆ نموونە لە کتێبی یازدە تێز لەبارەی فیورباخ ناوی دەنێت کرداری شۆڕشگێڕانە. هایدێگەر لەوەدا کە گۆڕین لەسەر بنەمای ڕاڤەکردنی جیهان دیاریدەکات، بە ئاشکرا دژبەری مارکس دەوەستێتەوە. قبوڵکردن بە پێی ئەوە، کە جیهان بە ڕادەیەکی کافی و هەمەلایەنی

ڕاڤە بکرێت و بەدوویدا ڕووەو گۆڕینی گوزەر بکرێت، لە لایەک پێشەمێتی بە کردارێک بەدەر لە خودی ڕاڤە دەدات و لە لایەکیدی ئەوە نەشیاوی نکۆڵیکردنە کە لەسەر بنەمای ڕاڤەیەکی بەراییە، کە گرنگی کردار و کارەکتەری مرۆڤ دیاریدەکرێت. هایدێگەر ئەم جوداکردنەوە و دژبەرییەی نێوان کردار و ڕاڤە لای مارکس ڕەتدەکاتەوە و لەبری ئەوە هەوڵی ئاشتکردنەوەیان دەدات لە نێو پەرەپێدانی تێگەیشتنێکدا بۆ ڕاڤە، کە خۆی کتومت بریتییە لە گۆڕین. هایدێگەر لە کۆنتێکستی سەمینارێکی گەشتەکەیدا ڕوودەکاتە مارکسیزم وەک شێوازە هزرینێک کە توانای یەکایەتیدانی «تەنیا دوو ریالێتی سەردەممان: پەرەپێدانی ئابووری و ئامرازە پێویستەکانی ئەو پەرەپێدانە» ی هەیە. (Heidegger ٢٠٠٥ b) بەڵام مارکسیزم لەو پێویستییەی گۆڕینی جیهان دەردەچێت، کاتێک کە لە ئەئێستادا داوای دەکات. هایدێگەر هەروەها سیتات لە یازدە تێز لەبارەی فیورباخ دەهێنێتەوە و ڕاڤە ڕەخنەییەکەی دەخاتەڕوو و ئاماژە دەکات بە ئەوە، کە بە بێ ئەو تێگەیشتنە تیۆرییە بەراییە، کە وەک زەمینەی گۆڕین خۆی کتومت بریتییە لە گۆڕین، سەنتێزی ڕاڤە و گۆڕین-ی جیهان نەشیاو دەبێ.

مارکوزە بە بێ ئەوەی ئاگاداری ئەو پەرەپێدانە هزرییەی درەنگتری هایدێگەر بێت، - لەو کاتەدا لە ئێسسەکەیدا: لەبارەی فەلسەفەی کۆنکرێت، خەریکی ئەو هێڵە هزرییانە بوو، کە لە بوون و کاتەوە سەرەتایان گرتبوو — و گەیشت بەوە کە فەلسەفە وەک ساتی ئەکزیستێنسی، وەک زانستێکی پراکتیکیی ئامانجەکەی مسۆگەرکردنی هەقیقەتە لە میانەی کردارەوە. لێرەوە یەکایەتی تیۆری و پراکسیس بە ڕێی وەرگرتنی تیۆری وەک دەسوێژێکی (ئامرازێکی) مەئریفی بەسوود بۆ ئازادیی پراکسیس لە میانەی مەئریفەی زەرووڕەتی دۆخی مێژووییەوە مسۆگەر دەکرێ. سەرباری پڕواتایی ڕوانگەکەی مارکوزە، بەڵام چێوەیەکی کۆنسێپتیی گونجاو بۆ گرتنی ئیدێکەی هایدێگەر لەبارەی یەکایەتی تیۆری و پراکسیس وەک یەکایەتی «ڕاڤە کردن» و «گۆڕین»، پیشان نادات. بە دیدی من دابڕانەکە دەگەڕێتەوە بۆ ڕووکردنە بناغەییەکەی درەنگتری هایدێگەر ڕووەو فەلسەفەی ئەرستۆتێلیس، کە ئەمەش گەیاندنێکی گونجاوی دیدی هایدێگەر نەشیاو دەکات. ڕەخنەی هایدێگەر لە پرسی شێوازێک بۆ بە ئۆبژێکت نەکردنی فەلسەفەدا، ئەوەیە کە ناوی دەنێت «بەرایی تیۆری» لەنێو کۆششکردن بۆ تێگەیشتنی ژیان لە زیندووێتیەکەیدا. شرۆڤەی هایدێگەر بۆ کتێبی شەشەمی ئێتیکی نیکۆماخی، بووە هۆی وەرگرتنی دوو ئەدگاری هزرمەندانەی/ دیانۆئایی ئەرستۆتێلیسی: سۆفیا و فرۆنێزیس (Heidegger ٢٠٠٥ a) وەک شێوازەکانی تیۆری و پراکسیس. تیۆریی ئەرستۆتێلیس بۆ هایدێگەر تیۆرییەکە، کە هێشتا بەتوانایە بۆ تێگەیشتنی ژیان. ئەمە سەرباری ئەوەی مانەوە لە خۆیدا نەمانی هەڵگرتووە: بۆ نموونە ئاراستە ڕووەو نەمانی ژیان ڕیشەکەی لە ژیان خۆیدایە. بەڵام دژبەرییەکی بناغەیی لە نێوان تیۆری و ژیان، تەنیا بە ڕێی سنووردارکردنی تیۆری لە ڕووبەری گریمانە و پیشاندندا دەشێت، وەک چۆن — هایدێگەر دەبێژێت —بەتایبەتی نوێکانتیزم ئەمەی کرد. ئەمەش دژبەری سەروەریی ئەو تیۆرییەیە کە هایدێگەر لە سەرەتاکانی هزرەکەیدا لە وانەکانی یەکەم خولی فرایبورگ (١٩١٩-١٩٢٣) لەبارەی ئامانجەکان بۆ ئاراستەکردنی فەلسەفە ڕووەو

فرۆنێزیس (فەلسەفەی پراکتیکی) فۆرمولەی کردبوو. مۆتیڤی ئەو ئاراستەکردنە تەنیا بریتی بوو لە «مێتۆد». گەر فرۆنێزیس — وەک هایدێگەر داینا- بریتی بێ لە توانستی نێوەندگیریی گشتێتی و تایبەتێتی، کەواتە روون و ئاشکرایی لە نێو ئاسۆی تێگەیشتندا بناغەیەک بۆ تێگەییشتنی ژیان لە سەرجەمێتییەکەیدا دەهێنێتە پێشەوە. بەڵام ئەم ئاراستەکردنەی فەلسەفە رووەو فرۆنێزیس، سەرباری کارایییە مێتۆدییە پەتییەکەی، سەرئەنجامی فراوانی نامێتۆدی هەیە: سەرەتای ساتێکی پراکتیکی لەنێو فەلسەفەدا (ئاخر ئاراستەی مێتۆد ئاراستەیەکی تیۆرییە نەک پراکتیکی- و). فەلسەفە وەک راڤەکردن قووڵ هزرینێک نییە لەبارەی جیهانی نەگۆڕ، بەڵکو جیهان لە ساتی تێگەییشتن لێی، دەگۆڕێت. ئێمە لە میانەی نزیککەوتنەوەی پتر لە ئەرِیستۆتێلیس و تێگەی پراکسیسەکەی دەتوانین باشتر لە روانگەی گۆڕین تێبگەین. بۆ ئەرِیستۆتێلیس پراکسیس بریتییە لە بزووتنێک کە کۆتاییەکەی خۆی هەڵگرتووە (لەخۆگرتووە). کە ئەو کۆتاییەش دەهەقیقەتێت (دەبێت بە هەقیقەت) ئەوا نابێت بە پرۆدوکتێکی (داڕێژەرێکی) دەرەوەی خۆی. هزرین و تێگەییشتن «داڕێژەری کاریگەرییە راستەوخۆکان» نین، بـەڵام سـەربـاری ئـەوە ئەکتیش بـە رێی هەقیقەتی هزرین و تێگەییشتنەوە هەیە. دەشێ پوختتر لە واتای ئاراستەکردنی فەلسەفە رووەو فرۆنێزیس لای هایدێگەر تێبگەین، گەر لە نێو هەرە سەرەتاکانی کۆششکردنیدا بۆ دانانی بناغەیەکی تۆکمە بۆ هزرینەکەی، رەچاوی بکەینەوە، بەتایبەت لەو ساتەدا کە هایدێگەر بۆ پەیوەندی نێوان ئینتوئیسیۆن و تێگەییشتن، گەڕایەوە بۆ هێگڵ و کۆنسەپسیۆنە دیالێکتیکییەکەی (Heidegger ٢٠٠٢) و یەکسەر بەدوویدا رووەو ئەرِیستۆتێلیس.

بە هەمان رادەی وەرگرتنی ساتی دیالێکتیکی بۆ پشتیوانی فرۆنێزیس، سەنگی تێگەییشتنی هایدێگەر بۆ شیمانەی گۆڕین، دادەبـەزێ. ئەو لەبارەی زۆرخایەنی (weilen) لە نێو کراوەیی و سەنگینی (gelassenheit)دا دەدوێـت، چونکە مەبەستێتی حاڵەتی مرۆ لە نێو سەردەمی تەکنیکدا و بۆچییەکەی ئەم کارەکتەریزەبوونەی سەنگینی وەک مانەوە (verweilen) لە نێو کراوەییدا، روونبکاتەوە. واتە هەر دوو حاڵەتی تێگەییشتن یان تێنەگەییشتنی تەکنیک لە روانگەی مێژووی مێتافیزیکەوەیە.
کاتێک کە لە هەڤپەیڤینێکدا لەگەڵ فرێدریک ئۆلافسۆن، مارکوزە بەو وەرچەرخانە هزرییەی درەنگتری هایدێگەر دەزانێت، هێڵی جەخت بە ژێر هەڵەی ئاشکرای ئەو هزرەدا، سەرباری خەریکبوونی بە مێژووێتییەوە، دەکێشێت. بە دیدی مارکوزە، هایدێگەر رەچاوی مێژوو ناکات و کاتێک کە لە نێو کاتیگۆری ئەکزیستێنسیالدا گۆڕانی پێدەدات، لە کاری دەخات. هەروەها لەم کۆنتێکستەدا مارکوزە دەبێژێت، کە لە روانگەیەکی هەنووکەییەوە دیدی هایدێگەر بۆ ئەکزیستێنسی مرۆڤ و بوون (ی)- لەنێو- جیهان لە بوون و کاتدا زۆر چەپێنەر و ستەمکارانە بووە و «وێنەیەک دەدات کە لێزانانە یاری بە ترس و بێهیوایی پیاوان و ژنان لە نێو کۆمەڵگەیەکی چەپێنەردا دەکات — ئەکزیستێنسێکی ناشاد: کە مەرگ و قەلەقی بەسەریدا کشاوە؛ مرۆڤ کەرەستەی ئۆتۆریتیی کەسێتییە» (Marcuse ٢٠٠٥ , ١٧٠).
وەک سەرئەنجامی «پەیوەندی هایدێگەر بە نازیزم»، مارکوزە لە هزری هایدێگەردا «بێبەهاکردنێکی زۆر توندی ژیـان، نەهێشتنی شـادی، هەست بزواندن و رەزامـەنـدی» دەبینێتەوە، کە پێشتر ئاشکرا نەکرابوون. تەنانەت، بە رێی سەرجەمێتی راڤەی

ئەکزیستێنس وەک بوون-ڕووەو-مەرگ، و لکاندنی مەرگ بە هەموو کاتژمێر و خولەکێکی ژیانەوە، واتای ئەرێنی ڕەسەنێتیش، مەرگی بەسەردا کشاوە. لێرەوەیە کە مارکوزە وەک وەڵامێک بۆ پرسیاری: «چۆن ئینستیتیوتە کۆمەڵایەتییەکان خۆیان لە نێو تاکەکاندا بونیاد دەنێنەوە و چۆن تاکەکان بە ڕێی ئەدگاری ئەو بونیادنانەوانە لە نێو کۆمەڵگەکەیاندا ئەکت دەنوێنن»، بە هەمان شیوەی هایدێگەر شرۆڤەی ئەکزیستێنسیال بە قووڵی لە نێو کۆمەڵگە و کۆنتێکستێکی زۆر جیاوازدا دەبینێت. مارکوزە لە کۆتایی هەڤپەیڤینەکەدا جەخت دەکاتەوە، کە «لەوێدا فەزایەک هەیە بۆ ئەوەی پێی دەگوترێ شرۆڤەی ئەکزیستێنسیال، بەڵام تەنیا لە چێوەکەی خۆیدا».

لێرەوە پاش نەمانی حەز و هیوا بەرابییەکەی بۆ هزری هایدێگەر و پێکەوە ئیش کردنیان لە داڕشتنی بناغەیەک بۆ فەلسەفەیەکی کۆنکرێت، مارکوزە بە ئاڕاستەیەکی جیاوازی پراکسیسدا، پەرە بە جیهانبینی و کرداری سیاسیی دەدات، لە کاتێکدا کە هایدێگەر — بۆ دژایەتی هەر ئەکتێکی سۆسیال یان شۆڕش — لە میانەی سەرجەمێتی ژیاندا بە جەختکردنەوەوە بەردەوامی دەدات بەو ڕۆڵەی هزر لە «گۆڕینی جیهان» دا. هزر بۆ ئەو (هایدێگەر) هەمیشە باڵاترین فۆرمی پراکسیس بووە. کەواتە ئەم جیاوازییەی واتای پراکسیسە، کە خۆی لە ئاسۆی کراوەی دیالۆگی نێوان هایدێگەر و مارکوزەدا دەهێڵێتەوە. هەروەها گەر ئەوە ڕاست بێ کە ڕاڤەی مارکس و لێرەوە هەروەها مارکسیزمی مارکوزەییش بریتی بن لە مێژووی مێتافیزیک، هێشتا سەلماندنی هایدێگەر ناتوانایە بۆ گرتنی کرۆکی مارکسیزم. بە واتایەکی دی، بەو پێیەی شیمانەی زانستیی هەڵگێڕانەوەی شۆڕشگێڕانە، بە ڕێی ستاتۆی ڕیالی کۆمەڵگەوە دەشێت، دەرچووەپنتی دیدی مارکس ڕاستە و ئێمە ناتوانین بۆ ئەمە لە هایدێگەرەوە — کە بۆ ئەو تاکە چانسی «گۆڕین»ی جیهانی ڕیال لە نێو هۆنراوە و یادهێنانەوەی هزریندایە، واتە لە ڕووبەرێکدا کە هیچ کەسێک ناتوانێت داواکەی مارکس و مارکسیزم — لەو پرسیارەدا وەڵام بداتەوە، کە ئایا گۆڕانی سیاسی لە نێو جیهاندا چۆن دەشێ؟

سەرچاوەکان


Denker, Alfred, and Holger Zaborowski, eds. 2007. Heidegger Jahrbuch, Vol. 3: “Heidegger und Aristoteles”. Freiburg i. Br: Verlag Karl Alber.

Figal, Günter. 1996. Heidegger zur Einführung, 2. Auflage. Hamburg: Junius Verlag.

Figal, Günter. 2000. Martin Heidegger. Phänomenologie der Freiheit, 3. Auflage. Frankfurt am Main: Athenäum Verlag.

Heidegger, Martin. 1947. Über den Humanismus. Frankfurt a. M.: Klostermann.

Heidegger, Martin. 1992. “Grundprobleme der Phänomenologie (Wintersemester 191920/).” In Gesamtausgabe, Band 58, hrsg. von Hans-Helmuth Gander. Frankfurt a. M.: Klostermann.

Heidegger, Martin. 1993. “Phänomenologie der Anschauung und des Ausdrucks. Theorie des

Interpretationen zu Aristoteles. Ausarbeitung für die Marburger und die Göttinger Philosophische Fakultät (1922), (Natorp-Bericht)." In Gesamtausgabe, Band 62, hrsg. von Günther Neumann. Frankfurt a. M.: Klostermann.

Heidegger, Martin. 2005 b. "Seminare (19511973-)." In Gesamtausgabe, Band 15, 2., durchgesehene Auflage, hrsg. von Curd Ochwadt. Frankfurt a. M.: Klostermann.

Marcuse, Hebert. 2005. Heideggerian Marxism. Edited by Richard Wolin and John Abromeit. Lincoln: University of Nebraska Press.

Volpi, Franco. 1984. Heidegger e Aristotele. Padova: Daphne.

Anna Pia Ruoppo is PhD researcher at the University of Naples „Federico II". Her research interests are the phenomenology, the ethics, and the practical philosophy. She has published the book Vita e metodo nelle prime lezioni friburghesi di Martin Heidegger 19192008) 1923-).

Address:
Anna Pia Ruoppo
Università degli Studi „Federico II"
Dipartimento di Filosofia
Via Porta di Massa, 1
80133 Napoli
E-mail: annapiaruoppo@yahoo.com

philosophischen Begriffsbildung (Sommersemester 1920)." In Gesamtausgabe, Band 59, hrsg. von Claudius Strube. Frankfurt a. M.: Klostermann.

Heidegger, Martin. 1995. "Phänomenologie des religiösen Lebens." In Gesamtausgabe, Band 60, hrsg. von Matthias Jung, Thomas Regehly und Claudius Strube. Frankfurt a. M.: Klostermann.

Heidegger, Martin. 1999. Zur Bestimmung der Philosophie, 2. Auflage. Frankfurt a. M.: Klostermann.

Heidegger, Martin. 2000. "Reden und andere Zeugnisse eines Lebensweges (19101976-)." In Gesamtausgabe, Band 16, hrsg. von Hermann Heidegger. Frankfurt a. M.: Klostermann.

Heidegger, Martin. 2002. "Grundbegriffe der aristotelischen Philosophie (Somersemester 1924)." In Gesamtausgabe, Band 18, hrsg. von Mark Michalski. Frankfurt a. M.: Klostermann.

Heidegger, Martin. 2004. "Der Begriff der Zeit (1924)." In Gesamtausgabe, Band 62, hrsg. von Friedrich-Wilhelm von Herrmann. Frankfurt a. M.: Klostermann.

Heidegger, Martin. 2005 a. "Phänomenologische

# کات، ڕۆژنامە، هۆشیاریی بۆ کات ماس میدیاو بنچینە (کات) ەکان

نووسینی: ڤالتەر هۆمبێرگ
لەئەڵمانییەوە: قوباد ڕەسوڵ

## ١.

«ئەگەر مرۆڤ لێم نەپرسێت کات چیە، ئەوا دەیزانم،» جارێک پیاوێکی پیری زیرەک ئەمەی گوت، «ئەگەر مرۆڤ لێم بپرسێت، ئەوا نایزانم. بۆچی من پرسیار دەکەم؟» بەم شێوەیە نۆربێرت ئەلیاس کتێبەکەی خۆی (دەربارەی کات) دەستپێدەکات. پیاوە پیرەکە، ئەوەی ئەلیاس مەبەستێتی بێ ئەوەی ناوی بهێنێت، نزیکەی شانزە سەدە پێشتر نوسیویەتی: « من ددان بەوەدا دەنێم لەبەردەم تۆدا گەورەم (مەبەست لە مەسیحە....قوباد) کە من ئێستاش هەرنازانم کات چیە. دیسان ددان بەوەدا دەنێمەوە بۆ تۆ، ئۆە گەورەم، کە من ئەمانەم هەموو لەکاتدا گوت و من ماوەیەکە دەربارەی کات قسەدەکەم، وە کە خودی ئەو ماوەیە هیچی دی نیە بێجگە لە پێوەری کات. بەڵام من چۆن بتوانم ئەوە بزانم لەکاتێکدا

تاکو ئێستاش هەرنازانم کات چیە؟» بەم شێوەیە ئۆگوستینوس لەبەشی یانزەهەمی بەرهەمەکەیدا (کۆنفێسۆنێس) نوسیویەتی.
بەڕێزیشتان بۆچوونەکەتان ڕاستە کە من ئەم دوو پەرەگرافە دەخەمە سەرەتاوە بۆئەوەی هەر لەپێشەوە داوای بەخشین بکەم بۆئەوەی کە ئەو بیرانەی باسدەکرێن تەنها زۆر سەرەتایی و ناتەواون.
مەسەلەی کات وەکو زۆر مەسەلەی دی وایە: لەژیانی ڕۆژانەدا زۆر ئاسایی لەگەڵیدا بەڕێوەدەچین، بەڵام لەکاتی لێکۆڵینەوەی زانستیانەدا ئیدی دەبنە گیروگرفت.

زۆرێک لە زانستەکان خۆیان بەدیاردەی (کات)ەوە خەریک دەکەن: زانستە سروشتی و بیۆلۆگیەکان، زانستەکانی لێکۆڵینەوەی سلوک و کۆمەڵایەتی، زانستی تێۆلۆگی (ئاینیەکان)، فیلۆسۆفی، فیلۆلۆگی (زانستەکانی زمان)، زانستەکانی هونەر و مێژوو. لەکوێوە دەستپێبکەین؟ ئەگەر مرۆڤ لەچەمکە نێوان دژە باوەکانەوە سەرنج بدات وەکو کاتی دەرەکی و ناوەکی، بابەتی و خودی، چەندی و چۆنی، واقیعی و خەیاڵی، دونیایی و من، کاتی گشتی و تایبەتی، ئەوا سەرەتا لەلایەکەوە زانستی فیزیک و لەلایەکی دیەوە زانستی سایکۆلۆژی و بیۆلۆگی خۆیان وەکو باشترین یاریدەدەرەکان پیشاندەدەن.

## ٢.

ئەگەر ئێستا مرۆڤ هەوڵبدات بەووردی لەناو خانە زانستیەکان و تاقیکردنەوەکانی فیزیکدا هاوکێشەیەکی (کات)ی بابەتیی چنگ بکەوێت، ئەوا ئەو کەسە بەبێ هیوایی دەگەڕێتەوە. پێش سێ سەد ساڵ نیوتن جیاکردنەوە بەناوبانگەکەی خۆی لەنێوان کاتی ڕەهایی و ڕێژەییدا بڵاوکردەوە. لەکاتێکدا کاتی ڕێژەیی نزیکەی وەکو بەژنێکی یاریدەدەر وایە بۆ ژیانی ڕۆژانـە، کاتی ڕەهایی دەکرێتە شتێکی ڕاستەقینەی سەربەخۆ: « کاتی ڕەهایی ڕاستەقینە و ماتماتیکی، خۆی لەخۆیدا دەڕوات و دەتوانێت سروشتی خۆی هەمیشە بەوشێوەیە بپارێزێت بێ هیچ جۆرە پەیوەندیەک بەهیچ شتێکی دی دەرەکیەوە».
لایبنیتس هـەرزوو ڕەخنەی ئـەوەی گرت کە کات لەڕووداوەکان جیاناکرێتەوە «شوێن و کات ناتوانن خۆیان لەخۆیاندا، سەربەخۆ و جیا لە شتومەک بونیان هەبێت، مەگەر تەنها بیرەکانی خودا».
لەپاڵ کاتی ڕەهاییدا نیوتن شوێنی ڕەهاییش دیاریی دەکـات. هەردووکیان — شوێنی سێ ڕەهەندی و کاتی یەک ڕەهەندی — سەربەخۆن لەیەکدی. هەروەها سەربەخۆش لەوەی کە چۆن دەپێورێن. لەبەرامبەر ئەمەدا ئاینشتاین لەتیۆریە ڕێژەییەکەیدا بنچینە هاوبەشە مـەرجـدارەکـەی شوێنکات و کارلێکردنە فیزیاویەکانی لەناویدا ڕوودەدەن و هەروەها پەیوەست بوونی بەجێگای وەستانی کەسی چاودێرو مێتۆدی بەکارهێنراو بۆ پێوان پیشاندەدات.
هەرچەندە ئەویش لەڕاستیدا لەبنچینەیەکی ڕەهای هۆوکاریگەریی (سببیە)وە دەڕوانێت کە بەوهۆیەوە ئاڕاستەی کات لەپرینسیپدا توانای ئاوەژووکردنەوەی هەیە.

بابەتی ئاوەژووکردنەوەکە لەسەرەتای وەرچەرخانی سـەدەوە بـوە جێگای مشتومڕی زۆر، کەتیایدا بەرهەڵستیکردنی بەشی دووهەمی تێرمۆدینامیک، بەشی ئێنترۆپی، ڕۆڵێکی وازیکرد. (تێرمۆدینامیک و ئێنترۆپی لەچەمکەکانی فیزیکن...قوباد). هەوڵەکانی شیکردنەوە و لێکدانەوە بەردەوام جیاوازیەکانیان

گەورەتر دەکرد، تا گەیشتە تیۆری پەرەسەندنەکەی ئیلا پریگۆگینێس کە تیۆریەکی خاوەن ستراکتوری سیستەمی ناهاوسەنگی دانا، هەروەها ئەوەی مانفرێد ئایگێنس کە جیاوازی لەنێوان کات ی (بەهێز) و (لاواز) دا دەکات. هەندێک لەزانایان دیسانەوە تەنانەت شک لەوەدەکەن کە گەردوون لەسەر ئاستی بچووکترین تەنی میکرۆسکۆپییەوە تاوەکو گەورەترین دووریــە گەردوونیەکان دەبێت لــەڕووی کاتشوێن ەوە ڕێکخراوبێت و بڕوایان بەمۆدێلی چەندین چینی لەدوایەکی گونجاو هەیە. بەڵام بەهەرحاڵ ئاراستەی پەرەسەندنی تیۆریەکان ڕوون و ئاشکرایە: لەتیۆری ڕەهاییەوە دەبنە تیۆری ڕێژەیی. (کاتە بابەتیەکەی زانستە سروشتیەکان) دەتوانرێت تەنها لەنێوان دوو کەوانەدا باس بکرێت، بەڵام ئەی ئایا (کاتە خودیەکە) چۆن باس دەکرێت؟.

## ٣.

ئێمە هەمووەمان لەئەزمونی تایبەتی خۆمانەوە ئەوە دەزانین کە ئێمە خێرایی تێپەڕینی کات لەحاڵەتی جیــاوازدا بەخێرایی جیاواز هەست پێدەکەین. لەکاتی ئەنجامدانی کارێکی یەک تۆنی بێڕەونەقدا، کات وەکو ڕۆشتنی هێلکەشەیتانۆکە تێدەپەڕێت، بەپێچەوانەشەوە کاتە پڕ لەخۆشی و خۆشباریەکان وەکو فڕین تێدەپەڕن. بەڵام ئەم پرۆسێسە وەکو ڕاستە بەڕێوەناچێت: لەکاتی گۆڕانێکی زۆرخێرای ڕووداوەکاندا دیسانەوە کات وادەردەکەوێت هێواش تێپەڕێت. «هەموو ماوەیەک کورتتر دەردەکەوێت، ئەگەر زیاتر خۆش و خۆشی بەخش بێت» پیلینیوس زۆردەمێکە ئەمەی هەستپێکردووە. هەست و نەستی ناخۆش، خەمباریی، ئازار، هەستکردن بەخەتاباریی و هیلاکی، ئەمانە هەستکردن بەتێپەڕینی کات ڕادەگرن. هەروەها چاوەڕووانیی هەستی تێپەڕینی کــات هێواش دەکــاتــەوە، بۆنمونە ئەگەر مرۆڤ دڵخۆش بێت بەوەی لەگەڵ هاوڕێکانیدا دەچێت بۆ خواردنەوەیەک، بەڵام لەپێشدا پێویست بێت گوێ لە وانەیەک بگرێ. هەروەها گۆڕانە دێمۆگرافیەکانیش دیسانەوە ڕۆڵێک وازی دەکــەن. بەوشێوەیە لای مرۆڤە بەتەمەنەکان کات خێراتر تێدەپەڕێت وەک لای گەنجەکان. تۆماس مان زۆر بەووردی لە (چیا جادووییەکە) دا ئەوەی وەسف کردووە، هەروەها بەونێوانڕژیەشەوە کە بەسەرهاتێکی کورتخایەن لە بیرەوەریدا درێژدەبێتەوە، بەپێچەوانەشەوە شتێکی ناخۆش کورت دەبێتەوە.

ئێمە هیچ ئۆرگانێکی هەستمان نیە بۆئەوەی کاتی پێ وەربگرین. هەستی کات، ئەمە بەمانای هەبونی توانا، ماوە و ڕێکوپێکیە کاتیەکانی حاڵەتەکان جیابکەینەوە. لەسەر بناغەی «شێوازی شیکاری و لێکدانەوەی زانیاریە وەرگیراوەکان، نێردراو لەلایەن چەندین ئۆرگانی هەستیی جیاوازەوە» زانایانی بواری تاقیکردنەوەی سایکۆلۆژی و نۆیرۆبیۆلۆگی، پێوەرە کاتیە دەرویەکان لە پرۆسێسە ڕیتمیەکانی ناو تۆڕی عەسەبەکانی مێشکی مرۆڤدا دەستنیشان دەکــەن، کە هێماکانی بەپێی ئەم گریمانە لەناو مۆخی ناوەڕاست و مۆخی گــەورەدا دەنرخێنرێن. بێجگەلەوەش زانستی فیزیۆلۆگی بۆڕوونکردنەوەی ڕیتمە دروستبوە ناوخۆییەکان، چەندین مۆدێلی پەرەپێداوە: مەزەنەی ئامێری سەرەکی پێوەری کات لەناو هەندێک بەشی سیستەمی عەسەبدا دەکات. ئاراستەکردنی ڕیتمە بیۆلۆگیەکان لەناو سیستەمی ئەنزیمە لەلایەن ناوکی خانەوە کۆنترۆڵکراوەکاندا

دەبینێتەوە وە یاخود بەهۆی سیستەمی ئەنزیمە بزوێنەکانەوە کە پەیوەستن بەئاڵوگۆڕی ماددەکانەوە لەخانەدا.

کەواتە دەبێت ئێستا کات چی بێت؟ زانای لێکۆڵەری سلوکی فیزیۆلۆگی یورگن ئاشۆف کە زۆربەچڕی خۆی بە ڕیتمە بیۆلۆگیەکانەوە خەریککردووە، سوپاسی ئەم پێناسەکردنەی دەکەین: « کات ئەوەیە کە ئێمە دەمان بێت، ئەگەربێت و سەعاتەکانمان فڕێبدەین» . وە ئاشۆف ڕاستەوخۆ بەتاقیکردنەوە ئەوەی سەلماندوە کە سەعاتی ناوخۆیی هەیە کە ئێمە ناتوانین فڕێی بدەین. ئەو بۆماوەی دوورودرێژ خەڵکانی ئەنجامدەری تاقیکردنەوەکانی لەژووری ژێرزەمینیدا هێشتۆتەوە و چاوەدێری و پێوانی ئەوەی کردووە کە چۆن ڕیتمی ژیانیان لەوجێگا دابڕێنراوەدا بەبێ سەعات و بێ ڕادیۆ و تەلەفزیۆن پەرەدەسێنێت.

گرنگترین ئەنجام: پرۆسێسە دەوریە ڕۆژانەییەکان کە لەژیانی ئاساییدا دەبینرێن، وەکو خۆیان دەمێننەوە، بەتایبەتی ئاڵوگۆڕی ڕێکوپێکی بەخەبەربون و خەوتن هەریەکە و بە دوولەسەرسێ بەخەبەربون و یەک لەسەرسێ خەوتنەوە. بەڵام کۆی کاتەکانی بەخەبەربون و خەوتن پێکەوە بەبێ پێوەرێکی کاتی دەرەکی بەڕێژە نابێتە ٢٤ سەعات، بەڵکو دەبێتە ٢٥.

ئایا لەمەوە چیمان بۆدەردەکەوێت؟ بۆمان دەردەکەوێت کە لەناو لەشماندا «سەعاتێکی فیزیۆلۆگی» هەیە کە لەڕاستیدا ڕیتمەکەی تەواو یەکسان نیە بە ڕۆژی فەلەکی کە بەهۆی سوڕانەوەی زەمینەوە دیاری کراوە، بەڵکو تەنها (تسیرکادیان)، چەمکێکی دروستکراو لە زمانی لاتینیەوە، (تسیرکا) واتە (نزیکەی)، کەواتە (نزیکەی ڕۆژێک). ئاشۆف دەستنیشانی دەکات :«بۆ هاوجووت بونی سەعاتە تسیرکادیانە مرۆییەکە، هێما کۆمەڵایەتیەکانی دەوروبەر ڕۆڵێکی بڕیاردەر وازی دەکەن» .

## ٤.

پاش کاتە فیزیکیە، سایکۆلۆژیە، بیۆلۆگیەکە، گەیشتینەلای کاتە کۆمەڵایەتیەکە. یەکێک لەپێوەرە کاتیە بڕیاردەرەکان لەکۆمەڵگا پیشەسازیەکاندا، بەپێی تێزەکەی من، ماس میدیایە. بۆئەوەی بتوانین ئەم تێزەیە پەرەپێبدەین، حەزدەکەم بەڕێزتان داوەت بکەم بۆ سەفەرێکی زەمەنیی کورت بۆ ناو مێژووی میدیا. پاشتر هەوڵ دەدەم ئەو مەعریفە مێژوویيە مرۆییە بەدەستهاتوانە لەبەردەم باکگراوندێکی لێکۆڵینەوەی (کات)ی زانستی کۆمەڵایەتیدا سیستەمیانە شی بکەمەوە.

بەڵام لەسەرەتادا سەرنجیکی گشتیانە: لەشادێڕی گوتارەکەمدا چەمکی «ڕۆژنامە» ناوی هاتوە. بەپێی زانیاری باوی ناوخەڵک زۆرجار والێکدەدرێتەوە کە لە وشەی «کات» ەوە وەرگیرابێت، (لەزمانی ئەڵمانیدا بەڕۆژنامە دەگوترێت تسایتونگ، بەکاتیش دەگوترێت تسایت، کەواتە لەنێوان تسایتونگ و تسایتدا ئەگەری بەدتێگەیشتن هەیە......قوباد). ئەمە هەڵەیە. لەڕووی مێژووی زمانەوانیەوە سەرەتا وشەکە لەفۆرمی «تسێدینگە» هەروەها «تسێدونگە» لەچوارچێوەی بازرگانی ناوچەکانی دەوروبەری کۆڵن – فلێمن دا سەری هەڵداوە. واپێدەچێت لەزمانەکانی «میتڵ نیدەردۆیچ کە دەکاتە باکوری ئەڵمانیا و میتڵ نیدەرلاند دەکاتە ڕۆژهەڵاتی هۆڵەندا، لەزمانی گێرمانیی ڕۆژئاواییەوە» وەکو وشەیەکی وەرگیراو

له وشەی «تێدینگە، نێردراو، هەواڵ»ەوە هاتبێت. بەکارهێنانی ئەم وشەیە هەرتەنها لای نوسەرانی وەکو لۆتەر و گریملس هاوزن نیە، بەڵکو هەروەها لای گۆتە و شیلەریش دەردەکەوێت «ڕۆژنامەی سەرکەوتن ڕاگەێنن». لەسەدەی پانزەهەمەوە زاراوەی «ڕۆژنامەی نوی» دەردەکەوێت بۆ هەواڵ و دەنگوباسی ئەکتوێل کە سەرەتا بەدەستنووس وەکو هاوپێچێکی نامە دەنێردرا و پاشتر بەهۆی چاپەوە ژمارەی زیادکرا. وەکو زاراوەیەک بۆ نوسینی چاپکراوی ڕێکوپێکی دەوریی بەزانیاریەوە دەربارەی ڕووداوەکانی ڕۆژو هەواڵی سیاسیو ئابوریو کۆمەڵایەتیو فیکریی دەستکەوتوەوە، ئەم زاراوەیە لەسەدەی هەژدەهەمەوە بەردەوام زیاتر بەکارهاتوە، تەنانەت لای گۆتە کەجارێک نوسیویەتی «ئێمە ڕۆژنامەی ینایەرمان لێرە لە دۆزەخ بەدەستەوەیە». لێرەبەدواوە حەزدەکەم خۆم بەلێکدانەوەی مانای ووشە نزیکەکانەوە خەریک نەکەم، کەواتە بەبەرگی دەرەکی ڕۆژنامەوە، بەڵکو بەپێی گەورەیی و فراوانی چەمکەکە، هەموو ماس میدیا باس لێبکەم کەتیایدا چەقی سەرەکی بکەوێتەسەر میدیا ئەکتوێلەکان.

## .٥

لەوجۆرە کۆمەڵگایانەدا کە پێیان دەگوترێ کۆمەڵگای سەرەتایی، هێشتا نیشانەکانی کاتەکان بەشێوەیەکی سیستەمیانە پەیوەندیان لەگەڵ یەکدی نیە، بەڵکو نەبەستراو لەتەنیشت یەکدیەوە دانراون. کەموکوڕی وەعی بۆ ڕیزبەندی و بەردەوامیی هەیە. تەنها لەمیانەی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیدا خۆئاراستەکردنی باو لەسەر کاتێکی دیاریکراو فراوان دەکرێت بۆ ئاراستەکردن لەسەر ماوەیەکی دیاریکراو، شتێکی لەوچەشنەش لەپەرەسەندنی میدیادا هەستی پێدەکرێ.

میدیا هەواڵیە چاپکراوەکانی سەرەتای پەرەسەندنی چاپ، یەکەمجار بەشێوەیەکی سەرەکی باسیان لەتاقە ڕووداوەکان کردووە. هۆکاری باسەکە و نیشانەکانی، بەزۆریی لەشادێڕەکەیدا ناویان هاتووە. ئەوەش نزیکەی بەم جۆرە «لەدوورگەی تازە و وولاتی تازە، پێش ماوەیەکی کەم دۆزراونەتەوە» وە یاخود بەسادەیی «سەفەری پادشای فەرەنسا بۆ جەنەوا». لەپاڵ هەواڵەکانی کاری گەورەی وولات و شەڕ و جەنگەکان و شکست و سەرکەوتنەکان و پەیماننامە و فەرمانەکاندا، بۆ نوسەرەکان و خاوەن ڕۆژنامەکان و دەزگاچاپەکان، بەتایبەتی جۆری ڕووداوەکانی «کارەسات» و «ڕووداوی ئەفسانەیی» جێگای سەرنج و لەئاستی هەواڵدا بون. بەم شێوەیە «ڕۆژنامە تازەکان» لەساڵی ١٥٥١ دا دەربارەی تاوێکی بەخوڕی باران لە فرانکن دەدوێن، لەهەمانکاتیشدا دەربارەی ئافرەتێکی جادووگەر کە شەیتان بەرەو ئاسمان فڕاندوویەتی. چەند ساڵێک پاشتر جیۆرج کرێدلاین لە نورنبێرگ چاپکراوێکی وێنەدار بڵاودەکاتەوە لەژێر شادێڕی :«ڕوویەکی زۆر سامناکانە و نیشانەی موعجیزە کە بینراوە لە بامبێرگ و لیختن فێلز لەساڵی ١٥٦٠ دا ڕۆژی ٢٨ .دیسەمبەر، هەوری ئاگرین بەسەر هەردوو ناوچەکەدا کشاون کە لەوێنەکەدا لەتەنیشت یەکدیەوە دانراون». تێکستەکە دەربارەی دەنگەدەنگ و خشەخش دەدوێ کە لە ئەنجامی قافڵەی ئەسپ سوارانەوە دروستبوە و مەبەستەکەشی بەهێزتردەکات بە «ئەمە هەندێک لە هاووڵاتیانی بەشەرەف لە بامبێرگ و لیختن فێلز بینیویانە». هەربەم بۆنەیەوە شاری بامبێرگ هەر

تەنها شاری سوتاندنی جادووگەران نەبوە، بەڵكو وەكو ناوچەی چاپیش ناوبانگێكی هەبوە.
«ڕۆژنامە تازەكان» وە بەیانی یەک پەڕەیی و چەندپەڕەیی سەردەمە تازەكە بەناڕیكوپێكی دەرچوون، ئاڕاستەكراوبون بۆ سەر چەند بابەتێكی ئەكتوێل، وە هەرلەبەرئەوەش حەزدەكەم ئەمانە وەكو میدیای كاتێكی دیاریكراو نیشانەبكەم. ئەم ئاڕاستەكرانە كاتیە هەرلەخۆوە و لەپڕدا نەگۆڕاوە، بەڵكو بەچەند قۆناغێک. سێ شێوازی گۆڕان دەتوانرێت جیابكرێنەوە: یەكەمیان «ڕۆژنامەكانی لە، تاكو» ئەو ڕۆژنامانەن كە لەیەكەم لاپەڕەیاندا ئاشكراكراوە بۆماوەی چەند دەردەچن، بۆنمونە بەدرێژایی بەردەوامیی جەنگێک یاخود شەڕێک. دووهەمیان «ڕۆژنامە ژمارەییەكان (ڕیزیەكان)» كە هەرچەندە بەناڕێكوپێكی و بێ پەیوەندیەكی ناوەڕۆكیانە بەیەكدیەوە دەرچوون، بەڵام بە بەردەوامی ژمارەیان بۆدانراوە. سێهەمیان ئەو ڕۆژنامانەن كە لەچەندین بەشی ناڕێكوپێكدا دەربارەی هەمان ڕووداو هەواڵیان گەیاندووە، بۆنمونە دەربارەی گەمارۆدانە توركیەكەی ڤێننا.
پیادەكردنی ڕۆژنامەی دەوریانە بەمانای پلەیەكی تازەتری پێشكەوتنی میدیا. مادەی هەواڵەكان ئێستا ئیدی بەبەردەوامی كۆدەكرانەوە، تاوتوێدەكران و دەگەێنران. بۆوەرگران و خوێنەران بەوهۆیەوە هەواڵ وەرگرتنێكی ڕێكوپێک بەپێی پلانە كۆمونیكەیشنیەكانی ئەو دەزگا میدیا دیاریكراوە دەستەبەركراوە. میدیای كاتێكی دیاریكراو دەبێتە میدیای ماوەیەكی دیاریكراو.

.٦

وەكو كۆنترین چاپەمەنی دەوری دەتوانرێت ڕۆژژمێر دیاری بكرێت. پاش ئەوەی یەكەمین ژمارەكانی ئەم چاپكراوە «ناوبەناوە» بەشێوەیەكی سەرەكی بەتەنها خۆی بەڕۆژژمێریەوە خەریككردبو، پاش لابردنی ڕۆژژمێری یولیانی (ڕۆژژمێری یولیانی بەناوی یولیوس سێزارەوە ناونراوە و تاكو سەدەی بیستەمیش هەرمابوو تەنانەت لای هەندێک بازنەی كەنیسە ئێستاش هەرماوە......قوباد) بەهۆی دانانی ڕۆژژمێری گریگۆریانی یەوە (ڕۆژژمێری گریگۆریانی بەناوی پاپا گریگۆری سیانزەهەمەوە ناونراوە و ئەمڕۆ لەهەموو دونیادا باویەتی. كۆتایی سەدەی شانزەهەم دروستكراوە بۆ ڕیفۆرمی ڕۆژژمێری یولیانی. دوایین گۆڕان بۆ ڕۆژژمێری گریگۆریانی ساڵی ١٩٤٩ لەچین جێبەجێكرا......قوباد) لەساڵی ١٥٨٢ دا چەند ژمارەیەک دەرچوون كە هەروەها چیرۆک و وتووێژ و تێكستی ئامۆژگاریشیان لەخۆگرتبو. ئەگەر ئەم جۆرە میدیایە وەكو بڵێی هەر لە بناغەوە كۆنسەرڤاتیڤانە دەربكەوێت، بەڵام سەردەمە هاوچەرخەكە جێ پەنجەی خۆی پێوە جێدەهێڵێت. بەوشێوەیە لەسەردەمی ڕاپەڕیندا (نەهزە) خشتەی لێكدان و هێڵی بەیانیی جێگای خشتەی چۆنیەتی خوێن وەرگرتن لەنەخۆش لەو «كتێبخانەی پیاوە بچووكەدا» وەكو لایبنیتس بە ڕۆژژمێری دەگوت، دەگرنەوە.
ژمارەیەكی كەمی میدیا ئەوەندە ژمارەی زۆریان لێدەردەچی، هەرلەبەرئەوەشە سیستەمە ئەوتۆریتێر و تۆتالیتێرەكان تاكو ئەمڕۆش بەچڕی تسێنسوری ڕۆژژمێر دەكەن. دەزگای سەرپەرشتیاری چاپەمەنی لەساڵی ١٩٣٧ دا (مەبەست لەسەردەمی نازیەكانە.....قوباد)، كاتێک سەرجەمی ژمارەی

چاپکراوی ڕۆژژمێری ئەڵمانی دەگاتە ٢٥ ملیۆن ژمارە، مەڵبەندێکی تایبەتی بەناوی «مەڵبەندی ڕاوێژکاریی ڕۆژژمـێـر» دادەمەزرێنێت. بۆنمونە جێگۆڕکێ لەوێدادەکەن کە لەڕۆژژمێرێکدا ڕۆژی ٢٠ ئەپریل وەکو ڕۆژی لەدایکبونی موحەمەد دیاریکراوە (لەم ڕۆژەدا منداڵان ناچنەوە قوتابخانە، بەڵام لێرەدا نەک لەبەرخاتری موحەمەد، بەڵکو لەبەرخاتری ڕۆژی لەدایکبونی فیورەر (هیتلەر) قوتابخانە دادەخرێ).

ڕۆڵـی ئـەم میدیایە لـە هاوسەنگکردنی ژیانی هاوبەشدا، بەڵام هەروەها لە بنیاتنان و چەسپاندنی لایەنەکانی دابونەریتدا تاکو ئەمڕۆش زۆرکـەم گرنگیی پـێدراوە. هەروەها ڕۆڵـی لە پێکهێنانی گروپدا، لەپێناوی ڕۆژمێری جوتیاران و کرێکاراندا، ڕۆژژمێری فەرمانبەران و مامۆستایان و کڵێساکان و ماسۆنیەکان، ڕاوچیان و ڕۆژژمێری فیمینیستان و زۆر جۆری تریشدا لەپێشبڕکێدایە.

هەرچی پەیوەندیی بەدەوریی ساڵانەوە هەیە، ئەوا «پێشبینیکردن» و «پیادەکردنی عەمەلی» یشی هەر لەگەڵ ئەو ڕیتمەدا دەگونجێنرا، پێشبینیکردنی ئەستێرەناسی بۆ ڕووداوێکی دیاریکراو یاخود بۆ ئەوساڵەی تیایدان. شۆتن لۆهەر لەهۆنینەوەیەکی نێوان دژدا وەکو «دەرکەوتنەوەی ساڵانەی نوسراوی ڕۆژانە» نیشانەی دەکات.

لەساڵی ١٥٨٨ ەوە ساڵانـە دووجـار لـە کۆڵن ڕۆژنـامـەی «پۆسترێما ڕێلاسیۆ هیستۆریکا» دەردەچوو، هەمووجارێک بەبۆنەی دانانەوەی بازاڕی کتێبی سـەرەتـای ساڵ و بـازاڕی پـایـزەوە. ئەم یەکەمین چاپکراوە کە بەخێرایی لاساییکەرەوەی بۆدروستبو، هەواڵ و دەنگوباسی لەهەمولایەکی ئەوروپاوە کۆدەکردەوە. ماوەکانی دەرکەوتنەوەی دەوریانە بەخێرایی کورتتربونەوە: تەنانەت توانراوە چاپکراوێکی مانگانە بۆساڵی ١٥٩٧ بسەلمێنرێت کە لە ڕۆڕشاخ لە بۆدن سی دەرچووە. لەسەرەتای سەدەی حەڤدەدا ئیدی یەکەمین ڕۆژنامە هەفتەییەکان دەرچوون. دووساڵی تەواو بەردەوام بون لەساڵی ١٦٠٩ ەوە: ڕۆژنامەی «ڕێلاسیۆن» لە شتراسبورگ وە ڕۆژنامەی «ئەڤیزۆ» لە ڤۆڵفن بوتڵ. تاکو ناوەڕاستی سەدە کورت بونەوەیەکی دیکەی دەرویی هاتەئاراوە: ساڵی ١٦٥٠ لە لایبزیگ بەدەرچوونی ڕۆژنامەی «ئاین کۆمندن تسایتونگن» یەکەمین ڕۆژنامەی ڕۆژانە دەرچووە. بەڵام لەڕاستیدا دەرچوونی ڕۆژانە تاکو سەدەی نۆزدە نەبوە بەبناغە. زۆربەی ڕۆژنامەکان زۆرجار لە هەفتەیەکدا چاپدەکران بەڵام نەک هەموو ڕۆژێک. لەلایەکی دیکەشەوە هەندێک لە ڕۆژنامەکان لەگەڵ پێشکەوتنی پیشەسازیدا ڕیتمی دەرچوونەوەیان بۆ دووجـار، سێجار وەتەنانەت چوارجار لەڕۆژێکدا زیادکردووە.

کە ساتەوەختی لەدایکبونی مۆدێرنە دەرکەوتنەوەی دەوریـانـەی لـەمـاوەی تەنها نزیکەی دوودەیـەدا چەسپاند، ئـەوە زۆر هـۆی هەیە: پەرەپێدان و پێشکەوتنی پۆست و ئاڵوگۆڕی هەواڵ، چاکترکردنی تەکنیکی چاپ، بەتایبەتی دامودەزگای چاپەمەنی ڕۆژنامەگەریی، پێشکەوتنی زانستە سروشتیەکان و کەڵەکەبونی ئەزمونی تاقیکراوە، زیادبونی چڕیی دانیشتوان، زیادبونی ژمارەی جۆرەکانی سەنعەت و ئیش و کار، بەرزبونەوەی ئاستی ژیان و زیادبونی سەرمایە، فـراوان بونی بازرگانی، هەموو ئەمانە پێکەوە هاتن. لەبەر هۆی سیاسی و ئابووری، هەمیشە خەڵکانی زیاتر پشتیان بەزانیاری خێراو بەردەوامو ئەمین دەبەست. شێوازی دەرچوونەوەی

دەوری، ئامێرێکی گرنگی پێشخستنی کۆمونیکەیشن بو.

## ٧.

لەکاتێکدا لەبڵاوکراوەکانی کاتە دیاریکراوەکەدا تەنها ناوبەناو هەبونی وەعی بۆکات دەردەکەوێت، ناوەرۆکی بڵاوکراوە دەوریەکان هەبونی وەعیەکی هەمیشە بەردەوام نوێنەرایەتی دەکەن. ئاراستەی دەوری بونەکە بەشێوەیەکی سەرەکی لەگەڵ دەورەی کاتە فەلەکیەکەدا گونجاوە: ساڵ، مانگ، ڕۆژ. ئەم پێوەرە کاتانە ئەنجامی جووڵەی تەنە ئاسمانیەکانن، ڕۆشنتر: هی زەمین و مانگ و ڕۆژ.

دەوری وەکــو ئاشـکرایـە بـەمـانـای بـازنـەیـی. بەشێوەیەکی سەرەکی لێرەدا بەریەککەوتنی کۆتایی و سەرەتایە و هەروەها پرینسیپی دووبارەبونەوە. هەبونی وەعی دەوریانە لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا باوی بوە. زۆرێک لەشێوازی هەلسوکەوت لەوێدا کراونەتە نەریت، ئەوانە «وەکو دووبارەکردنەوەی نمونەی کـرداری پێشاندراوی خوداکان وەیاخود کەسە پیرۆزەکان لەئەفسانەکانی چاخەکۆنەکاندا بینراون». لەبازنەی کولتوریی ئێمەدا هەبونی وەعی دەوریانە هەر زۆر زوو ڕکابەری بۆدروستبوو بەهۆی وێناکردنی ڕاستەوانەی کاتەوە Linear (ئەم جۆرە تێگەیشتنە لە کات لەوەوە سەرچاوەی گرتوە کە کات لەکاتێکی دیاریکراودا لەخاڵێکەوە دەستی پێکردووە و بـەردەوام بۆ پێشەوە دەڕوات تاکو ڕۆژێک لەڕۆژان دەگاتە خاڵی کۆتایی، بەپێچەوانەی ئـەمـەوە کاتی دەوریــی لەگەڵ گۆڕانکاریەکاندا دەستپێدەکاتەوە بۆنمونە هەموو ڕۆژێک بەیانیان، هەموو شەوێک، هەموو وەرزێک، هەموو ساڵێک......

قوباد). ئەم بابەتە بەتایبەتی بەهۆی بیرکردنەوە تێلێۆگیە یەهودیەکانەوە بڵاوبۆتەوە کە بەدانانی ئامانجێک بۆ مێژوو لەدینی مەسیحیەتدا درێژەی پێدراوە. ڕەگەکانی هەوڵی سێکولاریزم لە هەندێک لە کڵێشە مێژووییە فیلۆسۆفیەکاندا و تاکو هەوڵەکانی عەدالەتی کۆمەڵایەتی سەردەمانی تازە دەبینرێن. ئەم بیروبۆچوونە لەسەردەمی شۆڕشی زانستی- تەکنیکی- پیشەسازیدا بەتەواوی خۆی چەسپاند.

## ٨.

دیتسپلینی کـات وەکـو چاکەیەکی بۆرجوازیانە تەنانەت لەسەردەمی ڕاپەڕیندا زۆر بەتوندیی داواکــراوە «توندوتیژبە، هەرگیز دوانەکەویت لەپەیمان، ڕێکوپێک بە، لەکاردا چوستوچالاک بە، زیرەک بە لەئیشەکەی خۆتدا» نوسەر و ڕۆشنبیر کنیگە نوسیویەتی. وە پاشتر دەڵێ «هەمووکەس بەخۆشیەوە معامەلە و سەودا لەگەڵ کەسێکی دیدا دەکات ئەگەر متمانەی بەسەر ڕاستی بێت لەقسە و کردەوەدا».

تەنانەت «کات بەسەربردن»، بەمشێوەیە نوسینە مۆراڵیەکان چەسپاندویانە، کـات بەسەربردن پێویستە بەشێوەیەکی کەڵکدار و زیرەکانە ئەنجام بدرێت. مـرۆڤ نابێت هیچ کاتێک هیچ نەکات. «کاتەکە موڵکمە، کێڵگەکەم کاتە» گۆتە لە «دیوانە ڕۆژئاوا- ڕۆژهەڵاتی» یەکەیدا نوسیویەتی. لەلایەنی دیتسپلینی کاتەوە ئەو گوتەیە زۆر دوورنیە لەبەکارهێنانی توندی کاتەوە. «Remember time is money» بێنیامین فرانکلین ساڵی ١٧٤٨ لەبەرهەمەکەی خۆیدا «Adviee to a young tradesman» بناغەی گۆڕینەوە

کلاسیکیەکەی سەردەمی پیشەسازیی هۆنیوەتەوە. فابریک وەکو شێوازێکی ڕێکخستنی تازەی کار، ئامێر وەکو هۆیەکی بەرهەمهێنانی گرنگ، هەردووکیان پێویستیان بەهاوجووتیەکی توندوتیژ هەیە. ئەم پرۆگرامی پەروەردەکردنە بەکۆمەڵە بەزۆر بچەسپێندرێت، ئەوە هەرتەنها ئەرکی سەرەکی زانستی پەروەردە نەبو، بەڵکو هی زانستی ڕۆژنامەگەریی سەدەی ڕابوردووش بو. وە ئەمەش بەمانای بەجەماوەری کردنی وەعی ڕاستەوانەی کات «Linear»، وێناکردنی کاتێک کە گێرهارد شمید بەسیفەتەکانی «گونجاو لەگەڵ یەک»، «جۆریی (نەوعی)»، وە «بێ کۆتایی قابیلی لەتکردن» وەسفی دەکات.

«گۆڤاری پفێنیگ ی کۆمەڵ بۆبڵاوکردنەوەی زانیاری بەکەڵکی هاوبەش» نمونەیەکی سەرەتایی ڕۆژنامەگەریی (ماس میدیا) کە بەخێرایی سەرکەوتنی گەورەی ژمارەی چاپی بەدەستهێنا، لەیەکەمین ژمارەی خۆیدا ڕۆژی ٤ مای ١٨٣٣. بەجارێک دووگوتاری دەربارەی کات و ڕێکوپێکی و دوانەکەوتن بڵاوکردۆتەوە. یەکەمیان بەمشێوەیە دەستپێدەکات: «هەرکەس بیەوێت سەرکەوتن و پێشکەوتن لەژیاندا بەدەستبهێنێت، ئەوا پێویستە لەسەری بزانێت حەکیمانە کات بەکاربهێنێت. هەرکەس زووتر لەخەوهەستێت وەک لەوانی دی، ئەوا ئەوکەسە تەندروستی و بەختەوەریی چنگ دەکەوێت. سەعاتێک زووتر جێگای خەوتن جێبهێڵێت، ئەوە مانای ساڵانە ١٥ ڕۆژ و ٥ سەعات قازانج دەگەێنێت. ئەگەر ئەو ڕۆژانە ڕۆژانی کارکردن بن، ئەوا قازانجێکی زۆرمان بەسەر خەوتوەکانی ناوجێگادا دەستکەوتوە، چونکە کات بۆئیشکردن دانراوە، پێویستە بۆشتی بەکەڵک بەکاربهێنرێت، هەرکەس هەموو سەعاتێک ژیرانە بەکاربهێنێت، ئەوە بەختەوەری و خۆشی و شادیی دەستدەکەوێت».

ئێتیکی کار و ئابووریی دادپەروەرانەی کالڤینیانەی - پیتیستیانە لەمیدیادا دەنگی جەماوەریانەی خۆی بینیەوە (کالڤینی بزوتنەوەیەکی ئاینی ریفۆرمخوازبوو بەپێی بیرەکانی یۆهانێس کالڤین کە کاریگەریی زۆری لەسەر کەنیسەی ئەورووپی و ئەمریکی جێهێشت. پیتیستی، گرنگترین بزوتنەوەی ریفۆرمخوازی پرۆتستانتی سەرجەمی ئەورووپا.......قوباد). هەربەم بۆنەیەوە نەک تەنها لە کەپیتالیزمدا، بەڵکو هەروەها لە کۆمونیزمیشدا. کەمێک پاش شۆڕشی ئۆکتۆبەر لەهەموو شارەکانی سۆڤێتدا جۆرێک لە گروپی کات زانان دروستبو، کە ئەندامەکانی بەکارهێنانی ژیرانەی کاتیان بۆخۆیان کردبوە ئامانج و پێویست بو لەسەریان پلان دانان و بەکارهێنانی کات زۆر بەتەواوی بنوسنەوە، ڕۆژنامەکان ستونێکی تایبەتیان بۆدیاریکرا بەناوی «تێکۆشان لەپێناو کاتدا».

«سەعات نەک ئامێری هەڵمیی، سویچی سەردەمی پیشەسازیی مۆدێرنە» بەم شێوەیە لویس مومفۆرد وەسفی دەکات. مێژووی پێوانی کات هەمیشە مەیلێکی زیاتر بۆ پێوانێکی ووردتر پیشاندەدات. سەرەتا کات وەکو ئەنجامی ڕووداوەکان لێکدەدرایەوە و بەپێی چالاکیە کۆمەڵایەتیەکان دیاری دەکرا. ئامێرە پێوانە کۆنەکان ڕۆژ و ئاو و سەعاتی لمی بریتین لە زمانحاڵی تێگەیشتنێکی شێوە تێپەڕبونی کات. بەپەرەپێدانی سەعاتی میل لە کۆتایی چاخەکانی ناوەڕاستدا، هەڵگەڕانەوەیەکی تازە ڕوویدا: کات ئێستا دەبێتە شتێکی موجەڕەد، میکانیکیانە دەتوانرێت

هەڵوەشێنرێت لەبەشی بچووکی هاوسەنگی یەکدیدا. سەعاتە سەرەتاییەکان تەنها سەعاتیان ژماردووە، بەڵام سویفت (یۆناتان سویفت نوسەر و قەشە و سیاسی ئیرلەندی، بەناوبانگترین چیرۆکی بریتیە لە سەفەرەکانی گولیڤەر.......قوباد) لەساڵی ١٧٢٦ دا گولیڤەرەکەی خۆی لەیەکێک لەسەفەرەکانیدا بەسەعاتێکەوە ڕەوانــەدەکــات کــە دەقیقەش دەژمێرێت، جا چونکە ئەویش بەردەوام سەعاتەکە دەردەهێنێت و سەیری دەکات، خەڵکەکەی دوورگەی لیلی پوت وادەزانن ئەوە خوداکەی گولیڤەرە. ئێمە پەرەسەندنەکانی پاشتریش دەزانین: سەعاتەکانمان ئیدی ئێستا چرکە و دەیەکی چرکەش دەخوێننەوە. لە وەرزشی خلیسکانی سەربەفر و پێشبڕکێی ئەسپدا سەدیەک و هەزاریەکی چرکەیەک پێوەری بردنەوەن. بەهۆی مێتۆدەکانی سپێکترۆمێتری، و ئۆسیللۆگرفی یەوە میکرۆ و نانۆ و پیکۆی چرکەیەکیش دەپێورێن (لــێــرەوە دەچینە خــانــەی ملیۆن و ملیاردی چــرکــەیــەکــەوە و تەنانەت بــچــووکــتــریــش....... قوباد). هەروەکو ڕۆژنامەگەریی کە پێوەری کاتی کۆمەڵایەتیە، هــەر بەوشێوەیەش پێوەرە کاتە میکانیکیەکە سەعات، لەسەدەی نۆزدەدا لەناو زۆربەی بازنە کۆمەڵایەتیەکانی کۆمەڵگادا بڵاوبۆوە. سەرەتا وەکو موڵکی گشتی لەشێوەی سەعاتی شارەوانی و سەعاتی کەنیسەدا، پاشان وەکو سەعاتی ماڵ و هەڵواسین و سەعاتی گیرفان وەکو شتێکی نایاب و بەناوبانگ بۆ دەوڵەمەندەکان، لەئەنجامیشدا سەدەی ڕابــوردوو نزیکەی بۆ هەموو کەسێک سەعاتێکی عەمەلی و هــەرزانــی هێنایەبەرهەم. پێویستی، بەرهەمهێنان دروســتــدەکــات، نزیکەی هەروەکو ڕۆژنامەگەریی جەماوەریی.

لەگەڵ بەرزبونەوەی یەکجارزۆری بەرهەمهێناندا، پێویستی گواستنەوە و هۆیەکانی کۆمونیکەیشنیش بــەرزبــونــەوە. لەژێر چەمکی «کۆمونیکەیشن» دا لەوسەردەمەدا لەفەرهەنگەکاندا وەکــو مانای یەکەمی ووشــەکــە زۆربــەی جــار «هــات و چۆ» دانراوە. شەمەندەفەر و بەلەمی هەڵمی گواستنەوەی کەلوپەل، گەیاندنی دەنگوباسیان خێراترکرد، کە بەوهۆیەوە ئەوی دواییان بەهۆی تێلێگرافی کارەبایی و تەلەفۆنەوە بازێکی گەورەتریشی دا. ئەوە ڕێککەوت نیە کە سیمبۆلە تەکنیکیەکانی سەردەمە تازەکە لە شادێڕی گۆڤارە بەناوبانگەکاندا بەردەوام سەریان هــەڵــداوەتــەوە: «بەلەمی هەڵمیی ڤێستفالی»، «شــەمــەنــدەفــەری لایــبــزیــگ»، «تێلێگراف بۆ ئەڵمانیا».

خێرابونی هاتوچۆی هەواڵ و دەنگوباس پێکەوە لــەگــەڵ شــێــوازە تــازەکــانــی بەرهەمهێنان بە ئیکسیلۆگرافی (هەڵکۆڵینی تەختە و بەکارهێنانی لەبواری چاپدا......قوباد)، شێوازی چاپی تازە، ئامێری چاپی نیوە ئۆتۆماتیکی هەڵمی، بونە هۆی بەرزبونەوەی بەرهەمی جۆریی لە کۆمونیکەیشنی میدیادا. کۆنترین ڕۆژنامەی هەواڵ کەتیایدا ناوی «ڕۆژنامەی تازە» هاتوە، ڕاپۆرتێکی تێدا هەیە لەسەر داگیرکردنەوەی دوورگەی لێس بۆس لەلایەن ڤێنیسیاییەکان و فەرەنسیەکانەوە کەئەوکاتە ساڵێکی بەسەردا تێپەڕیبو. بەدامەزراندنی ڕۆژنامەی دەوریی، تێگەیشتن دەربارەی ئەکتوێل بون هەمیشە زیاتر بەئاڕاستەی مــاوەی دووبــارە دەرکەوتنەوە گــۆڕانــی بــەســەرداهــات. وێنەیەکی هونەرمەندی شێوەکار و کاریکاتێریست داومیر، ئافرەتێکی فــرۆشــیــاری ڕۆژنــامــە پــیــشــانــدەدات کــە ژمــارەی

ڕۆژنامەیەک بەڕێبوارێک دەفرۆشێت. ئەویشیان بێزاریی دەردەبڕێت: «من ڕۆژنامەکەتم کڕیوە، بەڵام هیچ هەواڵێکی تازەی ئەمڕۆی تێدا نادۆزمەوە. فرۆشیارەکەش وەڵامدەداتەوە :گەورەم، هەواڵەکانی ئەمڕۆ لەرۆژنامەکەی دوێنێدا بون».

«جۆرنالیزم بەگشتی، لە بەشە جۆراوجۆرەکانیدا و لە ئۆرگانە هەمەچەشنە یەکدی تەواوکەرەکانیدا وادەردەکەوێت لەگەڵ خۆی قسەبکات و بەوشێوەیە کات بەسەربەرێت» ڕۆبێرت ئێدوارد پروتس ساڵی ١٨٤٥ لەبەرهەمەکەی خۆیدا «مێژووی جۆرنالیزمی ئەڵمانی» نوسیویەتی. «ئەوە ڕەخنە لەخۆگرتنێکی ڕۆژانەیە کە کات دەکاتە قوربانی ناوەرۆکەکەی خـۆی، بەوێنەی یاداشتی ڕۆژانـە کە تیایدا کات مێژووە بەردەوامەکەی خۆی لەنوسینی ڕاستەوخۆی چرکەساتدا دەنوسێتەوە».

«ئێستا ئیدی هەربەتەنها ئەم چرکەساتەی ئێستا، ئەو کۆڵانە تەسکەی نێوان پاشەڕۆژ و ڕابـوردوو، بواری گوتاری میدیا ئەکتوێلەکان نیە. ئەوانە زۆرزیاتر بونەتە شانۆیەک کە لەسەری بەبەردەوامی ڕابوردوو دەکرێتەوە بەئێستا، نزیکەی بەوێنەی هاتنەوەی یـادی بۆنەکان، جەژنە ئاینی و دونیاییەکان، هەروەها لەیادەوەریە ساڵانەکاندا کە هیچ ڕۆژێک بێ ئەوانە تێناپەڕێت. هەروەها یادەوەریی کاتە خۆشە ڕابوردووەکان و مۆدە بەسەرچووەکان لێرەدا هۆی گواستنەوەی خۆیان دەبیننەوە: دووبارە دۆزینەوەی (یوگندستایل) ی ساڵی بیستەکان، ساڵی پەنجاکان (یوگندستایل ڕێبازێکی هونەری بو لە سەرەتای سەدەی بیستەوە تاکو کۆتایی جەنگی جیهانی دووهەم لەئەوروپا و ئەمریکا بەردەوامبوو جێگادەستی خۆی لەسەرهەموو بوارەکانی ژیان جێهێشت، گوستاف

کلیمت یەکێک بو لە نوێنەرەکانی.....قوباد) لەم ماوەیەدا ئێمە گەیشتینەوە چاخەکانی ناوەڕاست. چرکەساتی ئێستا، تەنها لەتەلەفزیۆنەوە دەناسم، دەربارەی چاخەکانی ناوەڕاست زانیاری دەستی یەکم هەیە» ئومبێرتۆ ئێکۆ ڕوونی دەکاتەوە.

بەهەمان شێوەی ڕابوردوو لەبیرەوەریدا، پاشەڕۆژیش لەپێشبینیدا ئامادەی چرکەساتی ئێستا دەکرێت. کـەواتـە ڕۆژنـامـەکـان و گـۆڤـارەکـان، ڕادیـۆ و تەلەفزیۆنەکان، هەروەها پاشەڕۆژیش لەزانیاریەکانیان و ئاماژەکانیاندا دەگوێزنەوە و دەگوێزنەوە، کەتیایدا ئەمڕۆ جیاواز وەک لە «مەزەنەوپێشبینی» و «کـردەوە و پیادەکردن» ی سەرەتای سەردەمە تازەکە، زیاتر ڕوودەکـەنـە زانستی فوتورۆلۆگی (زانستی لێکدانەوە و پێشبینیکردنی پاشەڕۆژ...... قوباد) وەک لەزانستی ئەسترۆلۆگی «زانستی فەلەک نـاسـی.....قـوبـاد». تایبەتمەندیەکانی شێوازی پێوانی کات لەلایەن لێکۆڵینەوەی میدیاوە تاکو ئێستا زۆرکەم سەرنجیان دراوەتێ بەهەمان شێوەی جیاوازیی دووریـە مێژووییەکانی هەریەکێک لە گۆشەنیگاکانی کات و ئاسۆکانی کات. لەکاتێکدا کە تاکو سەردەمی ڕاپەڕین، ئاسۆی کات تەنها ٦٠٠٠ ساڵ بو، ئەمڕۆ مەزەنەی دووریـی کاتی مێژووی زەمین بە ٤،٥ ملیارد ساڵ دەکرێت.

تەنانەت پێشتر پروتس ئـەوەی هەستپێکردووە کە «چرکەساتی هەمانکات (هەمانکاتی ڕووداو) یاخود بەلایەنی کەمەوە نزیکبونەوە لەچرکەساتی هەمانکات» لەناو خودی چەمکی ڕۆژنامەدا بوونی هەیە. لەگەڵ سەرهەڵدانی تێلی میدیای تازەدا، ڕادیۆ و تەلەفزیۆن کە وەکو میدیای خێرا و هەروەها میدیای تاخۆ Tacho-Medien ش دەتوانرێت

ناوبنرێن، لەسەرەتای ئەم سەدەیەمانەوە چرکەساتی هەمانکات بەدیهاتووە. بەم هۆیەشەوە لەسەر و کاری دەوریشەوە دووریەکی تازەی دی سەریهەڵدا: هەمانکاتی ڕووداوەکان (Simultaneität) .

### .٩

یەکێک لەو یاسا کەمانەی زانستی کۆمونیکەشن کە هەموان لەسەری کۆکن دەڵێت: میدیا تازەکان، کۆنەکان ناسڕنەوە، بەڵکو - تارادەیەک بەوەرگرتنی هەندێک لەکارەکانیان - تەواوتریان دەکەن. ئەم یاسای تەواوکردنە دەشتوانرێت بۆ ستراکتورە کاتیەکانیش بەکاربهێنرێت: نوسراوە مانگانەییەکان، ڕۆژژمێری ساڵانەیان نەسڕیەوە، ڕۆژنامە ڕۆژانەییەکان، هەفتانەییەکانیان نەسڕیەوە، ڕادیۆ و تەلەفزیۆن ڕۆژنامەگەرییان لەناونەبرد. گشتی تر بیهۆنینەوە: میدیا دەوریەکان، میدیای ڕووداوە تایبەتیە ئەکتوێلەکانیان نەسڕیەوە، میدیا ئەکتوێلەکان، دەوریەکانیان لەناونەبرد. ئەم یاسای تەواوکردنە هەروەها هەبونی وەعی کاتیش دەگرێتەوە: کاتی بازنەیی، کاتی ناوبەناو، و کاتی ڕاستەوانەش Linear، کاتی بازنەیی تەواوتردەکەن.

لە گروپە کۆمەڵایەتیە جیاوازەکاندا و لە پلەجیاوازەکانی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتیدا پەیوەندیی تێکەڵاوبونی ئاڕاستەی پێچەوانەی یەکدی هەستیان پێدەکرێ. لەبازنەی کولتوریی ئێمەدا وەعی کاتی ڕاستەوانە Linear باڵادەستە. ئەو میدیا چرکەساتانەی Simultan Medien کە ڕۆڵی ئەو وەعیە بەشێوەیەکی تایبەتی وازی دەکەن، هەروەها بەوهۆیەشەوە کات پێدەری کۆمەڵایەتین کە بناغەی تێپەڕینی ڕۆژ دادەنێن و زانیاریەکان دەدەنەوە و ڕیزبەنددەکەن.

نزیکەی شەش سەعات هاوڵاتیەکی ئەڵمانی بەڕێژە هەمووڕۆژێک ڕووەکاتە ماس میدیا. پشکی شێر، واتە سێ چارەکی کاتەکە بەر میدیا ئەلکترۆنیەکان دەکەوێت، و چارەکێکیش بەر چاپەمەنیەکان. ئێمە زیاد لە دوو سەعات ڕۆژانە سەیری تەلەفزیۆن دەکەین و زیاد لە دوو سەعاتیش گوێ لە ڕادیۆ دەگرین. ئەم پێوانانە بریتین لەپێوانی ڕێژەیی. لەڕاسیشدا: ئاستی بڵاویی ئەو میدیا ئەکتوێلانە بۆ هەر یەکێکیان ڕێژەی ٧٠ و ٨٠ لەسەدایە. کەواتە ژمارەی تاکە میدیاکانی دی بچووکە.

«Time is mony» نەک هەر تەنها سەرمایەدارەکان، بەڵکو هەروەها کرێکارەکانیش ئەو بناغە سەرەکیەی کۆمەڵگای پیشەسازی بەخێرایی تێگەیشتون. بەرزکردنەوەی موچە یاخود کەمکردنەوەی ماوەی کار، تاکو ئێستاش ئەمە هەر پرسیارە سەرەکیە بنەڕەتیەکەیە لەکاتی دانوستانەکاندا. هەردوولایەنەکە دەتوانرێت تەواو لەبری یەک دابنرێن. دامودەزگا میدیاییەکان هەمیشە وەکو لایەنێکی نادیار لەسەر مێزی دانوستانەکان ئامادەن. ئەوانە لەهەمووحاڵێکدا لایەنە سێهەمە خۆشحاڵەکەن: یان بودجەی ماددیان زیاددەکات و یاخود هی کات یان، و هەندێکجار هەردووکیان زیاددەکەن. بەهەرحاڵ کاتی کاری ڕاستەقینەی ساڵانە لەساڵی ١٩٥٠ وە نزیکەی ٣٠ لەسەدا کەمیکردووە، کاتی بێئیشی و ماوەی ڕووکردنە میدیا بەشێوەیەکی بەرچاو و گەورە زیادیان کردووە. ئەگەر مرۆڤ کاتی بەکارهێنان سەرجەم کۆبکاتەوە، ئەوا هاووڵاتیەکی نێرینەی ئاسایی نزیکەی حەڤدە ساڵ و نیوی ژیانی خۆی لەبەردەم میدیا ئەلکترۆنیەکان و یاخود

لەسەر چاپەمەنیەکان بەسەردەبات. ئافرەتان لەسەر بناغەی درێژی زیاتری ژیانیان هێشتا ساڵ و نیوێک زیاتر بەکارهێنان و چێژوەرگرتنیان پێدەبڕێت.
لە وڵاتە پیشەسازیەکاندا زۆر بەتایبەتی تەلەفزیۆن بۆتە هەڵلوشەرێکی گەورەی کات. نزیکەی چارەکێکی هاووڵاتیان دەکەونە ئەو خانەیەوە کە پێی دەگوترێت زۆرتەماشاکەر: لای ئێمە (مەبەست ئەڵمانیایە...... قوباد) ئەم گروپە ڕۆژانە زیاد لە سێ سەعات سەیری تەلەفزیۆن دەکات، لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا زیاد لە چوار سەعاتە، لە یابان ژمارەکە هێشتا زیاتریشە. تەنانەت لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ڕێکخراوێک دروستکراوە کە تەلەفزیۆن بۆخۆی دەکاتە بەرنامەی ژیان. گۆڤارێکی جەماوەریی بەم شێوەیە وێنایان دەکات :«خوداکەیان شاشەی تەلەفزیۆنەکەیە، ئیڤانگیلیەکەیان (بەرنامەی مەسیحیەت) گۆڤاری بەرنامەکانی تەلەفزیۆنە، دوعا و نزاکەیان گۆرانیەکەی سەرەتای بەرنامەکەی بووکە قەرەقۆزەکانە Muppets- Show. گروپی Couch Potatoes - کەخۆیان واناوناوە - ئەمانە سێکتێکی ئەمریکین کە تەلەفزیۆنیان بۆخۆیان کردووە بە ئایین. تاکو ئێستا دە هەزار ئەندامیان هەیە، هەریەکێکیان پێویستە لەسەری ڕۆژانە دەسەعات لەبەردەم ئەو بتەدا دابنیشێت. چرکەساتی ئەکتوێل بون لێرەدا گرنگیەکی تایبەتی هەیە: لای گروپەکەی Couch Potatoes هەمیشە و بەردەوام چەندین ئامێری تەلەفزیۆن لەیەککاتدا داگیرساون و لەسەر چەندین پرۆگرامی جیاوازدانراون.

.١٠

ماس میدیا بەم شێوەیە نەک هەر تەنها بخۆری کاتن، بەڵکو پێوەری کاتیشن. بەدەرکەوتنەوە زەمەنیە جیاوازەکانیان بناغەی ساڵ و مانگ و هەفتە دادەنێن. ڕۆژی یەکشەممە «ڕۆژی مێزگرد» یاخود بەواتایەکی دی «پرێسەکلوب» ە، دووشەممە هی «شپیگڵ» ە، سیشەممە ڕۆژی «دالاس» ە، چوارشەممە ڕۆژی «دێنفەر» ە، پێنجشەممە ڕۆژی «تسایت» ە وەرۆژانی هەینی مرۆڤ بەبێ مەرج پێویست نیە لەسەری «ڕاپۆرتی زانستی» لەڕادیۆی بایەرن گوێ لێبگرێت (ئەمانە هەندێکیان ناوی تەمسیلی هەڵقەیی و هەندێکیشیان بەرنامەی قسەومشومڕن.....قوباد). لەکۆتایی ساڵدا تەلەفزیۆن ڕاستەوخۆ گوتەی ساڵی تازەی سەرۆک وەزیران دەگوێزێتەوە. دووبارەکردنەوە دەوریە بەزۆرەکان تەنها کاتێک لامان ئاشکرادەبن، ئەگەر کارمەندێکی تەکنیکی لەئەنجامدا کاسێتەکە بگۆڕێت.

هەروەها بچووکترین دەورەی فەلەکیی، ڕۆژ، لەلایەن ڕووکردنە میدیاوە بناغەی دادەنرێت. ڕادیۆ، کە بۆ بڵاوکردنەوەی دەنگوباسەکانی خۆی، ڕیتمی سەرەسەعاتەکان بەچاک دەزانێت، بەتایبەتی میدیایەکی بەیانیانە، زۆرترین ژمارەی گوێگرانی لە بەیانیان زوودایە نزیکەی سەعات ٧ و پاشان ژمارەکە هێواش هێواش کەمدەبێتەوە. لای ڕۆژنامەی ڕۆژانە کە وەکو میدیایەکی خەزنکردن بەخێرایی لەبەردەستدایە، هێڵە بەیانیەکەی ڕاستتر دەڕوات، بەڵام هەروەها مرۆڤ دەتوانێت زیاتر وەکو میدیایەکی پێش نیوەڕۆیان سەیری بکات. تەواو جیاوازتر تەلەفزیۆنە، میدیا ئێوارانە نمونەییەکە. سەعات ١٨، سەعات ١٩، وەسەعات ٢٠ هەرجارە و ژمارەی بینەرانی دووقات زیاددەکات، تاکو

کەمێک پاش سەعات ٢٠ نزیکەی ٥٥ لەسەدای کۆمەڵگا لەتەمەن ١٤ساڵانەوە دەگرێتەوە. کاتە کلاسیکیەکەی سەردەمی کولتوری بەرز: سەردەمی شانۆ، سەردەمی کۆنسێرتی مۆسیقا و وانەی زانکۆی کراوە بۆ هەمووکەس، ئێستا لەلایەن تەلەفزیۆنەوە داگیرکراوە.

نیکلاس لوهمان لە نەریتی سەردەمی ڕاپەڕیندا یەکێک لەکارە سەرەکیەکانی ماس میدیا دەبینێتەوە. ناسینەوە و دەستنیشانکردنەکانی، لەچۆنیەتی مەزەندەکردنی سلوکی هاوبەشدا تەواوتر دەردەکەون. لەسەر ئەو بناغەیە سلوکێک ئەوەندە عقلانیە، ئەگەر لە کتێبە تازەکانی سلوکدا (ئەم جۆرە کتێبە دەربارەی پەروەردە و فێرکردن لەساڵەکانی ١٥٣٠ ەوە لەئەوروپا تائەمڕۆش دەردەچن.....قوباد) ئەوە بەکەم ڕێزیی بدرێتە قەڵەم ئەگەربێت و لە ساتەوەختی دەستپێکردنی هەواڵ و دەنگوباسەکانی ئێوارەدا تەلەفۆن بۆکەسێکی دی بکەیت.

چەندین لێکۆڵینەوە لەچەندین وڵاتدا دەریانخستوە کە لەکاتی مانگرتنی ڕۆژنامەکاندا بەتایبەتی دیارنەمانی ئەم میدیایە لەکاتە ئاساییەکەی خۆیدا جێگای دڵتەنگیە.

ڕاهاتن و بونەنەریتی بەکارهێنانی میدیا لێرەدا بەئاشکرا دەردەکەوێت. وەکو گونجانێک (هاوجووتی) بۆڕێکخستنی کاتی کار، هەروەها کاتی بێ ئیشیش بناغەی دارێـژراوە، و بەرهەمە میدیاییەکان تیایدا کاتێکی سەرەکی داگیردەکەن.

وەرگرتنە هەستیەکان، میدیا وێنەیی و، وێنەیی و دەنگیەکان بەخێراییەکی یەکجار گەورە شوێن (مکان) دەبڕن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەشێوەیەکی تایبەتی پەیوەستی کاتن. هەرچەندە بەهۆی ئامێری خەزنکردنەوە وەکو کاسێتی دەنگیی یاخود ڤیدیۆرێکۆردەرەوە جۆرێک لەسەربەستی لەکاتی ناردنەکانەوە بەدەست دەهێنرێت. ئـەوە بەڵام تەنها سەرەتای کاتەکە دەگرێتەوە، نەک خێرایی بەردەوامیەکەی. کاتی درێژایی وەرگرتنەکە لەدەستی کەسانی دیدایە. لەبەرئەوە چەند ووشەیەکیش دەربـارەی لایەنی کاتی ڕێکخستنەکانی نـاوەوەی ماس‌میدیا.

## ١١.

کاتە پێشکەشکراوەکە تەنها لەکاتی گواستنەوەی ڕاستەوخۆدا یەکسانە بەکاتی ڕووداوەکـە. زۆربەی جار بەڵام (کاتە حەقیقی) یە پێوراوە میکانیکیەکە لەمیدیادا دەگۆڕێت. ئەوە بەهۆی کشاندنی کاتەوە دێتەئاراوە. بۆ نمونە ئەگەر کارلێکردنێکی خێرای فیزیاوی یـان کیمیاوی درێژبکرێتەوە بۆئەوەی بتوانرێت بەهۆی بینینی چاوەوە هەستیپێبکرێت. بەڵام زیاتر لەوە پیشاندانە خێراکراوەکانە. ئەمە هەروەها میدیا چاپەمەنیەکانیش دەگرێتەوە: لە ڕۆژنامەکان و گۆڤارەکاندا فۆرمی پیشاندانەوە و گوتنەوە باڵادەستیان هەیە کە ڕووداوە گەیێنراوەکان زۆر چڕدەکەنەوە. تەنانەت لەو جێگایانەشدا کە گەورەیی چوارچێوەی بابەتەکە هیچ ڕۆڵێکی گرنگ وازی نەکات، لەکتێبدا پرینسیپی پیشاندانەوەی خێرا باڵادەستە. کاتی باسکراو بەگشتی یەکجار زۆر لەباسکردنی کاتەکە زیاترە. بەوشێوەیە چیرۆکێکی شیعریی کۆن مـاوەی ساڵێک دەگرێتەخۆی، بە پێچەوانەشەوە ڕۆمانێکی بەسەرهاتی پاڵەوانێک زۆربەی جار سەرجەمی ژیانێک لە لەدایکبونەوە تاکو مردن دەگرێتەوە.

کاتە خێراکەی سەردەمی پیشەسازیی هەروەها لەهونەرەکانیشدا ڕەنگی داوەتـەوە. لە میدیای پێشکەش کردنەکاندا ئەم پەرەسەندنە لە شانۆوە دەستیپێکرد. هەستی کاتە تازەکە لە هارمۆنیکردنی خێرای سەر شانۆدا خۆی دەرخست، لە قسەکردن و نواندنی خێراتردا، لە بەڕیتمکردنی جوولە و گۆڕانەکاندا. بۆ میدیای تازەی سینەماتۆگرافی (سینەما) ئیدی خێرایی بوە یەکێک لە پێکهاتە جوانیەکانی. بەتایبەتی تەکنیکی مۆنتاژ هەستێکی گۆڕدراوی شوێن - کات بەرهەمدەهێنێت کە تیایدا «خێرایی نواندنەکە لە ئەکتەرەوە بۆناو ستراکتوری فیلمەکە» دەگوێزرێتەوە. فیلم و تەلەفزیۆن دەکەونە ناو یاسای جوولەوە و لە هەموو میدیایەکی دی باشتر خێرایی گەورەی کۆمەڵگای پیشەسازیی ڕەنگدەدەنەوە. گۆڕینی ڕاچڵەکینەخێراکان بەهۆی بازدانی شوێن - کات ەوە، گۆڕینی ئاڕاستەی یەک لەدوایەکی کتوپڕ، جوولەی کامێرا و زووم، لە وێنەیەکەوە بۆ وێنەیەکی دی پێچەوانە، لە سەرجەمەوە بۆ پارچە، ئەمانە هەموو هەستێکی هارمۆنیانەی مەزن دەگەیێنن. زانستی ئێستاتیکی نوێ داوای شێوازی وەعیەکی تـازە لە جمهور دەکات.

ئـەو هەستەی هیچ کاتێکت نەبێت، هـەر تەنها ڕەخنەی ڕەخنەگرانی کولتور نیە لە ئێمە کە پەلەکردنی بەردەوام و پەیوەست بون بە پیشاندەری کات و ئامێرەکانی کاتەوە تەنز ئامێز مەحکوم دەکـەن، بەڵکو ئەوە بەلێکۆڵینەوەی ئەزموونیش سەلمێنراوە. پەیمانگای ئەلنسباخەر بۆلێکۆڵینەوەی بیروڕای گشتی لە یانواری ساڵی ١٩٨٣ دا بەشێوازی زانستیی هەڵبژاردنی نوێنەرایەتی کۆمەڵگا، پرسیاری هەستکردنیان بۆ کات لە ئەنجامدەرانی تاقیکردنەوەکە کردووە. بەشی هەرەزۆریان بروایان وابوە کە کات بەگوژم تێدەپەڕێت و هەموو شتێکیش بە هەمان شێوە زۆر بەخێرایی دەگۆڕێت، لەهەمانکاتیشدا هیوایان بە گۆڕانی هێواشتر خواستوە.

ئـەوەش بۆ من ڕێکەوت نیە کە پڕفرۆشترین گـۆڤـاری تـازەی «هـاوچـەرخ» نـاوی «تێمپۆ - خێرایی» ی هەڵگرتووە. پاش پوکانەوەی زۆربـەی بیروڕاکان لەسەر شێوازی پێشکەوتن، بەشێوەیەکی بەرچاو زۆرتر هەوڵدەدرێت کلێشەی کاتی پێچەوانە پڕوپاگەندەی بۆبکرێت: بۆنمونە کاتی وەستاوی حاڵەتی تەرکیزکردن کە لە ئاینە ئاسیاویەکاندا هەیە، یاخود دۆزینەوەیەکی تازەی هێواشیی وەکو پرۆگرامێکی جوانیی. لەڕۆمانی نادۆلنیس دا جۆن فرانکلین بەهۆی هێواشیەوە هەوڵی وروژاندنی (ئیستیفزاز) ی چواردەورەکەی خۆی دەدات. لەبەرهەمهێنانی درامای بینین و بیستندا، مرۆڤ ناتوانێت وروژاندنێکی گەورەتر بیرلێبکاتەوە بێجگەلە فیلمەکەی ئەندی وارهۆڵز (Sleep) کە بەدرێژایی شەش سەعات هیچ شتێکی دی پیشان نـادات بێجگەلە پیاوێکی نوستو.

## ١٢.

بەپێی بناغەکانی ڕەوانبێژیی ئەکادیمیانە، پێویستە مرۆڤ وانەیەک بە هێنانەوەی گوتەی ناوداڕێک

یاخود بە کورتەی باسەکە کۆتایی بهێنێت. جا چونکە منیش بە گوتەی ناوداریک دەستم پێکرد، ئێستا کورتەی باسەکەم پێ باشترە.
سەرەتا تەنها فیزیک بو، ئەم ڕستەیە مامۆستایەکی فیزیای کۆنی خۆمم بیردەخاتەوە. بەردەوام لەوانەکانی خۆیدا دووبارەی دەکردەوە: با وای دابنێین هەوڵەکەمان بۆ سەلماندن سەرکەوتوبو، ئایا چی دەبینین؟ (مەبەست لەو ڕستەیە ڕەخنەیەکی ناواخنداره لە یەکەمین ڕستەکانی ئاینی مەسیحی بە ناڕاستەوخۆ کە دەڵێت سەرەتا تەنها وشە بو، ئەویش لای خودا بو......قوباد).
بەڵێ ئایا چی دەبینین؟ دەبینین کە بەسەرچوونی کات و وەعی بۆ کات پێکەوە سەرجەمێک پێکدەهێنن. بۆ حاڵەتی کۆمەڵایەتی کات، ماس میدیا ڕۆڵێکی بنەڕەتی دەبینن، لەڕاستیدا لەزۆر لایەنەوە: پرۆسێسی کۆمونیکەشنی کۆمەڵایەتی هاوسەنگ و جووت دەکەن کەتیایدا لە چەندین بەشی بەدوایەکدا هاتوودا بەردەوام زانیاری و لێکدانەوەی تازەتر پێشکەش دەکەن. ماوەکانی نێوان بەشەکان بەردەوام زیاتر و زیاتر کورتتردەبنەوە. لەولەبێکی کۆمونیکەیشن کە کەوانەکانی هەمیشە تەسکتردەبنەوە. میدیاکان بناغەی ژیانی ڕۆژانە دادەڕێژن، پرۆگرامە پێشکەشکراوەکانیان تۆڕێکی بناغەی کاتیی بەسەر یەکە ڕۆژژمێریەکاندا دادەنێن. لەکۆتاییشدا نەک هەر تەنها بەهۆی زانیاریە خێرا گۆڕدراوەکانیانەوە، بەڵکو هەروەها بەهۆی شێوازی پێشکەشکردنەکانیانەوە وێنەیەکی خێرایی کۆمەڵایەتی دەگەێنن.

**لەم سەرچاوەیەوە وەرگێردراوە:**

Walter Hömberg. Zeit. Zeitung. Z eitbewustsein. Studienbücher zur Publizistik und Kommunikations wissenschaft. 1994. WolfgangR. Langenbucher. Universitäts-Verlags buchhandlung, S 31-41.

# گفتوگۆ

# گفتوگۆی واڵ ستریت ژۆرناڵ لەگەڵ ئەلیس مۆنرۆ

گفتوگۆی واڵ ستریت ژۆرناڵ

لە فارسییەوە: جەبار سابیر

مۆنرۆ هەرگیز بەنیاز نییە یادەوەرییەکانی بڵاوبکاتەوە. دەڵێ: لە نووسینەوەی یادەوەرییدا زۆر کەس ناویان دێتە ناوانەوە، چۆن دەتەوێ لە بارەی ئەوانەوە راستییەکان بنووسیت؟! مۆنرۆ کە تووشی شێرپەنجە بووە، دەڵێ: هێشتایش رووداوگەلێکم بۆ پێش دێت کە دەبێتە هۆی ئەوەی چیرۆکی دی بنووسم.

ئەلیس مۆنرۆ، کورتە چیرۆکنووسی کەنەدی کە زۆربەی کەس بە چیرۆکنووسێک وەسفی دەکەن کە هاوکات لەگەڵ نێوبانگە جیهانییەکەی، زۆر قـەدری نەگیراوە. لەو نەریتی ئەدەبییدا کە زوربەی خەڵاتەکان بە رۆماننووسان ئەبەخشرێت، ئەو پێداگرانە کاری نووسەری خۆی لە کورتە چیرۆکدا سنووردارکردووە. ئەلیس مۆنرۆ تا ئێستا دوازە کۆمەڵە کورتە چیرۆکی چاپ کردووە و تەنها یەک رۆمانی نووسیوە. هۆگرانی کارەکانی ئەو زۆربەیجار دەڵێن لەبەرئەوەی ئەو کورتە چیرۆک دەنووسێت، کۆمیتەی خەڵاتی نۆبڵ هەمیشە ئەویان نەدیدە گرتووە. خانم مۆنرۆ لە ساڵی (٢٠٠٩) خەڵاتی «نێودەوڵەتی بۆکەری» بۆ تەواوی کارەکانی وەرگرت.

رەخنەگران و نووسەران شێوازی سادە و بێ رتـووش و تەکنیکی بەرز و کەسێتییە سادە و دیالۆگە گونجاوەکانیان ستایش کـردووە. «جۆناسان فرنزن» نووسەری دیاری ئەمریکی لە وتارێکدا لە رۆژنامەی نیویۆرک تایمز نووسی خانم مۆنرۆ «شایەنی ئەوەیە بە باشترین چیرۆکنووسی ئێستای ئەمریکای باکوور دابنـرێت.» چیرۆکەکانی کۆمەڵە نوێکەی خانم مۆنرۆ بەناوی (خۆشی زۆر) کە ئەم ماوەیە چاپ بـووە، بە بـەراورد بە زۆرێک لە چیرۆکە سەرەتاییەکی ئەو تاریکتر و نیگەرانی هێنەرترن. لە چیرۆکە سەرەتاییەکانی ئەم نووسەرەدا، زۆربەیجار سوود لە مادەی خامی ئۆتۆبیۆگرافیک و بابەتی خێزانی وەرگیراوە. لە کۆمەڵە نوێکەدا چیرۆککگەلێک هەیە کە لەواندا ئەندامانی خێزان یەکتری دەکـوژن، دەستدرێژی دەکرێتە سەر ماڵی بیوەژنێک و کوڕێک کە رووخسارێکی ناقۆڵای هەیە ئەبێتە ئیلهامبەخشی کچێکی منداڵکار تا خۆی بریندار بکات. خانم مۆنرۆ بۆ یەکەمجار لە چیرۆکێکی پەنجاو حەوت پەڕەییدا وەک ناونیشان، سوودی لە کەسێتییەکی مێژوویی وەرگرتووە بە ناوی






«سۆفیا کۆڤالۆڤسکی» کە ڕۆماننووسێک و ماتماتیکزانێکی ڕووسە.
مۆنرۆ کە تەمەنی هەشتا ساڵە، لە شارێکی زۆر بچووکی «ئۆنتاریۆ» دەژی. ئەو هێشتا سەرسەختانە دەنووسێت، خۆی دەڵێ سەری لەم بابەتە سووڕماوە: «چاوەڕێم دەکرد تا ئێستا خانەنشین کرابم.»

***واڵ ستریت ژۆرنـاڵ: لە زۆرێـك لە چیرۆکەکانی کۆمەڵە نوێکەتدا «خۆشی زۆر»، شوێن پێیەك لە توندوتیژی هەیە. سەرچاوەی ئەم توندوتیژییە چی بووە؟**
-ئەلیس مۆنرۆ: من خۆم تا کاتێک کۆمەڵە چیرۆکەکە تـەواو نەبوو، هەستم بەم بابەتە نەکردووە. خۆم دەمزانی لە یەکەمین چیرۆکی کۆمەڵەکە، توندوتیژی ئامادەییەکی تۆخی هەیە، لە ڕاستیدا تەنانەت خۆیشم نەمتوانی دووبارە بیخوێمەوە. ئەم چیرۆکە زۆر نیگەرانکەرە... من مەبەستم ئەمە نەبوو کە مۆتیف «ناوەڕۆک»ێکی توندوتیژ لەم کۆچیرۆکەدا هەبێت، بەڵام ئەم توندوتیژییە لە چیرۆکەکانی ئەم کۆمەڵەیەدا هەیە و ئەم بارودۆخە دەتوانێ بێئەوەی ئاگاتان لێی بێت، خۆ بە خۆ ڕووبـــدات... یەکەمین چیرۆکی ئـەم کۆمەڵەیە کۆپی کردنی هیچ ڕووداوێکی ڕاستەقینە نەبووە، بەڵام زۆر سەیرە: لەم شەش مانگەی دواییدا نموونەیەکی کوشتنی زۆر وێکچوو لە کوشتنێک کە لەم چیرۆکەدا ڕوو دەدات، ڕوویدا کە لەم نێوەدا باوکێک منداڵەکانی خۆی دەکوژێت تا ئەوان لە شەڕی دنیا قوتار بکات و دایکی منداڵەکان تەنیا دەمێنێتەوە

***واڵ ستریت: دیارە تۆ خۆت لە بەرامبەر مۆدە ئەدەبییەکان، کە تاوناتاوێ ڕەواجیان دەبێت، پاراستووە. ئایا تۆ ئاگایانە هەوڵ دەدەیت پابەند بیت بە چیرۆکنووسی**



ساده و گێڕانەوەی کەسێتی بنیادی؟

-ئەلیس مۆنرۆ: من ئەمەم لە بارەی خۆمەوە خوێندۆتەوە، ئەوەی کە دەڵێن شێوازی سادە و بێ رتووشم هەیە. رێک وەک ئەمە وایە کە جلوبەرگی سادە لە بەربکەیت. بەڵام من لە بارەی شێوازی نووسەریمەوە ئەم بۆچوونەم نییە. بوونی وەها شێوازێک بە ئەنقەست نییە. نووسەرانێک هەن، وەک نابۆکۆف، کە زۆر کارەکانیان پەسەند دەکەم، ئەگەر بە شێوازی ئەمانە دەمنووسی زۆر خۆشحاڵ دەبووم. بەڵام ئەمە بڕیارێکی هونەرمەندانە نییە.

***واڵ ستریت: بەشێوەی ئاسایی ماوەی چەند کار لە سەر چیرۆکێك دەکەیت؟**

-مۆنرۆ: رەنگە ماوەی ساڵێک لەسەر هەندێک لە چیرۆکەکان بە شێوەیەکی پچڕپچڕ کار بکەم. کورتترین ماوە، دوو مانگە.

***واڵ ستریت: چۆن دەست بە نووسینی چیرۆکێك دەکەیت؟**

-مۆنرۆ: چیرۆکەکە بە قەڵەم جاف لە دەفتەرێکدا دەنووسم. لە سەرەتاوە تا کۆتایی دەنووسم، بەڵام ئەم چیرۆکە بە هیچ کلۆجێک چیرۆکی کۆتایی نیە. پاشانیش دەفتەرێکی دی هەڵدەگرم و دووبارە بە قەڵەم جاف دەینووسمەوە، ئەمجارە چیرۆکەکە لە دواکۆپی و جێ مەبەستی من نزیک دەبێتەوە. پاشان ئەم دوو دەفتەرە دەدڕێنم و فڕێیدەدەم و بێئەوەی سەیری شتێک بکەم چیرۆکەکە تایپ دەکەم. ئەوسایە کە چیرۆکێکی شیاو دەنووسم.

***واڵ ستریت: کارکردن بە کۆمپیوتەر ئاسانە بۆتان؟**

-مۆنرۆ: من لە بارەی کەلوپەلە تەکنیکییەکانەوە مرۆڤێکی کارەساتم! ئەگەر ماوەیەکی دوورودرێژ بە کۆمپیوتەر کار نەکەم هەموو شتێک لە بیر دەکەم و دەبێت مێردەکەم بێت و سەرلەنوێ هەموو شتێکم فێربکاتەوە. وێڕای ئەمانەیش من تازە نەخۆش کەوتووم، تووشی شێرپەنجە بووم، دەرمانی شێرپەنجەیش جۆرێکە کە بەشگەلێک لە مێشک دەپووکێنێتەوە و لەم هەلومەرجەدا کاتێک شتێک فێر دەبیت لە مێشکتدا نامێنێتەوە و لە بیری دەکەیت.

***واڵ ستریت: بۆچی هێندە پابەندی بە کورتە چیرۆکەوە؟**

-مۆنرۆ: ماوەیەک هەوڵم دا ڕۆمان بنووسم، بەڵام هیچ کەڵکی نەبوو. هەمیشە ئەو چیرۆکەی کە دەمویست لە بۆتەی ڕۆماندا بیگێڕمەوە، لە نیوەڕێدا تێکدەچوو و منیش حەزم لێی نەدەبوو و ئیدی پێموابوو بە کەڵک نایەت و شوێنیشی نەدەکەوتم. ئێستایش بە بۆچوونی خۆم ئەو چیرۆکانەی کە دەینووسم شتێکە لە نێوان کورتە چیرۆک و ڕۆماندا کە هەڵبەتە خەڵکی پێیان دەڵێن کورتە چیرۆک، بەڵام چیرۆکەکانی من بە دەگمەن کورتن و هاوکات ڕۆمانیش نین. نازانم ئایا بۆ ئەو چیرۆکانە کە قەبارەیان لە نێوان کورتە چیرۆک و ڕۆماندایە، وشەیەکی تایبەت هەیە یانا. هەڵبەتە شتێکمان بە ناوی «کورتە ڕۆمانەوە« هەیە، بەڵام هەرگیز تێنەگەیشتووم ڕۆمان بە مانای وشەکە بە چ چیرۆکێک دەڵێن یا



ئەوەی ئایا من تا ئێستا کورتە رۆمانم نووسیوە یان نا.

***واڵ ستریت: تۆ لە گفتوگۆ لەگەڵ گۆڤاری «پاریس رڤیۆ» وتت وەك نووسەرێك هەمیشە نیگەرانی كە پارچەگەلێك لە چیرۆكە پەرتوبڵاوەکانت لە بیر بکەیت و بە جێیبهێڵی. ئایا هێشتایش ئەم نیگەرانییەت هەیە؟**

-مۆنرۆ: نا. دەبێت بڵێم ئەم بارودۆخە




لە مندا گۆڕاوە. لەو کاتەوەی تووشی نەخۆشی شێرپەنجە بووم، تەنها خۆشحاڵم کە زیندووم، ئیدی نیگەرانی ئەوەنیم شتێک جێبهێڵم. ئەسڵەن مرۆڤ دەبێت بەختی زۆر بێت کە شتانێک، بۆ نموونە چیرۆکێک جێبهێڵێ. بۆ نموونە «چیخۆف» ئەگەر تەنها چیرۆکی «خانم و سەگەکەی» بنووسیبا نرخی ئەوەی هەبوو زیندوو بێت. ئیدی من زۆر رەخنەگرانە و وردبینانە سەیری کارەکانم ناکەم.

***واڵ ستریت: تۆ داوات لە بەرپرسانی خەڵاتی ئەدەبی «گلیر» کردووە، کە یەکێك لە متمانەپێکراوترین خەڵاتە ئەدەبییەکانی کەنەدایە تا ناوی تۆ لە لیستی بەربژێرانی ساڵی (٢٠٠٩)ی ئەم خەڵاتە نەهێنن لەبەرئەوەی پێشتر ئەم خەڵاتەت بردۆتەوە و لە لایەکیتریشەوە بەم کارەتان ویستوتانە دەرفەتی پتر برەخسێنن بۆ ئەو نووسەرانەی هێندە ناویان دەرنەکردووە. ئایا تۆ نووسەرە ناسراوەکان هان دەدەیت لەم بوارەدا وەك تۆ کار بکەن.**

-مۆنرۆ: نا، ئەم کارەی من بڕیارێکی تایبەتی بوو. خۆزگە قسەکەم بەمجۆرە نەکردایە، لەبەرئەوەی مانای قسەکەم ئەمەیە کە زۆر لە پێشتر خەڵاتی گلیرم بردۆتەوە. بۆ نموونە دەبوو بموتبا ماندووم، تازە خەریکم دەرمانی کیمیایی تەواو دەکەم و لە ئاستی فیزیکی و جەستەییەوە کێشەم هەیە. بەڵام لەبەرئەوەی نەمدەویست لە بارەی پرسە تایبەتییەکانەوە قسە بکەم، وتم نووسەرە گەنجەکان زیاتر پێویستییان بە دەرفەتە. خۆزگە بەم شێوە

قسەم نەکردایە. بەڵام باوەڕم وایە کە نووسەرێک پاش تێپەڕبوونی ماوەیەک لە چالاکی پیشەیی خۆی ئیدی پێویستی بە شتێکی وەک خەڵات نییە. ئیتر خەڵات ئۆخژن بەخش نییە بۆتان. بێتاقەت نیم کە لە کێبرکێ بۆ خەڵاتی گلیر پاشەکشەم کرد.

***واڵ ستریت: تۆ لە کۆمەڵە چیرۆکی «خۆشی زۆر»دا چیرۆکێکت هەیە کە لە بارەی «سۆفیا کوڤالۆڤسکی» ماتماتیزانی رووسەوەیە. تۆ بەشێوەیەکی ئاسایی چیرۆك لە بارەی کەستییە مێژووییەکانەوە نانووسیت. چ شتێك بووە هۆی ئەوەی تۆ ئەم ژنە بکەیتە هەوێنی کەسێتی چیرۆکێکت؟**

-مۆنرۆ: ئەو وەک کەسێتییەکی چیرۆک بۆ من شێتکەرە. جارێک خەریکبووم لە ئینسکلۆپێدیایەکدا بە شوێن شتێکی دیدا دەگەڕام کە تووشی کەمە زانیارییەک بووم لە بارەی ئەوەوە. من کەسێتییەکم ناسیبوو کە هەم ماتماتیکزانێک بوو هەم رۆماننووس، لە کاتێکدا کە ئەم دوو کارە لە دۆخی ئاساییدا ناکەونە پەنا یەکەوە.

***واڵ ستریت: چۆن تەکنیکی چیرۆکەکانت پەیدا دەکەیت؟**

-مۆنرۆ: هەندێک لەم تەکنیکانە لە رووداوگەلێکەوە دەستدەکەون کە روویانداوە و زۆرینەیان لە سەر بنەمای رووداوێک نووسراون کە وەختابوو روو بدەن یا ئەوەی روویاننەداوە، بەڵام ئەگەری روودانیان هەبوو، رووداوگەلێک کە کاتێک لە ژیانمدا سەیریان دەکەم بە خۆم دەڵێم ئەگەر ئەمە و ئەوە روویاندەدا، کاردانەوەی من چی بووە؟ ئەم چیرۆکانە بە جۆرێک پشکنینی ئەم بابەتەن کە خەڵکی یان گروپێکی تایبەت لە خەڵک لە هەلومەرجی جیاوازدا چ رەفتارێک لە خۆیان پیشان دەدەن. هەڵبەتە بابەتەکە لەم قسانە روونترە. من ئێستا دەتوانم ئەم شتانە بە تۆ بڵێم لەبەرئەوەی ئەمرۆ بەیانییەکەی خەریکبووم بە شێوەیەکی تەواو لە سەر قۆناغی سەرەتایی چیرۆکێک کارم دەکرد.

***واڵ ستریت: تۆ بۆ ماوەیەکی زۆر کورت وانەی نووسەریت وتەوە، بەڵام دواتر وتت رقت لەم کارەیە.**

-مۆنرۆ: بەڕاستی باوەڕم بە وتنەوەی وانەی چیرۆکنووسی نییە. دەڵێم کەسێک کە دەیەوێ چیرۆک بنووسێت دەبێت دانیشێت و هەر چیرۆک **بنووسێت و بنووسێ و کارەکەی بپشکنێت.** کاتێک تۆ لەگەڵ دەستەیەک رووبەڕوویت، یەکێک لە مەترسییەکانی کارەکە ئەمەیە کە رووبەڕووی جۆرێک چیرۆک دەبیتەوە، یەک جۆرە کار کە هەڵبەتە کاریگەریشە و ئەوانیتریش شوێن کاری ئەو دەکەون، لەبەرئەوەی لە پۆلدا بۆتە کەسێتییەکی بەهێز. من بەش بە حاڵی خۆم هەست دەکەم ئەم چیرۆکانە هەرگیز شتێکیان لێ سەوز نابێت.

***واڵ ستریت: زۆرێك لە کەسێتییەکانی کۆمەڵە چیرۆکی «خۆشی زۆر» بیر لە پیربوون دەکەنەوە. ئایا ئەمە بابەتێکە کە بیری تۆیشی بە خۆیەوە سەرقاڵ کردووە، ئایا پیر بوون جۆرێك زیانی لە کارەکانی تۆ داوە؟**

-مۆنرۆ: خۆم چاوەڕێم دەکرد خانەنشین بم لە کاری نووسەری. هەمیشە بیرم دەکردەوە

کاتێک بگەمە تەمەنێکی دیاریکراو، ئیدی دەستم گەیشتۆتە داواکانم و خانەنیشین دەبم و چێژ لە ژیانی تایبەتیم وەردەگـرم، لەبەرئەوەی کاتێک ئیدی پابەند نەبیت بە نووسەرێتییەوە، پێویست ناکات کاتێک بەیانی لە خەو هەستایت یەکسەر دەســت بە نووسین بکەیت. بەڵام هێشتا شتێکی وام بە سەر نەهاتووە، بە هیچ کلۆجێک و ئەمەیش دەمحەپەسێنێ. هەمیشە بیرم دەکردەوە نووسەران یا لانیکەم هەندێک لە نووسەران دواجار رۆژێک خانەنشین دەبن، بەڵام من هێشتا رووداوگەلێکم بۆ پێش دێت کە دەبێتە هۆی ئەوەی چیرۆکێکی دی بنووسم و پاشان بە خۆم دەڵێم: (ئیدی ئەمە دوا چیرۆکە. کاتێک ئەم چیرۆکەم نووسی، ئیدی واز لە نووسین دەهێنم و پشوو دەدەم.) بەڵام تا ئێستا ئەم رووداوە نەقەوماوە!

***واڵ ستریت: ئەگەری هەیە بتەوێ یادەوەرییەکانت بنووسیتەوە؟**

-مۆنرۆ: نا. نازانم ئەو کەسانەی یـادەوەری دەنووسنەوە چۆنچۆنی ئەم کارە دەکەن. کاتێک یادەوەری دەنووسیت ناوی هەندێک کەس دێتە ناو ناوانەوە، چۆن دەتەوێ لە بارەی ئەوانەوە راستییەکان بنووسیت؟ رەنگە ئەگەر ئەوەندە زیندوومام کە تـەواو پیر و کەنەفت بـووم و هەموو ناسیاوەکانم تا ئەو کاتە مردن، کتێبێکی یادەوەرییەکانم بنووسم!

***واڵ ستریت: کتێبی دواترتان چییە؟**

-مۆنرۆ: باشە، من ئێستا چەند چیرۆکێکی تەواوم هەیە. ئەم چیرۆکانە پەیوەستن بە ژیانی ساڵانی پێشووترمەوە. چەند چیرۆکێکیش هەن کە لە ئێستادا کاریان لە سەر دەکەم.

**سەرچاوە:**

وال استریت ژورنـال/ الکساندر الترا/ مترجم: فرشید عطایی

blogfa..http://rezabishetab۲
aspx.۱۰۰-com/post

# ژاک دێریدا:
# کۆتایی میتافیزیکی ئاماده

گفتوگۆی محەمەد رەزا ئیرشاد لەگەڵ محەمەد زەیمەران

لە فارسییەوە: پێشڕەو محەمەد



ژاک دێریدا

## دێریدا وەك فەیلەسوفێکی هاوچەرخی فەرەنسی چ پێگەیەکی لە فەلسەفەی خۆرئاوادا هەیە؟

ژاک دێریدا (١٩٣٠)١ بە گەڕانەوە بۆ فەلسەفەی هایدێگەر، نیتشە و لێڤیناس، بناغەی فەلسەفەیەکی دانا، کە بە دیکۆنسترەکشن (Deconstruction) ناسراوە. ئەو رەخنەیەکی توند رووبەڕووی مێتافیزیکی خۆرئاوا دەکاتەوە، کە ریشەی ئەم مێتافیزیکە دەگەڕێتەوە بۆ چەمکی ئامادە (Presence) و دەڵێت تراديسیۆنی بیرکردنەوەی فەلسەفی ئەوروپا بە جۆرێک دووچاری نابوتی بووە و ماوەیەکی زۆریشە دینامیکییەت و گەشەکردنی خۆی لەدەست داوە. بانگەشەکانی فەلسەفە و بەتایبەت ئەفسانەی ئامادە واتا ئامادەی ناچارەکی، ئامادەی جیهانی دیار، ئامادەی "خۆ" و یان بە تەعبیری فەیلەسوفانی دواتر "منایەتی" (I-ness) و سەرەنجام هیومانیزم، هەموویان نیشانەی ئەمجۆرە نابوتی و وێرانبوونەن. دێریدا دەڵێت نەریتی ئۆنتۆتیۆلۆژیی (Ontotheological) (بوونی-ئیلاهیناسیانە)ی خۆرئاوا لە سەرەتای دەرکەوتنییەوە تا ئەم سەردەمە ئەگەرەکانی هەرجۆرە گومانکردنێکی لە بنەما یەقینەکانی فەلسەفە نەفی کردووە.

## بەدیدی ئێوە فەلسەفەی دێریدا زیاتر سوودی لە کام یەکێك لە ئایدیا فەلسەفییەکان وەرگرتووە؟

دێریدا لە فەلسەفەکەیدا گەڕاوەتەوە بۆ فێنۆمێنۆلۆژیی هوسەرل، رەچەڵەکناسی (ژێنالۆژیی) نیتشە، فەلسەفەی بوونی هایدێگەر و تیۆلۆژیی لێڤیناس، بەڵام کاریگەری هوسەرل و نیتشە لەهەموویان زیاترە لەسەر دێریدا. ئەو بەردەوامی بە رەخنەی بونیادگەرایی لە فەلسەفەی دێکارتیش دا و پاشان سوودی لە رەخنەی فوکۆ لە دەسەڵات، زانین (زانیاری) و گوتار (دیسکورس) وەرگرت و کرۆکە نیشانەناسییەکانی رۆلان بارتیشی لە چەند شوێنی بەرهەمەکانی خۆیدا جێکردەوە.

---

١- دێریدا ساڵی ٢٠٠٤ کۆچی دوایی کردووە، ئەم گفتوگۆیە پێش مەرگی دێریدا ئەنجام دراوە (وەرگێڕ)

چ شتێک بووە هۆی ئەوەی فەلسەفەی دێریدا بەم ئەندازەیە بچێتە نێو ناوەندە فەلسەفییەکانی خۆرئاواوە؟

ژاک دێریدا فەیلەسوفێکە هەرچەند چووەتە دەرەوەی چوارچێوەی ترادیسیۆنی فەلسەفەی خۆرئاوا و تەنانەت هەندێک کەس وەک وێرانکردنی ترادیسیۆنی بیرکردنەوەی خۆرئاوا سەرزەنشتی ئاراستە فکرییەکەی ئەویان کردووە، بەڵام دیکۆنسترەکشنەکەی دێریدا پرسیارگەلی جدی لە بەرانبەر بە پێشگریمانەکانی فکری فەلسەفیی خۆرئاوا هێناوەتە ئاراوە. ئەو لە ساڵی ١٩٦٦ لەو کۆنگرەیەی لەلایەن زانکۆی جۆن هاپکینزەوە بەسترا، وتارێکی جدی و وروژێنەری دەربارەی "بونیاد، نیشانە و یاری لە زانستە مرۆییەکاندا" پێشکەش کرد، کە بۆ یەکەمین جار دێریدای خستە نێو ناوەندە فەلسەفیی و ئەدەبییەکانی ئەمەریکاوە. ئەو دەکەوێتە رەخنەگرتن لە فەلسەفەی خۆرئاوا لە سەردەمی پلاتۆنەوە تا سەردەمی ئێستا و دەڵێت کۆی ئاراستە فەلسەفییەکانی خۆرئاوا لەسەر بنەمای جۆرێک لە "منایەتی" دامەزراوە، کە لە راستیدا ئەم منایەتییە یان "خود سەنتەریزم"ە هەمیشە بووەتە ژێرخانی کۆی ئاراستە و بیرە فەلسەفییەکانی خۆرئاوا و لە راستیدا هیومانیزمیش فۆرمێکی پەرەسەندووی ئەم "من" یان منایەتییەیە. چەمکگەلێکی وەک بوون، ماتەریال، حەقیقەت، فۆرم، بنەڕەت، ئەنجام، مرۆڤ و هتد، هەر لەسەر بنەمای ئەم تەوەرە راڤە و تەفسیر کراون.

**لە راستیدا دەتوانین بڵێین دێریدا بە دووبارە خوێندنەوەی سیستەمی فەلسەفیی خۆرئاوا کۆمەڵێك رەخنەی زۆری بەلای خۆیدا راکێشاوە. فەلسەفەی دێریدا لەبەرانبەر فەلسەفەی رەسمی خۆرئاوا چ پێگە و شوێنێکی هەیە؟**

پێویستە ئاماژە بەوە بکەین نووسین و گوتەکانی دێریدا رەخنەیەکی جدییە لەسەر فەلسەفەی رەسمی خۆرئاوا. دێریدا بەردەوام هەوڵیداوە چەمکگەلی باوی فەلسەفەی خۆرئاوا، وەک حەقیقەت، زانین، بەها، جەوهەر، کرۆک و هتد... بخاتەژێر پرسیارەوە. بەدیدی ئەو، فەلسەفە جۆرێکە لە نووسین و کەواتە فۆرم و ستایلەکەی گرنگی و بەهایەکی تایبەتی هەیە. لەم رووەوە، ئەو تەکنیکە زمانییەکانی وەک مێتافۆر، ئاماژە و مەجاز (خوازە) بە شتێکی گرنک دەزانێت. دێریدا دەڵێت نابێت ئەم چەمکانە تەنها بۆ رەوانبێژی و دروستکردنی جوانکاری کورت بکەینەوە، بەڵکو لە هەموو کایەکاندا بە فراوانی ئامادەییان هەیە. دەتوانین بڵێین لە سەردەمی ئێستادا دێریدا سنوورە دروستکراوەکانی نێوان ئەدەبیات و فەلسەفەی تێکشکاندووە و رووبەڕووی پرسیارگەلی جدی کردووەتەوە. ئەو فەلسەفە و هونەر بەیەکەوە گرێدەداتەوە، کە لە سەردەمی پلاتۆنەوە لەیەکتری جودا کرابوونەوە. دەشێت ئاماژە بەوە بکەین بەدیدی ئەو هیچ جۆرە سنوورێک فەلسەفە، هونەر، یاسا، تەلارسازی و سیاسەت لەیەکتری جیاناکاتەوە. بەم هۆیەوە بوو کاتێک زانکۆی کەمبریج دێریدای وەک پێدانی بڕوانامەی ئیفتیخاری هەڵبژارد، چوار کەس لە ئەندامانی ئەم ناوەندە دژی پێدانی ئەم بڕوانامەیە بوون بە دێریدا، چونکە دەیانگوت دێریدا سنوورەکانی نێوان کایەی فەلسەفە و ئەدەبیاتی تێکشکاندووە.

ئەوان دەیانگوت دێریدا تەجاوزی کردووەتە نێو سنوورە ناسراوە زانستییەکانەوە. هەرچەند سەرەنجام بڕوانامە ئیفتیخارییەکەی وەرگرت، بەڵام گفتوگۆ دەربارەی جیاکردنەوە یان تێکەڵکردنی کایەکان هێشتایش بەردەوامی هەیە. دێریدا بەهیچ جۆرێک نەچووە ژێرباری هەڵوێستێکی یەکلاییکەرەوە، چونکە ئەو هەڵوێست وەرگرتن بە پێچەوانەی پێشگریمانەکانی فەلسەفەی دیکۆنسترەکشن سەیر دەکات. سەرباری ئەمە، ئەو خۆی بواردووە لە قبوڵکردنی گریمانەیەک یان تیۆرییەکی تایبەتی و بە پێچەوانەی پرەنسیپی دیکۆنسترەکشن سەیری ئەمە دەکات.

**بونیادگەرایی لای دێریدا چ پێگە و شوێنێکی هەیە و ئەم ئاراستەیە بۆ وەڵامدانەوەی کام یەکێك لە ئاراستە فەلسەفییەکانی خۆرئاوا دەرکەوت؟**

لەکۆنگرەی ناوبراوی جۆن هاپکینزدا، دێریدا خەریکی لێکۆڵینەوە و شیکارکردنی بونیاد بوو و گوتی بونیادگەرایی هەوڵێکە بۆ ئەبستراکتاندنی بونیادەکانی کرداری مرۆیی. بونیاد لە کۆبوونەوەی ئەو توخم و هۆکارانەوە دەستەبەر بووە، کە فۆرم بە رەفتاری مرۆیی دەبەخشێت. لێرەدا بابەتی لێکۆڵینەوەی بونیادگەراکان برێتییە لە پەیوەندی نێوان ئەو هۆکارانە و نەک خودی هۆکار و توخمە پێکهێنەرەکانی ئەو بونیادە. لە راستیدا بونیادگەرایی وەڵامێک بوو بۆ منایەتی کۆنترۆڵ نەکراو و خود سەنتەریزمێک، کە فەیلەسوفانێکی وەک کامۆ و سارتر لە فەرەنسا رێبەرایەتییان دەکرد. بونیادگەرایانی وەک لیڤی- شتراوس و رۆلان بارت کەوتنە رەخنەگرتن لە ئاراستەی سەرەکی ئێگزیستێنسیالیزم، کە بایەخێکی رەهای بە سەبژێکتیڤیتە بەخشیبوو و ئیگۆی ترانسێندێنتال (Transcendental Ego)ی سارتر و میرلۆپۆنتی وەک کێشەی سەرەکی تاووتوێ کرد.

**واتا فەلسەفەی دێریدا و هەروەها میشێل فوکۆ پەرچەکردارێکی رەخنەییانە بوو لەبەرانبەر کارتیسیانیزم (دێکارتگەرای)ی سارتر و میرلۆپۆنتی؟**

بەڵێ و هەڵبەت ئەم پەرچەکردارە لە کایە جۆراوجۆرەکانی زانستە مرۆییەکانی وەک فەلسەفە، زماننناسی، ئەنترۆپۆلۆژیی، سۆسیۆلۆژیی و رەخنەی ئەدەبیدا فۆرمگەلێکی جۆراوجۆرەی بەخۆیەوە گرت.

**کەواتە بونیادگەرایی پنتی دەستپێکی پەرەدانی ئایدیاکانی دێریدا بوو و بەم هۆیەوە ئەو لە رەخنەی بونیادگەراییانەوە دەستپێدەکات. رەخنەی دێریدا بە بونیادگەرایی لەسەر چ روانگەیەك وەستاوە؟**

دێریدا لە گوتاربێژییەکەی جۆن پاکنیزدا و هەروەها لە کتێبی دەربارەی گراماتۆلۆژیی (On Grammatology)دا چەمکی بونیاد (Structure) بە پشت بەست بە جۆرێک لە پێشگریمانەی

"سەنتەر" سەیر دەکات، کە زاڵە بەسەر بونیاددا، بەڵام خۆی ناچێتە بەر سەرنجەوە. هەر بەوجۆرەی گوتم بیری فەلسەفیی خۆرئاوا لەسەر بنەمای حەز و ئاراستەگرتن بەرەو سەنتەرێکی تایبەتی فۆرمولە دەبێت. ئەم سەنتەرە هەر ئەو شووناس یان مانایەیە، کە وەک پرەنسیپێکی یەکێتی، بنەڕەتی بونیاد بەهێز دەکات. لەڕاستیدا وێناکردنی بونیاد بەبێ ئەم سەنتەرە وەک شتێکی بێ مانا دەردەکەوێت.



**بۆ تێگەیشتن لە فەلسەفەی دێریدا، ناسینی deconstruction، کە لەڕاستیدا داهێنانی ئەوە لە رەخنەکردنی فەلسەفەی خۆرئاوا، وەك کارێکی زەروورى دەردەکەوێت. بەدیدی ئێوە چۆن و بە چ شێوەیەك دەتوانین ئەم بنەماییترین زاراوە فەلسەفییەی دێریدا بناسێنین؟**

سەرەتا پێویستە بڵێم دێریدا بە تەواوی دژی پێناسەکردنی چەمکەکانە و دەڵێت پێناسەکردن خۆی ریشەکەی دەگەڕێتەوە بۆمێتافیزیکی ئامادەی ئەریستۆتێلیس و بەمەیش ناتوانین بە تێگەیشتن لە شتەکان و دیاردەکان بگەین. بەشێک لە رەخنەگرانی دێریدا بە چەندین چەشن وەسفی دیکۆنسترەکشنیان کردووە. هەندێکیان وەک شێوازێکی فەلسەفاندن سەیریان کردووە، هەندێکی دیکە وەک ئاراستەیەکی خوێندنەوەی دەق باسیان کردووە و هەندێکیش لە پسپۆڕانی فەلسەفەی دێریدا دەڵێن دیکۆنسترەکشن شتێکە ئێوە باوەڕ ناکەن. هەندێکیان وەک دیاردەیەکی زووتێپەڕی رەخنەی ئەدەبیان داناوە. هەندێکی دیکە گوتوویانە دیکۆنسترەکشن تۆڵەکردنەوەی ئەدەبیاتە لە فەلسەفە. هەندێک وەک بەرگرییەک لەبەرانبەر بە پرسیارگەلێک سەیری دەکەن، کە بە "چ شتێک" دەستپێدەکات. تەنانەت بەشێک دیکۆنسترەکشن وەک جۆرێک لە هایدێگەرگەرایی مەترسیدار دەبینن. بەشێکی دیکەیش ئەم بزووتنەوە وەک هێرشێک بۆسەر نەریتی فەلسەفیی خۆرئاوا دەزانن.

**هەڵبەت بەو جۆرەی ئاماژەت پێدا ئەم پێناسانە هەریەکێکیان باس لە روانگەیەکی تایبەت دەکات. هەرچۆنێك بێت، بەدیدی بەڕێزتان چۆن دەشێت زاراوەی**

### دیکۆنستره‌کشن بۆ فارسی {کوردی} وه‌ربگێڕدرێت؟

وه‌ڵامدانه‌وه‌ی ئه‌م پرسیاره زۆر سه‌خته. به‌وجۆره‌ی ده‌زانیت هه‌ندێک ئه‌م زاراوه‌یه‌یان به شالوده‌شکنی (بنه‌ماشکێنی)، ساختارشکنی (بونیادشکێنی)، واسازی (پێکهاته‌شکێنی)، ساختارزدایی (له‌بونیادخستن)، ساخت گریزی (راکردن له بونیاد) و هتد وه‌رگێڕاوه۲، به‌ڵام هیچ یه‌کێک له‌م زاراوانه مانا سه‌ره‌کییه‌که‌ی زاراوه‌که ناگه‌یه‌نن، چونکه ته‌نها ره‌هه‌ندێکی سیمیۆتیکیانه (واتاناسییانه) ی چه‌مکه‌که بۆ فارسی/کوردی ده‌گوازێته‌وه. واتا ئه‌گه‌ر ئه‌م زاراوه پێشنیارکراوانه لایه‌نی نێگه‌تیڤ و مه‌نفی زاراوه‌که بگه‌یه‌نێت، ئه‌وا ئاگاداری ره‌هه‌نده پۆزه‌تیڤه‌که‌ی زاراوه‌که نییه. به‌دیدی من زاراوه‌ی بنیان فکنی (فرێدانی بونیاد) ده‌شێت پێشنیارێکی گونجاو بێت، چونکه له زمانی فارسیدا "افکندن" (هاویشتن، فرێدان، لابردن) هه‌ڵگری مانایه‌کی ئاماژه‌یه (ایهامه)؛ هه‌م به مانای هاویشتن "انداختن" و هه‌م به‌مانای فراوانکردن و به‌ربڵاوکردن و هه‌م به‌مانای پێکهێنان و وێرانکردنیش دێت. بۆ نموونه "بنیان افکندن" به‌مانای بناغه‌ڕشتنیش دێت، به‌ڵام "بنیان برافکندن" به مانای وێرانکردن و تێکدان هاتووه. که‌واته "بن فکنی و بنیان فکنی" به‌هۆی ئه‌و مانا ئاماژه‌یی و دوولایه‌نییه‌ی هه‌یه‌تی ده‌شێت بۆ گواستنه‌وه‌ی مانای deconstruction به‌کارببرێت، چونکه ئه‌م زاراوه‌یه له ریشه لاتینییه‌که‌یدا مانای بونیاد و پێکهاته و رێکخستن و سیسته‌م و رازانده‌وه و نه‌وازشکردن و ته‌گبیر ده‌به‌خشێت.

**به‌م پێیه، دیکۆنستره‌کشن هه‌م بانگه‌شه فه‌لسه‌فییه‌کانی خۆرئاوای رووبه‌رووی ته‌نگژه و پرسیاری جدی کردۆته‌وه و هه‌میش به‌دوای جێگیرکردنی بنه‌ما و بونیادێکی نوێدا ده‌گه‌ڕێت. دیکۆنستره‌کشن هه‌وڵده‌دات بچێته ئه‌ودیوی ئه‌و به‌رانبه‌رێتییه۳ فکرییانه‌ی له فه‌لسه‌فه و کولتووری خۆرئاوادا ئاماده‌یان هه‌یه. یه‌کێك له‌و به‌رانبه‌رێتییانه‌ی دێریدا ده‌یه‌وێت دیکۆنستره‌کشنی بکات برێتی بووه له به‌رانبه‌رێتی گوتار/نووسیار(نووسین). روانگه‌ی دێریدا ده‌رباره‌ی گوتار و نووسیار چییه و بۆچی ئه‌و گرنگی به "نووسیار" ده‌دات؟**

سه‌ره‌تا پێویسته ئاماژه به‌وه بکه‌ین دێریدا ده‌ڵێت مێتافیزیکی ئاماده‌ی خۆرئاوا هه‌میشه بناغه‌ی ئه‌رگومێنته‌کانی خۆی له‌سه‌ر بنه‌مای چه‌مکگه‌لی به‌رانبه‌ر و دووجه‌مسه‌ری وه‌ک ئاماده/نائاماده (غیاب)،

۲- هه‌ڵبه‌ت جگه له‌م زاراوانه‌ی له‌ناو که‌وانه دامناون که له کوردیدا به‌رچاوم که‌وتوون، هه‌ندێک هه‌ڵوه‌شاندنه‌وه، هه‌ڵوه‌شاندنه‌وه‌گه‌رایی و ته‌نانه‌ت تێک/پێکشکاندن، ترازانسازی و هتد داناوه، به‌ڵام به‌دیدی من، دیکۆنستره‌کشن نابێت وه‌ربگێڕدرێت، وه‌ک وشه‌ی دیفرانس لای دێریدا، ئه‌میش سه‌خته بۆ وه‌رگێڕان و ماناکه‌ی خۆی له‌ده‌ست ده‌دات، چونکه هه‌ر به‌و جۆره‌ی دێریدا خۆی ده‌ڵێت وه‌رگێڕان هه‌رگیز به‌مانای ئه‌وه نایه‌ت تۆ ده‌قه‌که‌ت وه‌رگێڕابێت، به‌ڵکو به‌مانای گواستنه‌وه‌یه‌ک دێت و هیچیتر، بۆیه من ئه‌م چه‌مکه وه‌ک خۆی داده‌نێمه‌وه، بۆ ئه‌وه‌ی پابه‌ندبین به روانگه‌ی خودی دێریدا بۆ چه‌مکه‌که. (وه‌رگێڕ)

۳- به‌رانبه‌رێتی (تقابل) واتا ئه‌م «/» هێڵه، به مانای ئه‌وه‌ی کۆی فکری مێتافیزیکی خۆرئاوا له‌سه‌ر راستاندن و نه‌فیکردن دامه‌زراوه، باش نه‌فیکردنی خراپه بۆیه به‌رانبه‌ر به‌یه‌ک داده‌نرێت باش/خراپ، سپی/ره‌ش، پیاو/ژن، کولتوور/ناتور (سروشت)، سپیپێست/ره‌شپێست و هتد، دێریدا ده‌یه‌وێت دیکۆنستره‌کشنی ئه‌م روانگه به‌رانبه‌رێتییه‌ی خۆرئاوا بکات، که له پلاتۆنه‌وه تا ئه‌م سه‌رده‌مه بری کردووه (وه‌رگێڕ)

حەقیقەت/مەجاز، هەست/نەست، سوژە/ئۆبژە، فۆرم/ناوەرۆک، ناتور(سروشت)/کولتوور، گوتار/نووسیار، رۆح/مادە و هتد دامەزراندووە. لە راستیدا ئەم بەرانبەرێتییە دووجەمسەرییانە یەکێک نەفی دەکرێتەوە یان کەم بەهاترە لەویدیکە و بە مانایەکی دی، یەکێک لەبەرانبەر ئەویدیکەدا بەهایەکی باڵاتری هەیە. دێریدا دەڵێت لە سەردەمی پلاتۆن بەدواوە گوتار هەمیشە بەسەر نووسیاردا بەرز کراوەتەوە و نووسیاریش (نووسین) وەک جێنشین و تەواوکەری گوتار سەیرکراوە. واتا گوتار بەم هۆیەوە بەگرنگتر لە نووسیار سەیرکراوە، چونکە لە هەر بەرکەوتنێکی دیالۆگیدا بێژەر و بیسەر هەردووکیان ئامادەن و لەڕاستیدا دیالۆگ لەسەر بنەمای لایەنی ئامادەی نێوان بێژەر و بیسەر فۆرمولە دەبێت، بەڵام لە نووسین (نووسیار)دا نووسەر غایبە (ئامادە نییە). دێریدا دەڵێت نزیکەی هەزار و پێنج سەد ساڵە فەلسەفە بەردەوام گوتاری بەسەر نووسیندا بەرزکردۆتەوە و دەتوانین ئەمەش لە نووسینەکانی پلاتۆن، ئەریستۆتێلیس، پلۆتینۆس، هێگل و هوسەرل بە روون و ئاشکرایی ببینینەوە. ئەوان رایانگەیاندووە، کە دەنگ یان فۆن، وەک ئامراز و میکانیزمی رەسەنی مانا دادەنرێت. دێریدا بەم دۆخە دەڵێت فۆنۆسێنتەریزم (Phonocentrism) و دەڵێت لەم ئاراستەیەدا نووسین هەمیشە لە گوتار وەرگیراوە و بەناچاری وەک شتێکی پاشکۆ سەیرکراوە. بەدیدی ئەو، ئەگەر دەنگ (فۆن) پاشای بیرکردنەوە بێت، ئەوا پێویستە نووسین بە دژ و نەیار دابنرێت، بەو واتایەی نووسین مەترسییەکی کوشندەی مانا بەدوای خۆیدا دەهێنێت.

**واتا مانا لە گوتار "ئامادە" و لە نووسیندا نائامادەیە. ئەمە بریتییە لە مێتافیزیکی ئامادە، بیرکردنەوە لە بەرانبەریتی و سێنتەریزمی زاڵ و سەروەر بەسەر سیستەمی فەلسەفیی خۆرئاوادا، کە دێریدا هەوڵدەدا دیکۆنسترەکشنی بکات؟**

بەڵێ. بەبۆچوونی دێریدا ئەگەر نووسین بە نوێنەری گوتار بزانین پێویستە گوتار بە نوێنەری رەسەنی بیرکردنەوە و ئاگایی سەیر بکەین. لەڕاستیدا دەبێت زاراوەکانی گوتار وەک سیمبولی ئەزموونە زهنییەکان دابنێین و زاراوەکانی نووسین بە سیمبولی زاراوەکانی گوتار سەیربکەین. لە زمانناسیشدا لە کۆنەوە لۆگۆس و گوتار وەک پێوەری لێکۆڵینەوە دانراوە. لەڕاستیدا دێریدا بە ئامادەبوونی مانا و ئەم عەقڵییەتە دەڵێت لۆگۆسێنتەریزم (Logocentrism). لۆگۆسێنتەریزم لە لۆگۆسی گریکی بەمانای عەقڵ، تەگبیر، گێڕانەوە و سەنتروم4 بەمانای تەوەر و سەنتەر و ناوەند وەرگیراوە. روونە لە زاراوەی لۆگۆسێنتەریزمدا هەم دال بوونی هەیە (گوتن و قسە) و هەم مەدلول (مانا، عەقڵ و هۆش). دێریدا ئەم بە بەرزترزانینەی گوتار بەسەر نووسیاردا لە فۆرمی فۆنۆسێنتەریزم و لۆگۆسێنتەریزمدا رووبەڕووی تەنگژە دەکاتەوە. دێریدا زاڵبوونی ئامادە5 بەسەر نائامادە6دا قبوڵ ناکات. بەبۆچوونی ئەو، گوزارە یان مانا شووناس و یەکێتیی نییە، بەڵکو هەر نیشانەیەک لەسەر بنەمای جۆرێک

4- Centrum
5- presence
6- absence

ڕێککەوتنی نێوان دال و مەدلول مانا پەیدا دەکات. لەڕاستیدا هەر ئەم ڕێککەوتنەیە، کە لەنێوان دال و مەدلولدا مەودا دروست دەکات و لەنێوان ئەم دووانەدا لایەنی دیفرانس۷ دێنێتەئاراوە.

**بونیادگەرایانی وەك دێریدا یەکەمین کەسانێك بوون گومانیان لە هەموو جۆرە پایەدارییەکی مانا لەنێوان دال و مەدلولدا کرد. دێریدا پەیوەندی نێوان دال و مەدلول بەرەو پانتاییەکی فراوان دەبات. ئەو باوەڕی وایە لەم پانتاییەدا تۆڕێکی بەرفراوانی ماناکان بوونی هەیە. ئێوە باستان لەوە کرد لە پلاتۆن بەدواوە کولتووری فەلسەفیی خۆرئاوا مەیلی بەلای گوتاردا بووە. بەدیدی ئێوە ئەم ئاراستەیە چ ئاکامگەلێکی بۆ کولتووری خۆرئاوا هەبووە؟**

پلاتۆن لە دیالۆگی فایدروس (بەندی ۲۷۷)دا باسی لە ئەولەویەتی گوتار بەسەر نووسیندا کردووە و دەڵێت نووسین جۆرێکە لە گەمەی منداڵانە، بەڵام لە بەرانبەردا گوتار (گوتن) وەک پرۆسەیەکی جدی و گرنگ سەیردەکات. دێریدا دەڵێت ئەم ئاراستەیەی پلاتۆن هەڵگری جۆرێک هەڵاواردن و دوورخستنەوە و پێشداوەری بووە دەربارەی نووسین، کە تا ئەمرۆکە بەردەوامی هەبووە. دێریدا دەڵێت ئەم پێشداوەریە تا ڕۆژگاری ئەمڕۆ و تەنانەت لە بەرهەمەکانی سوسێریشدا دەبینرێت. بەبۆچوونی دێریدا زۆرینەی فەیلەسوفانی هاوچەرخ وەک هوسەرل بەشێوەیەک دیلی نێو جۆرێک فەلسەفەی ئامادەن، کە سەرەنجامەکەی دۆزینەوەی ئامادەی شوناسی نێوان دەروونە لەگەڵ بوونی خۆیدا. پلاتۆن لە فایدروسدا بەڕواڵەت باس لە عەشق و عاشق دەکات، بەڵام لە بنەڕەتدا، باس لە پەیوەندی ڕەوانبێژی و گوتاربێژی لەگەڵ فەلسەفە و یان بە مانایەکی دی، پەیوەندی گوتار بە نووسینەوە دەکات و نووسینیش بەهۆی بزری مانا و نائامادەیی نووسەر، وەک شتێکی لاوەکی، بێ بایەخ و مەترسیدار سەیر دەکات. هەر لێرەدایە پلاتۆن نووسین (graphie) لەگەڵ دژەژەهر (pharmakon) بەراورد دەکات و دەڵێت نووسین وەک فارماکۆن هەڵگری مانایەکی ڕوون و یەکلاییکراوە نییە، بەڵکو گرێچنێک لە ئەگەرەکان لە هۆشی خوێنەردا بە زیندوویی ڕادەگرێت. لەڕاستیدا بزووتنی مێتافۆری لە جەمسەرێکەوە بۆ جەمسەری بەرانبەر، ئەو مانایەیە، کە لەم پرۆسەیەدا ڕیالیزە دەبێت.

---

۷- Différance لە کاتی گوتندا هەمان Difference دەگەیەنێت، بەڵام جیاوازییەکەی لەکاتی نووسیندا دەردەکەوێت، دێریدایش هەر ئەم مەبەستەی هەبووە، ویستوویەتی ڕەوایەتی بە نووسین بداتەوە، بەڕاستی کورد/عەرەب/فارس بە هەڵە زاراوەی "جیاوازی"یان پێشنیارکردووە، کە وەک لە پەراوێزی سەرەوە ئاماژەم پێدا زۆرینەی دانراوەکانی دێریدا نەشیاوی وەرگێرانن، بۆیە ئەم زاراوەیەش دەکەوێتە نێو ئەم چوارچێوەیە و تەنها لەناو تێکستدا دەتوانین تێیبگەین. ئەم زاراوەیە لەیەک کاتدا هەم "جیاوازی" و هەم "دواخستن"ی لەخۆیدا هەڵگرتووە، مەبەستی دێریدایش ئەویەە، کە مانا هەرگیز تەواو نییە، هەرگیز بەشێوەیەکی تەواو درک ناکرێت، بەڵکو هەمیشە لەدەرەوەی دەست پێگەیشتنی ئێمەیە و دوادەخرێت، یان دەرەنگ دەگات. هەر زاراوەیەک بەهۆی زاراوەیەکی دیکەوە پێناسە دەکرێت، کە ئەم زاراوەیەیش خۆی لەخۆیدا لەلایەن زاراوەیەکی دیکەوە پێناسە دەکرێت، لەبەر ئەوە، ئێمە هەرگیز ناتوانین بە تێگەیشتنێکی تەواوی مانایەکی سەربەخۆ بگەین، چونکە هەمیشە جیاوازیی لەگەڵ پێشەوەدا هەیە و دوادەخرێت. هەر بۆ ئەم دواخستنی مانایەش، دێریدا نموونەی چاپتەری لەبەرانبەر یاسای کافکا لەکتێبی دادگاییدا دەهێنێتەوە، کە کابرای دێهاتی بۆ هەمیشە لەبەردەرگای یاسا وەستاوە تاوەکو بچێتە ژوورەوە، بەڵام ڕێی پێنادرێت، لەسەرەمەرگدا دەرگەوان دەڵێت ئەمە هەر بۆتۆ کراوەتەوە، بەڵام کرانەوەکەی دواخراوە. (وەرگێڕ)

**دێریدا لە باسەکەیدا دەربارەی جەوهەری مێتافۆری نووسین و بەراوردکردنی بە فارماکۆن لە بەرهەمەکانی پلاتۆندا، زاراوەی supplement بەکاردەهێنێت. ڕۆڵی ئەم زاراوەیە و ماناکەی لەم پەیوەندییەدا چییە؟**

دێریدا لە لێکۆڵینەوە لە جەوهەری مێتافۆری نووسین، لەگەڵ مانای فارماکۆندا بەراوردی کردووە و باسی ئەو ئەفسانە میسرییە دەکات، کە لە فایدرۆسدا خراوەتەڕوو. لەم ئەفسانەیەدا ئێمە ڕووبەڕووی کەسایەتی تۆس٨ کوڕی پاشای ئامون دەبینەوە. ئامون خواوەندی خۆرە. دێریدا دەڵێت تۆس لەڕاستیدا جێنشین یان تەواوکەری ئامونە. زاراوەی supplementی فەرەنسی هەم بەمانای تەواوکردن (مکمل) و هەم بەمانای جێنشینیش دێت. لەڕاستیدا سەپلیمێنت هەم دەگشتێنێت و هەم تەواو دەکات و هەم ڕۆڵی جێنشینیش دەگێڕێت. لێرەدا پەیوەندی نێوان تۆس و ئامون، پەیوەندی پاشا و پرێنس (شازادە)یە و بە زمانی دێریدا ئەم شازادەیە هەم تەواوکەری پاشایە و هەم جێنشینی ئەویشە. لەڕاستیدا پرێنس هۆکاری بەردەوامی زنجیرەی پاشایەتییە، بەڵام هاوکات جێنشینی ئەویشە، واتا لەبری ئەو لەسەر تەختی دەسەڵاتی پاشایەتی دادەنیشێت. بە گوتنێکی دیکە، تۆس لەبەرانبەر بە باوکی خۆی دەوەستێت، بەڵام هاوکات خودی ئەو ئەزموونی پاشایانەی باوکی دووبارە دەکاتەوە، کەواتە ئەو لەبەرانبەر بوونی خۆی ڕادەوەستێت. بەم هۆیەوە دەتوانین بڵێین تۆسیش وەک نووسین و یان فارماکۆن بوونێکی ئاماژە، مێتافۆری و ئاڵۆزی هەیە. پلاتۆن دەڵێت دەتوانین تیوس٩ لە ئەفسانەکانی گریکدا لەگەڵ توسی میسری بەراورد بکەین.

**کاتێك دێریدا دەڵێت فەلسەفەی خۆرئاوا بەشێوەیەکی تاکلایەنە لەسەر لۆگۆس دامەزراوە، مەبەستی چییە و ئەم زاراوەی لۆگۆسێنتەریزمە لە فەلسەفەی خۆرئاوادا چ ڕوانگەیەکی هەبووە؟**

سەرەتا دەبێت ئاماژە بەوە بکەین مێتافیزیک بە شێوەیەکی گشتی بە کایەی جیهانی دەرککردنەوە خەریک دەبێت. کەواتە شتگەلێکی وەک حەقیقەتی ناوەکی، بوون، زانین، ئامادە، کات، شوێن، نەمری دەروون، باوەڕبوون بە خود بەگشتی دەکەونە نێو کایەی لێکۆڵینەوەی مێتافیزیکییەوە.
مێتافیزیکی خۆرئاوا هەمیشە بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانەی سەرەوە بەدوای بنەما و پرەنسیپێکدا (arche) گەڕاوە. لەڕاستیدا مێتافیزیک هەوڵیداوە تاوەکو بناغەی فەلسەفەی خۆی لەسەر بنەما و پێکهاتەیەکی تایبەت دابمەزرێنێت. لە سەردەمی پلاتۆن بەدواوە لۆگۆس وەک بونیادێکی پتەو، بنەمای لێکۆڵینەوە فەلسەفییەکان بووە. لۆگۆس لە کۆنەوە بە مانای جۆراوجۆری وەک عەقڵ، فکر، گوتن، گوتار، لێکۆڵینەوە، زانین و بنەمای عەقڵی بەکارهاتووە. دێریدا بەو بزوێنەرەی مێتافیزیکی خۆرئاوا دەخاتە نێو چوارچێوەی لۆگۆسەوە، دەڵێت لۆگۆسێنتەریزم یان عەقڵ تەوەری. لە فەلسەفەی

8- Thoth
9- Theuth



دیکارت

خۆرئاوادا حەقیقەت، زانین، بەها و جوانی لە پەیوەندییەکی نەچڕاودان لەگەڵ لۆگۆسدا.

دێریدا دەڵێت مێتافیزیکی خۆرئاوا لەسەر بنەمای ئەم بونیادە وەستاوە، کە پۆلێک دووجەمسەری ئامادە و نائامادە، جەستەو رۆح، مادە و هۆش، سروشت و کولتوور، فۆرم و ناوەرۆک و هتد دامەزراندووە، و جەمسەری یەکەمی بەسەر جەمسەری دووەمدا زاڵ کردووە و هەمیشە بزووتنی دیالەکتیکی لە جەمسەری یەکەمەوە بەرەو جەمسەری دووەم پەرەپێداوە. دێریدا ئەم هیرارشییەتە رەتدەکاتەوە و هەوڵی هەڵگەڕاندنەوە و دیکۆنسترەکشنی ئەم مێتافیزیکە دەدات.

**لە گریك بوو بۆ یەکەمین جار میتوس لای سۆفیستەکان گۆڕا بۆ لۆگۆس، واتا بیری فەلسەفی لە نێو روانینی ئەفسانەییەوە (mythos) سەری دەرهێنا و چەکەری کرد. ئەم پرۆسەیە بەهۆی ئەناکسیماندەر، هێراکلیتوس، و پلاتۆن و ئەریستۆتێلیس گیرایەبەر و ئەوکات لۆگۆس لەبەرانبەر بە میتۆس دانرا و کۆی فەلسەفەی خۆرئاوا لەسەر بنەمای لۆگۆس دامەزرا. بەبۆچوونی دێریدا پەیوەندی نێوان میتۆس و لۆگۆس چۆن سەقامگیر بووە؟**

دێریدا دەڵێت پەیوەندی نێوان ئەو دووانە بەرانبەرانەی باسکران، کە لە فەلسەفەی خۆرئاوادا هەن، چووەتە نێو پەیوەندییەکی لۆگۆس و میتۆسیشەوە. بەو مانایەی لۆگۆس بەردەوام لە بەرانبەر میتۆسدا خاوەن بەرزێتییەکی زیاترە. پەیوەندی نێوان میتۆس و لۆگۆس دروست وەک پەیوەندی لۆژیک بە رەوانبێژی، رەهەندی هەستەکی بەرانبەر بە رەهەندی عەقڵی، دەربڕدراو و حەقیقی بەرانبەر مێتافۆری، کولتوور بەرانبەر بە ناتور (سروشت) و هتد بووە. دێریدا دەڵێت رێبازی مێتافیزیکی نموونەی رەتکردنەوە یان کەم بەهاکردنی رەهەندی میتۆس و رەوانبێژی، رەهەندی هەستەکی و توخمی مێتافۆری و سروشت بووە، واتا یەکێکیانی خستۆتە پەراوێزەوە و ئەویدیکەیشیانی بە بنەڕەت داناوە. دێریدا بەردەوام هەوڵیداوە لۆگۆسێنتەریزمی فەلسەفی رووبەڕووی رەخنە بکاتەوە، دیکۆنسترەکشنی بکات و مەترسییە گریمانەییەکی پاسیڤ بکات و لای ببات. لەبەر ئەوەی روسۆ دەیگوت نووسین ئەڵتەرناتیڤێکی مەترسیدارە بۆ گوتار و بە شێوەیەکی گشتی وەک منداڵی جێگرەوەی لۆگۆس دادەنرێت. بە دەربڕینێکی دی، دەتوانین بڵێین نووسین پەیوەندی بە میتۆسەوە هەیە و لەبەر ئەوە پێویستە وەک شتێکی لاوەکی و مەترسیدار سەیر بکرێت.

**دێریدا بۆ باسکردن لە پەیوەندی نێوان چەمکە بەرانبەرییەکان و بۆ نموونە لۆگۆس/میتۆس، زاراوەی differance، بەمانای جیاوازی و دواخستن، بەکاردەهێنێت. ئەگەر دەکرێت کەمێك**

### دەربارەی ئەم زاراوەیە بۆمان بدوێیت؟

دێریدا بۆ باسکردن لە جیاوازی نێوان دال و مەدلول یان میتۆس و لۆگۆس زاراوەی differance ی بەکارهێناوە. لەڕاستیدا زاراوە فەرەنسییەکە بەشێوەیەکی گشتی مانای جیاوازی دەبەخشێت، لە زاراوەی differenceدا، دوای پیتی (r) پیتی (e) دەنووسرێت. دێریدا پیتی (a) لەبری پیتی (e) دادەنێت.

دێریدا دەڵێت پەیوەندی نێوان شتەکان و دیاردەکان بەهیچ جۆرێک بەرانبەر بەیەک یان دژبەری یەکتری نین، بەڵکو بریتییە لە دیفرانس (جیاوازی و دواخستن). لەڕاستیدا زاراوەی differance تەنها بەمانای جیاوازی نایەت، بەڵکو داخستن و دواخستنیش دەبەخشێت. دێریدا دەڵێت کاتێک باس لە پەیوەندی نێوان دال و مەدلول، میتۆس و لۆگۆس، حەقیقەت و خوازە (مەجاز)، ئامادە و نائامادە و هتد دەکەین، پێویستە دووربکەوینەوە لەو خێرایی و نائارامییەی لە یەکلاییبوونەوەی مانا و مەدلولەکانەوە سەرچاوە دەگرن و شتەکان بە رامان و دواخستن و وردبوونەوەیەکی زیاترەوە هەڵبسەنگێنین.

ئەو زاراوەی differance بۆ پەیوەندی نێوان نووسین و گوتار، کردار و ناو، دال و مەدلول، هەستەکی و عەقڵانی بەکارهێناوە و دەڵێت نابێت هیچ یەکێک لەم زاراوە دوانەتییە تەنها بە لایەنی دژ و بەرانبەری زاراوەی یەکەم دابنێین، بەڵکو پێویستە پەیوەندیی نێوانیان بخوێنینەوە و لێیان رابمێنین. زاراوەی differance خۆی هەڵگری مانایەکی مێتافۆری، ئاماژەیی و ناجەختە و رامانی لێدەکەوێتەوە. ئەم مانایە دەبێتە هۆی ئەوەی ئێمە پێداچوونەوە بۆ تێگەیشتنە رۆژانەییەکانی خۆیشمان بکەین و چەمکگەلە بەرانبەر و دژەکان بە ئاسانی قبوڵ نەکەین، بەڵکو بیر لە پەیوەندی ئەودیوی ئەو پەیوەندییە دانراوانە بکەینەوە، کە لەلایەن پرۆسەیەکی باوەوە لەئارادان. بە دەربڕینێکی دی، نابێت ببینە دیلی مانا تاکرەهەندییەکان، بەڵکو دەبێت بیر لە پانتایی فرەلایەنی ماناکان بکەینەوە و بە شێوەیەکی گشتی، لە تاکڕوانین دوور بکەوینەوە.

### دێریدا لە پێداچوونەوەی بەسەر سیستەمی فەلسەفیی خۆرئاوادا سوژەی دێکارتی بە جۆرێك "منایەتی" تەعبیر دەکات. مەبەستی ژاك دێریدا لەم ئیگۆسێنتەریزمە چییە و لە چ سەردەمێکدا ئەم رەوتە دزەی کردۆتە نێو بیری فەلسەفیی خۆرئاواوە؟

بەو جۆرەی دەزانیت زاراوەی ego بە "خود" یان "من" وەرگێڕدراوە و زاراوەی centrismیش لە centrumـەوە وەرگیراوە، کە مانای ناوەند و تەوەری سەرەکی دەبەخشێت. بەبۆچوونی دێریدا، لە سەردەمی دێکارتەوە "من" یان "خود" وەک سوژەی بیرکەرەوە، بونیادی بیرکردنەوەی فەلسەفی، یان logosێکی سەرەکی دروستکردووە. کاتێک باسی ئاگایی، فکر و سوژەیەتی "من" بوو بە خولیای سەرەکی فەلسەفە، ئەوسا "خود" یان "من" جۆرێک سەنتەریزمی فەلسەفیی وەرگرت.

دێکارت (ego cogito)ی بۆ باسکردن لە بیرکردنەوە بەکارهێنا. کانت ئەمەی خستە نێو پانتایی ئەزموون و عەقڵانییەتەوە و بوونی مرۆیی دابەشکرد بۆ خودئەزموونی (empirical ego) و خودترانسێندێنتاڵی (transcendental ego). فەیلەسوفە ئەزموونگەراکان رەهەندی تێگەیشتنی "خود"یان خستە بەرباس و توێژینەوە و فەیلەسوفە عەقڵگەراکانی وەک سپینۆزا و لایبنیتز و هوسرل باسیان لە رەهەندی ترانسێندێنتاڵی "خود" کرد و شیکاریان کرد. روون و ئاشکرایە لە سەدەی حەڤدەهەم بەدواوە سوژەیەتی "خود" بنەما و بناغەی کۆی باسە فەلسەفییەکانی پێکهێناوە. بەم هۆیەوە دێریدا ناوی لەم رەوتە ناوە "ئیگۆسێنتەریزم" و وەک یەکێک لە ئاراستە سەرەکییەکانی فەلسەفەی خۆرئاوا ناساندوویەتی.

**ئایا ئەو ئیتنۆسێنتەریزمەی(ethnocentrism) (ئەتنیك سێنتەری) دێریدا باسی دەکات بەراورد بە ئیگۆسێنتەریزم (هەڵبەت لە ئاستێکی دیکەدا) پەیوەندی بە کولتوور یان ئەتنیکێکی تایبەتییەوە هەیە؟**

دێریدا لەباسەکەی دەربارەی پەیوەندی نێوان گوتار و نووسیار (نووسین)دا خەریکی شیکارکردنی بەرهەمەکانی لیڤی شتراوس و بەتایبەت گەرمیانییە خەمبارەکان (triste tropique) بووە و باس لەوە دەکات، کە بەپێی ئەم بەرهەمانە، هەندێک لە کۆمەڵگاکان بەخشش و کەرەمی نووسینیان نییە. دێریدا دەڵێت بانگەشەیەکی لەمجۆرە راست نییە. بە گوتەی ئەو، هیچ کۆمەڵگایەک بێ نووسین نییە، تەنانەت لەو کۆمەڵگایانەی ئاگایان لە ئەلفابێت نییە، نیشانەکان، مارکەکان، و بەرهەمە کۆڵراوەکان بەجۆرێک ئەرکی نووسین لەئەستۆ دەگرن. لەراستیدا، تەوتەم لە وێنە و تابلۆکاندا، کە بە جەستەی تاکەکانی هۆزەکەوە هەڵدەواسرێن، نموونەی نووسینن. هەرچەند زۆرینەی فەیلەسوفان باسیان لەوە کردووە گوتار پێش نووسین دەرکەوتووە، بەڵام دێریدا دەڵێت لە هەموو شوێنێک زمان هەیە، نووسین بەو مانایەش بوونی هەیە و زمانی گوتار و نووسین بەیەکەوە دەرکەوتوون، کەواتە نابێت زمانی گوتار بە بەرزتر و لەپێشتر بزانین لە زمانی نووسین.

**کەواتە دێریدا دەڵێت شیکارییە ئەنترۆپۆلۆژییەکانی-لیڤی شتراوسیش وەك بیرمەندانی دیکەی خۆرئاوا، بووەتە دیلی مێتافیزیکی ئامادە؟**

بەڵێ، چونکە ئەویش بە دروستکردنی بەرانبەرێتی نێوان گوتار و نووسین خەریکی ئەوە بوو تاوەکو باڵایەتی کولتووری خۆرئاوا بسەلمێنێت و بڵێت کولتووری نووسینی خۆرئاوا، لەراستیدا، پایەیەکی باڵاتر لە رەوتی شارستانێتیدا دەخاتە بەردەست و ئەمەیش ئەو شتەیە، کە دێریدا ناوی دەنێت ئیتنۆسێنتەریزمی ئەوروپایی.

**دێریدا لە رەوتی پێداچوونەوە بەسەر سیستەمی فەلسەفی خۆرئاوادا، خەریکی رەخنەکردن و**

**پێداچوونەوەدا بە بیرە سیاسیی و کۆمەڵایەتییەکانی مۆدێرنیتەش بوو. لەم رووەوە، باسەکانی ئەو لەسەر مارکس، هەمیشە تەنگژەئامێز و هەندێکجار، پارادۆکسیکەڵیش بووە، بە شێوەیەکی گشتی ئاراستەی دێریدا بۆ مارکسیزم لەسەر چ بنەمایەك دامەزراوە و ئایا ئەو، پرۆپۆزشن و چەمکە مارکسییەکانیش وەك درێژەپێدەری هەمان مێتافیزیکی ئامادە سەیر دەکات؟**

دێریدا لە کتێبی تارمایی مارکسدا باس لەوە دەکات، کە دەبێت بەرهەمەکانی مارکس و لینین بە شێوەیەکی ورد بخوێنرێنەوە و دەقەکانیان بخرێتە بەردەم دیکۆنسترەکشنەوە. لەڕاستیدا، بەخوێندنەوەی دووبارەی بەرهەمەکانی ئەم دوو بیرمەندە، دەتوانین دیفرانسی ئەوان لە ئاراستەی یۆتۆپیایی ئەوان جیابکەینەوە. دەشێت ئایدیاکانی مارکس وەک نموونەی مۆدێرنی مێتافیزیکی ئامادە سەیر بکرێت. دێریدا دەڵێت پێویستە مێتافۆر و ئاماژەکانی ماتەریالیزمی دیالەکتیکی دەربهێنین و جەوهەرەکەیان بەباشی بخەینە بەردەم لێکۆڵینەوەوە. لەڕاستیدا بە دیکۆنسترەکشنی دەقە مارکسیستییەکان دەتوانین پەی بە ناوەوەی مێتافیزیکی وەک حەقیقەت، زانین و ئەو بەها مێتافیزیکییانە ببەین، کە لەسەر بنەمای سنوردارکردنە عورفییەکان دروست بوون. بەجۆرێک دەتوانین بڵێین فەلسەفەی ماتەریالی مارکس بە لایەنی ئابووری و ماتەریالی لۆگۆسێنتەریزم دادەنرێت. مارکسیستەکان خۆیان لەناو ئابڵوقە میتافۆریەکاندا زیندانی کردوە، کە خۆیان لە جەوهەرەکەی بێ ئاگان و وەک حەقیقەت و ئیلهام سەیری دەکەن. بەبێ ئەوەی ئاگایان لەوە بێت، کە پرۆپۆزشن و چەمکە مارکسیستییەکان شتێک نین جگە لە یارییەکی زمانی تایبەتی و سەرەنجام دێریدا باوەڕی وایە مارکس و مارکسیستەکان بەوازهێنان لە "رۆح" رەهەندێکی بەرفراوانیان فەرامۆش کردووە.

هەڵبەت نیۆمارکسیستەکانی وەک تێری ئێگلتۆن و فرەدریک جیمسن وەڵامی چواندن و رەخنەکانی دێریدایان داوەتەوە.

بەڵێ! ئەوان باوەڕیان وایە دیکۆنسترەکشن یەکێکی دیکەیە لەو رێبازانەی، کە پەیوەندییەکانی وەبەرهێنانی کرێکار و سەرمایەداریان لە خەرمانەیەکی زاراوە داخراوەکاندا شاردۆتەوە و تێگەیشتنی مرۆیی لە ناسینی راستی ئەم پەیوەندییانە دووردەخاتەوە.

**کەواتە پەیامە سیاسی - کۆمەڵایەتییەکانی بیری دێریدا چۆن هەڵدەسەنگێنیت و بە دیدی ئێوە دێریدا چ روانگەیەکی بۆ ئەم بوارانە هەیە؟**



دریدا

دێریدا لە بەرهەمەکانی خۆیدا دوور نەکەوتووەتەوە لە فاکتەری سیاسەت و دەڵێت پێویستە دەق و نووسراوە سیاسییەکان دیکۆنسترەکشن بکرێن. ئەو مانیفستۆی سەربەخۆیی ئەمەریکا و نووسراوەکانی روسۆ و فەیلەسوفانی دیکەی دەربارەی دێمۆکراسی هەڵسەنگاندووە و بە تایبەت عەقڵانییەتی رۆشنگەریی وەک هێزێکی سیاسیی هەڵسەنگاندووە و دەڵێت شوناسی ئەورووپایی دەرگیری پرسگەلێکی وەک ئیمپریالیزم، راسیزم، ئیتنۆسێنتەریزم و یۆرۆسێنتەریزم بووە. ئەو وتارگەلی زۆری بۆ رووبەڕووبوونەوەی رەگەزپەرستی، ستەمکاری خۆرهەڵاتی و بەتایبەت بۆ پشتگیریکردنی بزووتنەوە پێشکەوتووە مەدەنییەکان، داماڵینی چەکی ئەتۆمی و ئاگایی ژینگەیی بڵاوکردووەتەوە. هەندێک خودی بزووتنەوەی دیکۆنسترەکشن وەک بزووتنەوەیەکی شۆڕشگێڕی بۆ رەخنەکردنی بونیادە تۆتالیتارییەکانی خۆرئاوا سەیر دەکەن. روون و ئاشکرایە، کە ئەو رەوتی چەپ و راست وەک شتێکی سەرچاوەگرتوو لە ئاراستەی مێتافیزیکی ئامادە دەبینێت. پێویستە دیکۆنسترەکشن توێژینەوە و گەڕانێکی تازە لە بواری بەرپرسیارێتی کۆمەڵایەتی و ناسینی رەمزە ئەخلاقی، کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان دەست پێبکات.

**پێدەچێت پەیامە فکری و کۆمەڵایەتییەکانی بیری ژاك دێریدا بۆ ئێمەیش سوودمەند بێت. کەواتە چۆن دەشێت بۆچوونەکانی دێریدا لە چوارچێوەی کولتوور و کۆمەڵگەدا و بە شێوەیەکی گشتی پرۆسەی رۆشنبیری ئێستای کۆمەڵگەی ئیرانی، روویان تێبکرێت؟**

فەلسەفەی دێریدا پێمان دەڵێت خۆمان دەرگیری بەرانبەرێتی و دژبەرییەکانی چەمکگەلی بڕاوە (قطعی) و بێ چەندوچون نەکەین، بەڵکو خوێندنەوەی بەردەوامی دەق ئێمە بەرەو رەهەندی ناکۆتایی مەدلولەکان دەبات. ئایدیاکانی دێریدا هەرجۆرە ئاراستەیەکی فۆرماڵی دەخاتە بەردەم لێکۆڵینەوە و دیکۆنسترەکشنەوە. هەرچەند لە خۆرئاوا بەشێک لە بیرمەندان دەڵێن سەردەمی ئایدیاکانی دێریدا سەرەتاکانی دەیەی نەوەد بوو، و ئەمڕۆ بۆچوونەکانی ئەو چیتر کار ناکەن، بەڵام ئاراستە فەلسەفییەکانی ئەو رێگەیەکی دیکەی روانینە بۆ دیاردە کۆمەڵایەتی، کولتووریی و سیاسییەکان. بەتایبەت روانینی ئەو بەندە لەسەر بیرکردنەوەی دیکە و قبوڵکردنی ئەویدیکە و راکردن لە هەرجۆرە یەکێتییەکی تۆتالیتارییانە، و هەروەها راکردن لە بەرانبەرێتی و دژبەرێتییەکانی وەک باش و خراپ، رەسەن و ناڕەسەن، و هتد ئێمە ئاراستەدەکات بۆ ئاناتۆمیکردن بۆ ئیدیۆلۆژییە زاڵەکان و توخمە پێکهێنەرەکانیان و بەتایبەت هێڵ و سنوورە رەهەکانی نێوان دوو جەمسەری سیاسیی خود و ئەویدیکە، دۆست و دوژمن، راست و درۆ، رووکەش و قوڵ، قبوڵکردن و رەتکردنەوە. ئاراستەی دێریدا دەتوانێت کۆمەکمان بکات بۆ تێگەیشتن لە پرۆسە ئاڵۆزە کۆمەڵایەتی — سیاسییەکانی کۆمەڵگەی خۆمان.

سەرچاوەی ئەم وەرگێڕانە

اندیشەهای فلسفی در پایان هزاره دوم، گفتگو با محمد ضیمران، نشر هرمس، تهران، ۱۳۸۰، ص۱۸۹-۲۰۵.

# عەلمانییەت واتا ڕێزگرتن لە هەموو ئاینەکان نەک ڕەتکردنەوەیان

## هەڵبژاردەیەک لە گفتوگۆی (ڕامین جەهانبەگلو) لەگەڵ (دالایی لاما)

(دالایی لاما) ڕێبەری ڕۆحی تبتییەکان، یەکێکە لە مەزنترین ڕێبەرانی مەزهەبی لە دونیادا کە ئاشتیخوازییەکەی بە گرنگترین خەسڵەتی ناوبراو دادەنرێ... سەرۆکی لیژنەی خەڵاتی نۆبڵیش لە ساتی بەخشینی خەڵاتدا، (دالایی لاما)ی بە گاندی بەراورد کرد.
ناوبراو تەمەنی (٢٤) ساڵ بوو کە لە ترسی دەستگیرکردن، بە پێی پەتی بەرەو هیندستان هەڵات. حکومەتی تاراوگەی دامەزراند و خەڵاتی نۆبڵی ئاشتیشی پێبەخشرا. هەنوکە (دالایی لاما) سیمبولی لێبوردەییە. ئێستا کەم کەس ناوە ڕاستەقینەکەی لەیادە. ئەو (دالایی لاما)ی چواردەهەمە.

لەفارسییەوە: کارزان محەمەد

***بەڕێز (دالایی لاما)، ئەمڕۆ ناوبانگ و نفوزت لەو کۆمەڵگا (٦) ملیۆنە تبتییە تێپەڕیوە، لە پلەی پارێزەری ویژدانی جیهانیدای. هەرگیز لە ڕابردوودا (دالایی لاما) ئەو گەشتە زۆرانەی ئەنجام نەداوە و نەچۆتە ژێرباری ئەو هەموو بەرپرسیارێتییەوە. مۆڵەتم دەدەی لە بەڕێزتان بپرسم ڕاز و**



**نهێنی ئەم ژیانە چییە؟ چۆن لەیەك كاتدا ئەو هەموو کاروبارە بەرفراوانە دەگریتە ئەستۆ؟**

-پێموایە پەیوەندی بە میکانیزمی کارەکانمەوە هەبێت. دەزانی سەرجەم ئایینەکان باس لە بایەخی خستنەگەڕی عاشق، بەخشندەیی، لێبوردەیی و ئەم چەشنە کارانە دەکەن. لە ئایینی بوداشدا (میهرەبانی) بنەما و بنچینەیە. بەدڵنیاییەوە ئاگاداری هەردوو دابونەریتی پاڵی و سانسکریتیت کە لەنێو دڵی ئایینی بودادایە. لە دابونەریتی سانسکریتیدا، میهرەبانی تەنها هەستی هاوخەمی بۆ کەسانی دیکە نییە، جۆرێکە لە سپاردنی ئەرک و بەرپرسیارێتیش بە کەسانی دیکە. بەشێک لەم کارەش سەرتاپای بوونمە. نەک تەنها من، بەڵکو سەرجەم ئەو کەسانەش دەگرێتەوە کە بوونی خۆیان لە ڕێگای خزمەت بە کەسانیتردا بەخت دەکەن. ئەمەش نەک تەنها لەم ژیانەدا، بەڵکو لە ژیانی کۆتاشدا هەر بەم چەشنەیە. ئایینی بودایی ئەم ئەرک و بەرپرسیارێتییە دەسەپێنێ. نمونەیەکت بۆ بهێنمەوە، ڕاهیبێکی بودایی کە ئێستا تەمەنی (٨٥) ساڵە، لە دوای ساڵی (١٩٥٩)ەوە ماوەی (١٨) ساڵ تەمەنی خۆی لەناو زیندانەکانی وڵاتی چیندا گوزەراند. لە سەرەتای (١٩٨٠) سەردانی کردم، چونکە چینییەکان مۆڵەتیان بە هەندێ لە تبتییەکان بەخشی کە بتوانن لە تبت بچنە دەرێ. لە گفتوگۆیەکدا لەگەڵ ئەو

ڕاهیبە، بە منی گوت لەو (١٨) ساڵەی لە زینداندا بووم، ڕووبەڕووی کۆمەڵێ مەترسی ببوومەوە. دەربارەی ئەو مەترسیانە پرسیارم لێکرد، بە منی گوت خراپترین مەترسیم، ترس بووە لەوەی هەستی میهرەبانی و پێکەوەژیان لەهەمبەر چینییەکاندا لە دەست بدەم.
پێموایە خۆڕاگری و پێکەوەژیان هێندە گرنگە ئەگەر زیانی پێبگات، مرۆڤایەتیش دەکەوێتە مەترسییەوە. من ڕەنگە لە ئاستی ئەو ڕاهیبە تبیتیەدا نەبم، ڕەنگە مرۆڤێ بم کە سنور ببەزێنم، بەڵام توانام هەرچەند بێت و لە هەر پلەیەکدا بم، دەبێ بەهەر چەشنێک بێت خزمەتی کەسانی دیکە بکەم. هەست دەکەم وەک بودابیەک و هەم لە پۆستی دالایی لامادا، ئەو چانسەی بۆ من وەک دالایی لاما ڕەخسێنراوە، بە بەراورد لەگەڵ ئەو ڕاهیبانەدا لە هەلومەرجێکی باشتردام بۆ خزمەت بە کەسانی دیکە. هەربۆیەشە سود لەو دەرفەتە وەردەگرم. هەرکاتێک بەم چەشنە ڕووبەڕووی ژیان بوویتەوە، هەست بە ماندووێتی ناکەی. ڕاز و نهێنی ژیانم ئەمەیە.

***پێدەچێ وتەکانت دەربارەی ناتوندوتیژی و پێکەوەژیان زۆر کاریگەر بن، چونکە پتر جەخت لەسەر ڕەهەندەکانی ئاشتیخوازیی هزری ئایینی دەکەیتەوە؟**

-خۆم بە لایەنگر یاخود خوێندکاری (مەهاتما گاندی) دادەنێم و دۆستی (دایکە تریزا)م، بەڵام جیاوازی نێوان من و مەهاتما گاندی لەوەدایە کە گاندی پێشڕەوە و ڕێگای نیشاندام، منیش ئەو بە سەرمەشق دەزانم و بە ڕێگاکەی ئەودا هەنگاو دەنێم. بەم شێوەیەش، بێگومان لە سەردەمی ئێمەدا و لە کۆتایی سەدەی بیستەم و سەرەتای سەدەی بیست و یەکەمدا، ئێمە هێندەیتر زانستیتر بووین و نەرمونیانییەکی زیاترمان لە تێڕوانینی خۆماندا نواندووە. (مەهاتما گاندی) قەدیسە بەڵام من مرۆڤێکی گچکەم. وێڕای ئەمانەش، ستراتیژی من بۆ هزری ناتوندوتیژی پشتی بە فێربوون نەبەستووە، بەڵکو وابەستە بە ئەقڵێکی کاملەوە. هەرکاتێک دەربارەی ناتوندوتیژی دەدوێم، ئەو هزرە بۆ بودا یاخود دابونەریتێکی دیکەی ئایینی ناگێڕمەوە، تەنها قسە لەسەر ئەزموونە هاوبەشەکان دەکەم. توندوتیژی واتا ئازار، مەسەلەی ئاشتی و ئارامیش تەنها بەمانای (نەبوونی ئازار) نایەت، بەڵکو ڕێگایەکە بۆ پشتیوانی و پارێزگاری لە شادی و خۆشبەختی. ئامانجەکەشی خۆپاراستنە لە ئازار و هەڵزنانە بەرەو سەرچاوەی بەختەوەریی دڵ و دەروون، ئەوەش چ لە ڕێگەی دەستکەوتی زانستییەوە بەدەست بهێنرێ یاخود بە ئەزموون و تێگەیشتنی هاوبەش. من دەربارەی ژیانی دوای مردن یاخود سەبارەت بە خوداوەند نادوێم... لە ڕوانگەی مەسیحیی یاخود جولەکەیەکەوە من بێ ئایینم، لەهەمانکاتدا کۆمۆنیستەکان من بە خاوەن ئایین دەزانن. ڕەنگیشە لەنێوان هەردوو بۆچوونەکەشدا بم!. هەندێکجار ئایینی بودایی بە پردێ ناودەبەین... ڕادیکاڵەکانیش ئایینی بودایی هەر لە بنەڕەتدا بە ئایین

دانانێن، دەڵێن جۆرێکە لە زانست و مەعریفەی زیهنی، کەواتە ئاینی بودایی پەیوەندیشی لەگەڵ زانستدا هەیە.

*ئەگەر بە گوتەی جەنابت هزری ئایینی بەمانای ئەقڵی کامڵ و تەندروست بێت، ئەوا دەبێ ئەوەش قبوڵ بکەین کە دونیای ئێستا دونیای توندوتیژییە، کەواتە ئەقڵی کامڵ و تەندروستمان لەدەست داوە؟

-بەڵێ! بە بڕوای من، دونیای ئێمە ئەقڵی کامڵ و تەندروستی لەدەست داوە. وازهێنان لە ئەقڵی کامڵ و تەندروستیش دوو جۆری هەیە. یەکەمیان کاتێ ئەقڵی کامڵ و تەندروست لەدەست دەدەین و شێت دەبین. جۆری دووەم (٢٠) کاتژمێر ڕەفتارێکی سروشتیت هەیە، دوای چەند کاتژمێرێ دووچاری تورەیی دەبیت. لەو چەند ساتەدا چۆنییەتی بیرکردنەوەی مرۆڤ بەبێ بوونی ئەقڵێکی کامڵ و تەندروستە، چونکە بنەمای ئەقڵی کامڵ لەسەر بیرکردنەوەی ئەقڵانی بونیادنراوە، کاتێ زیهن پڕ لە تورەییە لە توانایدا نییە ئاقڵانە کار بکات. هەربۆیەشە لەو ماوەیەدا ئەو کەسە مرۆڤێکی شێتە. ئەم شێتیەش لە شێتی ئاسایی خراپترە. ئەم دوو تێکچوونەی مێشک لەگەڵ یەکتردا بەراورد بکە! نمونەی یەکەم کەسەکە شێتە بەڵام دەست لە کاروباری نادروست وەرنادات. دەربارەی نمونەی دووەم، کەسەکە گرفتاری تورەیی بووە و لە ڕەوتی بیرکردنەوەی سروشتیانە دەچێتەدەرێ، ئەمەیان خراپترە چونکە دەتوانێ کارەساتی جۆراوجۆر بخوڵقێنێ.

بۆنمونە کەسێک هەمیشە درۆ دەکات، لەبەرئەوەی هەمووان دەزانن مرۆڤێکی درۆزنە، کەس متمانەی پێ ناکات و درۆکانیشی مەترسیدار نین. لەهەمانکاتدا ئەگەر مرۆڤێکی ڕاستگۆ و ڕاستبێژ درۆ بکات، زۆر مەترسیدارە. لەم ڕوانگەیەوە مرۆڤێ (٢٤) کاتژمێر شێت بێت، هێندە مەترسیدار نییە، بەڵام گەلێکجار مرۆڤە زۆر ئاساییەکانیش دووچاری شێتی دەبن، هەروەک هەندێ لە ڕێبەرە سیاسییەکانمان لە جیهانی ئەمڕۆدا. ئەم مرۆڤانە بەڕاستی ترسناکن.

***لە دیدگای تۆوە، پێویستە چۆن و بە چ شێوازێ ئایینە جۆراوجۆرەکان پێکەوە کار بۆ گەیشتن بە ئاشتی لە جیهاندا بکەن؟**

-لە هەنگاوی یەکەمدا پێویستمان بە پەیوەندی تاکەکەسی و تایبەتی هەیە کە زۆر بنەمایەکی بنچینەییە. پێویستە لەتەک یەکتردا دابنیشین و یەکتر بناسین و ئەزموون پێکەوە ئاڵوگۆڕ بکەین. پاشان دەتوانین خاڵە لێکچووەکان بدۆزینەوە، بۆ نمونە لە سەردەمی منداڵیمدا لە (لەهسا) لە (تبت)، هەندێ موسڵمان لەوێ دەژیان. کۆمەڵگایەکی گچکەی موسڵمانانی هیند بەلایەنی کەمەوە ماوەی چوار سەدە بوو کە لە تبت ژیانیان بەسەردەبرد، لە دۆسییەی ئەم موسڵمانانەدا هیچ جۆرە کێشمەکێشمێ نەبوو، کۆمەڵێ خەڵکی زۆر ئارام و میهرەبان بوون.

باشە، ئەگەر پێوەری ئێمە ئەم موسڵمانانە بێت، ئەوا دەتوانین بڵێین موسڵمانانی




هیند و لاداخ، مرۆڤگەلێکی زۆر بە سۆز و میهرەبانن. خودی منیش لەڕێگەی پەیوەندییە تایبەتییەکانمەوە، کۆمەڵێ هاوڕێی موسڵمانم لە هیندستان هەیە. موسڵمانانی هیند، بەتایبەتی موسڵمانانی لاداخ زۆر لە منەوە نزیکن.

ساڵی رابردوو فرسەتم بۆ ڕەخسا و بۆ یەکەمینجار سەردانی وڵاتی ئەردەنم کرد، هەندێ لە پیاوە ئاینییەکانی ئیسلامم لەوێ ناسی کە زۆربەیان مامۆستای زانکۆ و لێکۆڵیار و خوێندکاری موسڵمان بوون. هەموویان زۆر ڕووخۆش بوون و ڕەفتارێکی زۆر دۆستانەیان نواند. لە ڕوانگەی منەوە، بەجێهێنانی ئەرکە ئاینییەکانی وەک پێکەوەژیان و عیبادەت و لێبوردەیی لای موسڵمانان و بوداییەکان وەکیەکە. تەنانەت مەسیحی و موسڵمان و جولەکە یەک خودایان هەیە. لە ئایینی مەسیحدا کاسۆلیک و پرۆتستان هەیە، لە ئیسلامیشدا جیاوازییەکی کەم لەنێوان شیعە و سوننەدا هەیە. بەمشێوەیە جیاوازی لەنێو بوداییەکانیشدا بەرچاو دەکەوێت، تەنانەت لەناو بوداییەکانی تبتدا بۆ نمونە جیاوازی ڕەنگی کڵاو بایەخێکی ئەوتۆی نییە، بەڵام لە ڕوانگەی خەڵکە نەخوێندەوار و نەزانەکەوە ڕەنگی کڵاو گرنگە. بەم پێودانگەش کۆمەڵێ جیاوازی لەنێوان موسڵمانان، مەسیحی و هیندۆسەکاندا زەق دەکەنەوە. ئەمەش سەرەتای ناخۆشییەکانە، هەر لەم ڕوانگەیەشەوە میدیاکانی خۆرئاوا و هەندێ لە لێکۆڵیارانی خۆرئاوا، موسڵمانان

بە هاوشێوەی تیرۆریستان دەناسێنن. هەندێکجاریش هاوڵاتییەکی خۆرئاوایی دەگاتە ئەو بیروباوەڕەی کە پێکدادانێ لەنێوان شارستانییەتی خۆرئاوا و جیهانی ئیسلامدا لەڕوودانداییە، بەڵام لە ڕاستیدا هیچ پێکدادانێ نییە. پێموایە کاتێک دەڵێم شارستانییەتی خۆرئاوا، مەبەستمان لە شارستانییەتی مۆدێرنە. مۆدێرنێتە پتر بەمانای تەکنەلۆژیایەکی زیاتر دێت. کۆمەڵگای مۆدێرن کۆمەڵگایەکی پیشەسازییە. بەمشێوەیە مۆدیلێکی دیکەی کۆمەڵگای مرۆیی دێتەئارا، وڵاتانی ئیسلامی و هیندیش ئەم قۆناغەیان بڕیوە. وڵاتێکی بودایی وەک تایلەندیش لە ڕەوتی مۆدێرنیزمدا هەنگاو دەنێ، ئەمە مۆدیلێکی ژیانە. لەسەر ئەم بنەمایە ناتوانرێ جیاکارییەک لەنێوان خۆرئاوایی و ناخۆرئاوایی دا دابنێین، بەڵام لە دنیای ئێستاماندا لە هەرکوێیەک ڕێبازی ژیان جیاواز بێت، شێوای بیرکردنەوەش جیاوازە. کەواتە جیاوازییەکە لەنێوان مۆدێرن و نامۆدێرندایە نەک لەنێوان شارستانییەتی خۆرئاوا و جیهانی ئیسلام. تا ئەو شوێنەی ئایین لە ئارادابێ، بە بڕوای من ئیسلام لەڕیزی مەسیحی و جولەکەدایە و ئەمانەش گرنگترین ئایینی جیهانن. هەمیشە ئەمەم بە ڕاشکاوییەوە گوتووە. هەنوکەش چەمکی تاکە هەقیقەت و تاکە ئایین لەسەر ئاستی تاکەکەس گرنگە. بۆ نموونە من بودایم کەواتە ئایینی بودایی تاکە ئایین و تاکە هەقیقەتە و ئایینی بودایی لای من باشترینە، بەڵام ناتوانم بڵێم کە لەلای هاوڕێ مەسیحییەکەشم ئایینی بودایی تاکە ئایین و تاکە هەقیقەتە. مەسیحییەت واتا هەقیقەت و تاکە ئایینی هاوڕێ مەسیحییەکەم. پێویستە هەردووکیشمان دوو ئایین و دوو هەقیقەت قبوڵ بکەین. لەسەر ئاستی کۆمەڵگا دەبێ چەندین هەقیقەت و ئایین قبوڵ بکرێت. کاتێ موسڵمان لە نێو خۆیاندا ناوی خوداوەندێک دەهێنن کە خودای تاک و تەنهایە ئەمەش بەتەواوەتی کارێکی شیاوە، بەڵام ناتوانێ ئەمە بەسەر هەموو دونیادا بسەپێنێ و دووچاری نائاسودەیی دەبێتەوە. من ئەگەر بمەوێ بە سەرجەم دونیای بسەلمێنم کە ئایینی بودایی باشترین ئایینە، دەبێتەمایەی خوڵقاندنی نائاسودەیی. لەم ساتەشدا ئەو چەشنە بۆچوونە هەرگیز واقیعبینانە نییە، خودی بوداش هەرگیز هەوڵی نەداوە هەموو جیهان بەرەو ئایینی بودایی ڕابکێشێ. هەندێ لە مەسیحییەکان هەوڵیان دا ئایینەکەیان بەسەر سەرجەم دانیشتوانی دونیادا بسەپێنن، هەندێ لە موسڵمانانیش هەمان ڕەفتاریان دووپات کردەوە، بەڵام هەردووکیان شکستیان خوارد. لێرەشدا پێویستمان بە ئەقڵێکی کامڵە. ڕاستە حەزرەتی مەسیح گوتویەتی کە گوتە و وانەکانم دەگاتە دوورترین شوێن، واتا گێڕانەوەی مرۆڤایەتی بەرەو ئایینی مەسیحی، بەڵام لە سەردەمی حەزرەتی مەسیحدا ئەو دونیایەی دەناسرا، ڕووبەرێکی گچکەی هەبوو. ئەو گوتەیە لەو چەرخەدا واقیعبینانە بوو. پێویستە ئەقڵی کامڵ بخەینەگەڕ، کەواتە ئەگەر بڵێین لەبری

یەک ئایین و یەک هەقیقەت چەندین دین و هەقیقەتمان هەیە، هیچ ناتەباییەک لەم گوتەیەدا نییە. زۆرجار بۆ نمونە دەرمانێ دەخەینەڕوو، ناتوانین بڵێین کە تەنها یەک دەرمان دەوای هەموو دەردەکانە، بەڵام بۆ نەخۆشییەکی توند دەشێ ئەو دەرمانە باش یاخود خراپ بێت... هەر دەرمانێکیش بەپێی نەخۆش و نەخۆشییەکەیەتی.

***یەکێك لەو کارە سەرەکییانەی بایەخت پێداوە و گرنگیت پێبەخشیوە (مەعنەوییەتی نەریتی)ە، زۆر سەرنجراکێشە کە ئەم مەسەلەیە لەلایەن کەسایەتییەکی مەزهەبییەوە بخرێتەڕوو.**

لە یەکێک لە نوسینەکانتدا ئەوەم خوێندەوە کە جیاوازی لە نێوان (مەعنەوییەتێکی خاوەن باوەڕ و مەعنەوییەتێکی بێ باوەڕ) دا هەیە، چۆن دەشێ کەسێک مەعنەوی بێت بەڵام مەزهەبی نەبێت؟.

- (ڕوانین) لە ڕوانگەی نەرێتەوە، بە بڕوای من بە مانای نەبوونی ئایین نایەت. من چەمکی نەرێتگەرایم بەو چەشنە بەکارهێناوە کە لە دەستوری هیندستاندا هاتووە. لە دەستوری هیندستاندا، عەلمانییەت واتا ڕێزگرتن لە هەموو ئایینەکان نەک ڕەتکردنەوەیان. کەواتە لە پرەنسیپی ئەخلاقیانەی تێڕوانینەکانی مندا، عەلمانییەت واتا ڕێزگرتن لە هەموو دابونەریتەکان، بەڵام لە ڕاستیدا بایەخی میهرەبانی، بەخشندەیی و نەرمونیانی پشتی بە ئەقڵێکی کامڵ و تەندروست بەستووە.

با هەستی خۆشەویستی بە نمونە بهێنینەوە، ژیانمان لە سەرەتای لەدایکبوونەوە بە میهر و خۆشەویستی دەست پێدەکات، بەبێ خۆشەویستی ناتوانین بژین. پێویستمان بە سۆزی دایک یاخود خۆشەویستی کەسێکی دیکە هەیە کە چاودێریمان بکات. کۆرپەلەش بە تەنها توانای ژیانی نییە، هەمیشە پێویستی بە کەسانی دیکە هەیە تا بەخێوی بکەن، بەڵام چاودێری و سەرپەرشتی تەنها لەبەر ئەرک نەک لەبەر خۆشەویستی، بەس نییە. پێکەوە پێویستمان بە چاودێری و خۆشەویستییە. زانستی پزیشکی مۆدێرن، پەیوەندی جەستەیی لە پرۆسەی پەروەردەکردنی مێشکدا زۆر بە گرنگ نرخاندووە. کەواتە ژیانمان بەم چەشنە دێتەئارا، لە ساڵانی سەرەتای ژیانمان ڕۆڵی کەسانیتر لە چاودێری و سەرپەرشتی ئێمەدا، ڕۆڵێکی ژیارییانەی بۆ گەشەمان هەیە، بەڵام سەرەنجام ئێمە گەورە دەبین، هەست بە سەربەخۆیی دەکەین و چیتر پێویستمان بە سەرپەرشتی کەس نابێ. پاشان وێنایەکی درۆ لەناوماندا سەرهەڵدەدا، لەو بڕوایەدام سروشتە سەرەکییەکەمان لە قۆناغی منداڵیدا تەڕوتازەییەکی زیاتری هەیە، پاشان هۆش و زیرەکیمان زیاتر و ئاڵۆزتر دەبێت، بەها بنچینەییەکانیش دەپارێزین، بەبێ هەوڵدانیش دەتوانین جۆرەها وزەی خۆمان لە زەمینەی جۆراوجۆردا بخەینەگەڕ.

چەندینجار ئەو بیروباوەڕەم لەلا گەڵاڵە بووە کە ئەگەر کۆمەڵێ کەسی وەک هیتلەر و ستالین، لە سەرەتای لەدایکبوون و قۆناغی منداڵییەوە لە ژیانێکی سروشتی و نۆرماڵدا بژیانایە، لە

قۆناغی گەورەیدا هێندە ستەمکار و توندوتیژ دەبوون؟. کەواتە سۆز و خۆشەویستی دایک زۆر گرنگە، چونکە ژیانمان لەگەڵ میهری دایکدا دەست پێدەکات، ئەم ئەزموونەش پێویستە تا لێواری مەرگ هەر لەیادمان بێت، لەم ڕوانگەیەوە سۆز و میهرەبانی لە خێزان و کۆمەڵگاکەمان و مرۆڤایەتیدا بایەخێکی گرنگی هەیە.

بیروباوەڕە بنچینەییەکانم لەسەر بنەمای ژیانێکی ڕاستەقینە و میکانیزمی ژیان بونیادنراوە. ئەو کەسانەی لە هەلومەرجێکی سروشتی ژیاندا شادمان و بەختەوەرن، بێگومان تەندروستییەکی جەستەیی باشتریان هەیە. بە ئاشکرا دەتوانین ئەوە بڵێین کە چ کێ لەنێو خێزانێکی پڕ سۆز و میهرەبانیدا هاتۆتە دونیا. منداڵانی بەختەوەر و لێو بەخەندە لەڕووی جەستەییەوە گەشەیەکی باشتر دەکەن، لە هەمانکاتدا ئەو منداڵانەی لەژێر باری ستەم و لێداندان، لەڕووی جەستەیی و ڕۆحییەوە ڕەنجدیدەن. سەرجەم ئەو هەست و سۆزە سودبەخشانە، بنەمای بەختەوەری و سەرکەوتنمانە و بە خەسڵەتی سەرەکی مرۆڤایەتی دێنەهەژمار، بەڵام ئیرەیی و ڕقیش لە سوچێکی هزرماندا هەیە و ئەگەر لە تەنهایی دا پەرەبستێنێ، کەسەکە ئارامی خەیاڵ لەدەست دەدات، دووچاری بەدهەرسی و فشاری خوێن و چەندین نەخۆشی دەبێت. بەمانایەکی دیکە لە ڕوانگەی بایۆلۆژیشەوە هەندێ لەو وروژاندن و هەڵچوونانە بۆ تەندروستیمان زۆر زیانبەخشە، هەندێکیشیان دەشێ سودبەخش بن. کەواتە دەتوانین جیاوازی لە نێوان هەڵچوونی سودبەخش و زیانبەخیش بکەین.

*لەناخی خۆتدا هەست بە هیچ جۆرە توندوتیژییەک دژ بە چینییەکان ناکەی؟ ئایا چینییەکان بۆ تەندروستی تۆ، باشن یا خراپ؟.

-پێموایە مەسەلەی چینییەکان زۆر جدییە، بەڵام هەستی نەفرەتم بەرامبەریان نییە. هەندێکجار ڕەنجدان و مەسەلەی گچکە دێنەپێش، با بۆت باس بکەم: ماوەیەک لەمەوپێش دیدارێکم لەگەڵ هەواڵنێرێکی تەلەفزیۆنێکدا هەبوو، بەو خانمە هەواڵنێرم گوت ئەگەر زنجیرە پرسیارێکی بێسەروبەرە بکەی، ئەوا توڕە دەبم. خانمە هەواڵنێرەکە پرسیاری دەربارەی ئایندە لێکردم. پێمگوت لە پۆستی ڕاهیبێکی بودایی دا بیر لە ئایندە ناکەمەوە، بەڵام تا ئەو ئاستەی بتوانم لەم ژیانەدا یاریدەدەر دەبم، بەڵام ئەگەر پتر لە ئەندازە لە بیری ناوبانگدا بم، کارە باشەکانیشم خراپ دەبن و لە ناخمدا دەبێتە پاڵنەرێکی خودپەرستانە. ئەو خانمە جارێکیتر ئەو پرسیارەی دووبارە کردەوە و هەمان وەڵامم دایەوە. بۆ جاری سێیەم هەمان پرسیاری خستەڕوو، منیش توڕە بووم. بەڵێ، ساڵی ڕابردوو ئەم خانمەم لە نیویۆرک بینی و ئەو یادەوەرییەمان هاتەوەیاد و پێکەوە پێکەنین.

***پێتوایە جارێکیتر تبت دەبینیتەوە؟**

-بێگومان، بەپێی بارودۆخی جیهان، گۆڕانێکی

زۆر پۆزەتیف لە چین دێتەئارا. چینییەکان زیاتر لە ڕابردوو، ئینتیمای خۆیان بۆ ئایینی بودایی تبتی و کلتورەکەی نیشان دەدەن. مامەڵەیەکی باشتر لەگەڵ تبتیش دەنوێنن، لەسەر ئاستی باڵای حکومەتیش زۆرجار بیری توندڕەویی زاڵە. لەم ڕۆژانەدا کە حکومەتی چین لەناوخۆی وڵاتەکە و کۆمەڵگاکەی خۆیدا ڕووبەڕووی کۆمەڵێ گیروگرفت بۆتەوە، زیاتر ئومێدم بە ئایندەی تبت هەیە. بێگومان ئامانجمان سەربەخۆیی یاخود جودابوونەوەی تەواوەتیمان لە چین و خەڵکەکەی نییە. دەمانەوێ بگەینە خۆبەڕێوەبەرییەک تا بتوانین کلتور و باری مەعنەوی و ژینگەی خۆمان بپارێزین.

ژیان لەگەڵ خەڵکی چیندا، پێشبینی پێشکەوتنی باری ئابوری بەرزتر دەکاتەوە. بۆ (٦) ملیۆن تبتی لە نیشتیمانێکی پانوبەریندا دەژین، هەنگاونانیان بەرەو پێشکەوتن بە تەنها کارێکی ئەستەمە. ئەگەر لەگەڵ چینییەکاندا بمێنینەوە، لە ڕوانگەی ئابورییەوە لە قازانجی ئێمەدایە و باشتر بەرەو پێشەوە دەچین. ئەمە بنەمای بیرکردنەوەمە، یەکێتی ئەوروپا ببینە کە تیایدا بەرژەوەندی هاوبەش لە بەرژەوەندییە تاکەکەسییەکان گرنگترە.

***لە بنەڕەتدا هەردوو ڕۆڵی ئایینی و مەعنەوی و ڕۆڵی سیاسی پێکەوە بگریتەئەستۆ، ئایا زۆر دژوار نییە؟ ئایا ئاشتەوایی لەنێوان ئەم دووانەدا ئاسانە؟**

-تائێستا چالاکییە سیاسییەکانم خەبات بووە لەپێناو ئازادیدا. مەبەستم لە ئازادی، ئازادی ئایینییە و ئازادی کلتوری تبتییە. کەواتە ئەو چەشنە سیاسەتەی کاری تیادا دەکەم، بەشێکە لە بەرنامە مەعنەوییەکەم. هەرکاتێک سیاسەت بە حیزبی بکرێت، ئەوا کاری تیادا ناکەم. ئەم مەسەلەیەشم لە ساڵی (١٩٩٢ز) دا بەتەواوەتی ڕۆشن کردەوە کە هەرکاتێ تبت ئازاد بوو، ئەوا ئەم دەسەڵاتە کەمەم بە کەسانیتر دەسپێرم و وەک هاوڵاتییەکی ئاسایی تبتی دەژیم. بەڕاستی خزمەت بە کەسانی دیکە، بە گرنگترین کار دەزانم.

***کەواتە بەلای تۆوە، دیموکراسی واتا خزمەت بە کەسانی دیکە؟**

-بەڵێ، بێگومان! بەرهەمی دیموکراسی پێویستە بگاتە کۆمەڵگا، ئەویش بریتییە لە چاکەخوازی و ڕێزگرتن لە کەسانی دیکە. لە ساڵی (١٩٥١ز)ەوە کە ئەم بەرپرسیارێتییەم گرتەئەستۆ، هەمیشە دابینکردنی دیموکراسیم لە بەرنامەدا بووە. لە ساڵی (١٩٥٩ز) ەوە هاتمە هیندستان، لەو سەردەمەوە خەباتم لەپێناو بونیادنانی دیموکراسی لە تبتدا کردووە. ئێستاش هەر (٥) ساڵ جارێک، نوێنەرانی خۆمان بەشێوازێکی تەواو دیموکراسییانە هەڵدەبژێرین، منیش پۆستێکی نیمچە خانەنشینکراوم لە ئەستۆدایە.

**سەرچاوە:**

هفتەنامە اینده، شمارە ویژە بە ادیان، تیر ١٣٩١.

# کچێک لە ڕەنگی زیو

چیرۆکی: جەلیل قەیسی
لەعەرەبییەوە: نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد



جەلیل قەیسی

کاتژمێر دووی نیوەشەو بوو، خامۆشییەکی بێدەنگ سەرانسەری ئەو ناوچەیەی گرتبوو کە تیایدا نیشتەجێ بووم، بگرە ئەو بێدەنگییە هەموو شاری تەنیبوو... شارە بچکۆلەکەم، لەو شارانەیە نازانێت وەک شارە پڕ لە ژاوەژاوەکان تا درەنگ نەنوێت، گومانم هەیە تەنانەت لە جەژنەکانیشدا نازانێت تا درەنگ نەنوێت.. لەپاش کاتژمێر دەی شەو وەک کۆترێکی نەرم و جوان خەو دەیباتەوە، وەک چۆن ئێستا لەژێر ئاسمانی شیندا خەوی لێکەوتووە، ئەستێرەکانیش لەشێوەی گوڵزار جوانترین درەوشانەوەیان هەیە و بەبێدەنگی بۆنی عەترێکی رۆحی و کەرنەڤاڵی بڵاو دەکەنەوە.

تەنها کەسێک لە ئاسمانی شاردا لەگەڵ ئەستێرەکاندا بێدارە، ئەو بێخەوە نەمرەیە: مانگ، کە لە شەمامێکی گـەورە دەچـێ، بەتەنها بەنێو هـەوادا دەڕوات و هەستەکانی داخستووە و لەنێو جیهانی خۆیدا سڕ بووە.

دەشێت لەوێدا چەند پاسەوانێکی شەوانە هەبن، خەیاڵی ئـەوە دەکـەم کە دانیشتون، یان جگەرە دەکێشن یاخود پشتیان بەم یان بەو دیوارەوە داوە، بە پەرۆشەوە چاوەڕێی دەرکەوتنی یەکەم گزنگی بەیانی دەکەن تا بچنەوە ماڵەکانی خۆیان.

لەم چرکەساتەدا، بە سەبری عاشقێکی نەخۆش، چاوەڕێی تەلەفۆنی ئەو کچە هاوڕێیەم بووم کە بەشێوەیەکی شەیتانانە هاتەنێو ژیانە هێمنەکەی منەوە، وای لێکردم پڕ پڕ بم لە خەیاڵ تا ئەندازەی وڕێنەکردن، ئەو کچە لەسەر جۆرێک لە خۆشبەختیی فریودەرانە رایهێناوم، بەجۆرێک ژیانی گۆڕیوم هەرچەند پتر دابگیرسێت روونتر و شەفافتر دەبێت.

من لەم مەنەلۆگەدا بووم، لەپڕ، هەوری تیشکێکی زیوینی گەش و داگیرساو، سەرانسەری حەوشە فراوانەکەی ماڵەکەم و بەتایبەتی باخچەکەمی تەنی، ئەم تیشکە زیوییە، بەخێراییەکی سەرسوڕهێنەر، لەو پەنجەرە گەورەیەی دەڕوانێتە باخچەکە، خۆی کرد بە ژوورەکـەمـدا... خودایە، تیشکێکی سەیرە و هەرگیز لەژیانمدا شتی وام نەدیوە... هەرگیز... گومانم هەیە لەوەی ئەم تیشکە نامۆیە تیشکێکی ئاسایی و سروشتی بێت... لەژوورەکە هاتمە دەرێ، بارستاییەکی زۆرم لەو تیشکە بینی شەپۆلی دەدا وەک بڵێی بارستاییەکی گەورەی جیوە بێت... تاوێک دەڕژا و تاوێک غاری دەدا و تاوێکی دی شێوەی لاکێشەی دەگـرت و... ئینجا لەپڕێکدا بەشێوەی بازنەیی شکڵی دەگرت... لەناکاو و زۆر بەخێرایی شێوەی باڵندەی وەرگـرت و ئیدی زۆر بەناسکی لەسەر گژوگیاکە نیشتەوە و هەموو شتێکی گۆڕی بە رەنگی زیـو... ئـەوەی کە سەیر بوو بەلامەوە بەهیچ شێوەیەک سڵم نەدەکردەوە و بەهێمنی و شێنەیی و بە فزوڵەوە چاودێریم دەکرد، هەوڵم دەدا ئەو رەنگە جوانانەم لەکیس نەچێت کە تیشکەکە دروستی دەکـردن، هەستە زۆر ناسکەکەی منیش بچوکترین گەردیلە و لەرەکانی دەگرت... بۆ یەکەمین جار لەژیانمدا درەخت و بەروبوم و گژوگیای رەنگ جیوەییم بینی... بەخۆگری لەشوێنەکەی خۆمدا وەستام و توشی شڵەژان نەبووم و بیریشم لە هەڵاتن نەکردەوە. بگرە ئەوەی لەم ساتەوەختەی مندا سەیر بوو، ئەوەبوو هەرچەندە لەو تیشکە رادەمـام، پتر خۆم دەگرت و پتر دادەگیرسام و... فزولی تر و بەهێزتر دەبووم.

تیشکەکە بـە هێمنییەکی جـوان، رێـک وەک شانۆگەرییەکی رۆمانسی، کوژایەوە، لەبری ئەوە تیشکێکی هێمن و قەشەنگ جێگای گرتەوە کە هانی گەشانەوەیەکی رۆحیی دەدا. لەپڕ ... و... بە جوڵانەوەیەکی سوکەڵە و شۆخ و وروژێنەر... کچێک دەرکەوت لە رەنگی زیو... چەند نیگایەکی چڕ و درێژی بۆ ناردم و پاشان وەک کەروێشکێکی

سپی خۆی خستە سەر گژوگیاکە، بە پەنجە ناسکەکانی دەستی لە گوڵەکان و بەروبومەکان دا و بە جوڵانەوەیەکی شانۆیی جوان ئاماژەیەکی بۆ کردم، وەک بڵێی ماوەیەکی زۆرە دەمناسێت، پاشان چەند هەنگاوێکی کورت لێم نزیک بۆوە و بەگەرمی دەستی بۆ درێژ کردم و دەستە ناسکەکەی خستە نێو دەستم... لەسەرەتادا بە زمانێکی نامۆ قسەی لەگەڵدا کردم هیچی لێ تێنەگەیشتم... من بە زمانی عەرەبی و ئینگلیزی و فەرەنسی و کوردی و تورکمانی، ئەو زمانانەی بەچاکی قسەیان پێدەکەم، پێم وت: بەخێر بێیت بۆ شارەکەم... بۆماڵەکەم... ئەگەر تۆ یەکێک لەم زمانانە دەزانیت کە لەگەڵتدا قسەیان پێدەکەم، ئەوا زۆر خۆشحاڵ دەبم گفتوگۆت لەگەڵدا بکەم، ئەگەر هیچ یەکێک لەم زمانانە نازانیت ئەوە خۆشحاڵ دەبم بەزمانی ئاماژە قسە بکەین... ئێستاش فەرموو وەرە ژوورەوە.

بەشێوەیەکی شانۆیی جوان و وەک گوڵێکی سپی جوڵانەوەیەکی بۆ کردو وتی: بە زمانە عەرەبییە بێگرێکەتدا وادیارە عەرەبیت...

پاشان لەپڕێکدا بە ئینگلیزی لێی پرسیم: وادیارە تۆ زۆر ئاساییت و هەست بەهیچ شڵەژانێک ناکەیت...

وەڵامم دایەوە: بێگومان، من زۆر ئاساییم، هیچ شتێکیش نامشڵەژێنێ...

بەعەرەبی پێی وتم: ئایا ئەم تیشکە کاری لێ نەکردیت؟

- نەخێر... لەوانەیە باوەڕم پێ نەکەیت پێت بڵێم ئەو تیشکە بۆ جۆرێک لە گوێهەڵخستنی ڕۆحی هانی دام...

- ئاه... جوانە... دیارە تۆ هەستێکی ناسک و شاعیرانەت هەیە...

بەچەند هەنگاوێکی شۆخانە هاتە ژوورەکەم... باڵایەکی مامناوەندی و، ڕوخسارێکی ناسک و جوانی هەبوو، هەروەها پێستێکی سپیی نەخشاو بە شەپۆلی گوڵڕەنگ، جلوبەرگێکی نامۆی لە ڕەنگی زیوی پۆشیبوو... کڵاوە سەیروسەمەرەکەی لەسەری لابرد و... قژە درێژ و سپییەکەی داهێنا... ئەمجارە بەزمانی کوردی لێی پرسیم وەک بڵێی بیەوێ دڵنیا بێت لەوەی من ئەو زمانانە دەزانم کە بەخێرهاتنم پێکرد:

- ئەو کاتەی من گەیشتم، تۆ چیت دەکرد؟

- منیش بە کوردییەکی ڕەوان وەڵامم دایەوە: خەریکی خوێندنەوەی ڕۆمانی (ئازارەکانی ڤارتەر)ی شاعیری ئەڵمانی (گۆتە) بووم، هەروەها گوێم لەمۆسیقا دەگرت... بە ڕاشکاوی پێت بڵێم، جاروبار مەستییەکی سۆزاوی دامدەگرێت بۆ کچە هاوڕێکەم کە بەڵێنی پێداوم لەنیوەی شەودا تەلەفۆنم بۆ بکات...

لەگیرفانی پانتۆڵەکەیدا ئامێرێکی بچکۆلەی دەرهێنا و بەپەنجە جوانەکانی کەمێک یاریی پێکرد، پاشان ڕووی تێکردم و بە زەردەخەنەوە ئەمجارە بەزمانی تورکمانی پێی وتم:

- ئا... خەریکی خوێندنەوە بوویت... جوانە... جوانە...

ئینجا بە عەرەبی وتی:

- ئەی عەرەبی جوان... ئەزانی تۆ پیاوێکی خۆگریت و ئەعسابت بەهێزە. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا دوچاری مەستبوونێکی سۆزاوی دەبیت بۆ کچە هاوڕێکەت... بەڵێ تۆ پیاوێکی ڕاستگۆ و... ئازایت...

- ئەو مرۆڤەی بە ڕاستگۆیی هەست بە ئەوین بکات و... هەروەها هەست بە زریانی ڕیتمەکانی بکات، ئەوا بێ خواستی خۆی مەستبوونی عاتیفی دایدەگرێت...

- ئەمە ڕاستگۆییەکی ترە لە هەستەکانی تۆدا.

- تۆ وتت من ئازام. بۆچی؟

- ئاه... سەرسام بووم بە هێزی خۆگریت، هەروەها

بەهێمنی و ساردییەوە هەڵسوکەوتت کرد کاتێک لەساتەوەختی نیشتنەوەمدا چاودێریی تیشکی ئامێرەکەی منت دەکرد... دیسان دیالۆگی هێمنانەت لەگەڵ مندا... ئەمە لای من مانای ئازایەتییەکی زۆر دەگەیەنێت.

- هاهاها... بەراست؟

- بێگومان. چونکە بەرلەوەی بە ڕێکەوت روو لەم شوێنە بکەم، ویستم لە شارێکی تردا بنیشێمەوە و تەماشام کرد خەڵکی هەڵدەهاتن... کەچی تۆ، تا ئەم چرکەیەش زۆر هێمنیت و بەچەند زمانێک بەخێرهاتنم دەکەیت... سەرباری ئەوەی نازانیت من کێم و... لەکوێوە هاتووم و... چیم دەوێ...

- ئەمە راستە... لە روخساری تۆدا گەشانەوەیەکی زیندوو و نامۆ هەیە نیشانەی دڵنیاییە...

- سوپاس بۆ وشە جوانەکانت... هاهاها... گەشانەوەیەکی زیندوو و نامۆ؟! ئایا ناکرێت من ئەو کچە هاوڕێیەت بم کە چاوەڕێ دەکەیت تەلەفۆنت بۆ بکات...

- نانا... مەحاڵە... ئەو بەهیچ شێوەیەک لە تۆ ناچێت.

- باشە. ئێستا پێم بڵێ، ئەو کاتەی تیشکە بەهێزەکەت بینی بەنێو باخچەکەتدا بڵاو دەبێتەوە... لەبەر خۆتەوە چیت دەووت؟

- وتم ئای ئەمە رۆشناییەکی بەهێزە لە رەنگی زیو، رۆشناییش شتێکی موبارەکە.

- ئەی باشە تۆ ئێستا بە روونی دەمبینیت، هەست بەچی دەکەیت... و... بەکێم دەچوێنیت؟

- ئایا زانیاریت هەیە دەربارەی بودیەت یان بودیزم؟

- من زانیاریەکی دەوڵەمەندم هەیە سەبارەت بە کولتووری هەسارەکەی ئێوە.

- خوایە گیان... ئەوە تۆ ئەڵێی چی؟

- من راستی دەڵێم.

- باشە... هەست بەوە دەکەم... دەگەمە سەرووی خەم و خۆشییەکان.

- ئاە... تێگەیشتم... وشەی سانسکریتی نێرفانا

- واتە خامۆشبوون - بەڵام تۆ لەگەڵ بودیزمی نوێدایت، تۆ لەگەڵ دەرچووندایت لەبازنەی ئازار و گەیشتن بە سەرووی خەم و خۆشیەکان... گوێ بگرە، بەڵام تۆ پێت نەوتم بە کێم دەشوبهێنیت؟

- تۆ لە یەکێک لە کچانی وڵاتەکەم دەچیت... لەوەدا جیاوازیت کە هەموو شتێک لە دەموچاوی تۆدا بچووکە... تۆ وەک بووکەشوشە وایت... پۆشاکە زیوینەکەیشت سەرنجراکێشە...

- ئایا وەک کچە هاوڕێیەکت پێم رازی دەبیت؟

- نا نا نا...

- من لە یەکێک لەکچانی وڵاتەکەت دەچم!

- من تۆ ناناسم... پاشان تۆ لە جیهانێکی ترەوە هاتوویت... ئینجا من شێتانە کچە هاوڕێکەی خۆم خۆشدەوێت.

- بەراستی تۆ شایستەی «لقەدرختی غار»یت وەک پاڵەوانەکان.

- بۆچی؟

- لەبەرئەوەی تۆ زۆر هێمن و لەسەر خۆیت... باشە، بەرای تۆ من سەر بە چ جیهانێکم؟ کێ ئەم جۆرە جلانە لەبەردەکات؟

- بە راستی ئەمە پۆشاکێکی سەیر و نامۆیە... تۆ لە پیاوانی بۆشایی ئاسمان دەچیت... بیرم دێ لەیەکێک لە تیاترۆخانەکانی ئەوروپادا ئافرەتێکم بینی لەو چەشنە جلەی پۆشیبوو. هەروەها لە یەکێک لە شانۆکانی بەرشەلۆنەدا ئافرەتێکی ترم بینی لەو جۆرە جلەی لەبەردا بوو و سەمای دەکرد. ئایا تۆ ئیسپانیت؟

- نا نا نا... ئەتوانم سەمایەکی ئیسپانیت پێشکەش بکەم؟



- هاهاهاها... ئێستا نا ئازیزەکەم... ئێستا کات زۆر درەنگە... خەڵکی لەقوڵایی خەودان...

- تێگەیشتم... تۆ گەنجێکی باش و راستگۆیت...

- سوپاس...

هەستاو لێم نزیک بۆوە، ناولەپی دەستی بەسەر سەرم و روخسارمدا هێنا و، پاشان سینەم و... پشتم و... وەک پزیشکێک کە نەخۆشەکەی دەپشکنێت... دواتر بەهەنگاوی سووک بەنێو ژورەکەمدا گەڕاو بە وردی تەماشای کتێبخانەکەمی کرد، هەروەها ئەو تابلۆیانەی بەسەر دیوارەکەدا هەڵواسرابوون... ئاوڕی لێدامەوە و وتی:

- ئایا هەست بەهیچ نەخۆشییەک ناکەیت؟

- نا نا...

- دەڵێی نا..!! بەڵام وەک من تێبینی دەکەم تۆ بەراستی دوچاری هەندێ حاڵەت بووی...

- هەندێ حاڵەت؟ هەندێ حاڵەتی وەک چی؟

- تۆ ئێستا، ئەگەرچی تەمەنت گەیشتۆتە بیست و پێنج ساڵ، بەڵام دوچاری دابەزینی پەستانی خوێن بوویت.

- چیی تر...

- ئازارێکیش لە فەقەراتتدا هەیە...

ئەمجارەش بە راستیی پێشبینییەکەی سەرم سوڕما، لە ئازاری زۆرم و لە بێتوانایی حەبی ڤۆڵتارین و پرۆفین لەکەمکردنەوەی ئازارەکەم... بە وردی سەیری دەموچاوە منداڵانەکەیم کرد و، وتم:

- چی تریش دەبینیت؟

- تۆ دوچاری سووتانەوەی جومگەکانیش بوویت...

- زۆر راستە... چۆنت زانی، چۆن بەبێ پشکنین

و شیکردنەوە ئەمانەت زانی..!
- من توانایەکی زۆرم هەیە بۆ زانینی شتە هەرە ئاڵۆزەکانیش، لای من زەحمەت نییە بگەمە شوێنە ئەستەمەکانی جەستەت... و... هەروەها دەروونت...
- لە نوژداریدا؟
- لە هەموو شتێک.
- هەموو شتێک؟ مەحاڵە.
- ئەم وشەیە دووبارە مەکەرەوە... تۆ بەم ئاستە زەینییەی ئێستاتەوە ناتوانیت لەمن تێبگەیت... من بە سادەیی زۆر لەسەرووی توانا زەینییە دیاریکراوەکەی تۆوەم...
- خوایە گیان، بۆچی؟
- من بەرەنجامی شارستانیەتێکی زۆر پێشکەوتووم... ئەزانی بۆچی تۆ تا ئەم ساتەوەختەش بەخەبەریت؟
- بۆچی؟
- چونکە تۆ چاوەڕێی تەلەفۆنی کچە هاوڕێکەتیت... ئەم بوکەشوشە مرۆییە بە سۆز و گەرمییەکی زۆرەوە قسەم لەگەڵدا دەکات. دەمتوانی لەمیانی پێستە زۆر سپیەکەیەوە دەمارەکانی دڵ و هەموو جەستەی ببینم... چۆن زانی من چاوەڕێی تەلەفۆنی کچە هاوڕێکەمم.
بەهەمان ئەو ئامێرەی کە پێشتر بەپەنجە ناسکەکانی گەمەی بەدوگمەکانی دەکرد، تیشکێکی لەڕەنگی پلاتینی گرتە سنگ و حەوزم، دوای ئەوەی تیشکەکەی لێ دوورخستمەوە، هەستم بە باشی کرد، ئەو وتی: لێرە بەدوا هەست بەسووتانەوەی جومگەکان ناکەیت و دوچاری دابەزینی پەستانی خوێنیش نابیت و ئازاری بڕبڕەکانیشت نامێنێت... کچە هاوڕێکەشت کە چاوەڕێی تەلەفۆنی ئەو دەکەیت... هەر ئێستا پەیوەندیت پێوە دەکات...
هەر کە وای وت، دەمودەست زەنگی تەلەفۆنەکەم لێیدا... کچە هاوڕێکەم بەگەرمی داوای لێبوردنی کرد کە درەنگ پەیوەندیی پێوە کردووم. ئێمە بە ئارەزوویەکی زۆرەوە قسەمان کرد و موغازەلەی یەکدیمان کردو هەروەها گلەییمان لەیەکتر کرد. بەڵام من داوای لێبوردنم لێکرد کە هاوڕێیەکی ئازیزم لایە و ئەمشەو پێکەوە دەبین، ئەو زۆر باوەڕی نەکرد، بەڵام ماچی بۆ ناردم و تەلەفۆنەکەی داخست.
سەیری کچەکەم کرد و... چەند نیگایەکی دوورودرێژمان گۆڕییەوە و... من لەگەڵ خۆمدا دەموت: ئاخۆ ئەم کچە کێ بێت؟... چیی دەوێت؟... بۆچی لە هەموو ئەم شارەدا تەنها ماڵی منی هەڵبژاردووە؟! ئەو وتی بە ڕێکەوت لە باخچەی ماڵەکەی مندا نیشتەوە... ڕێکەوت... ڕێکەوت... ئەم تێزە زانستییە نامۆ و ئەفسوناوییە کە بەشداریی لە خولقاندنی بەشی زۆری شارستانیەتی ئێمەدا کردووە... ئاخۆ ئەو شتانەی چاوەڕوان نەکراون و ئەو شتانەی پێشبینی ناکرێن، هەر ئەمانە نین کە زانیاریی نوێمان بۆ دەهێنن؟
پاشان نازانم بۆچی بەشێوەیەکی نائاگایی وتم: ئایا ئەم کچە، رفێنەرە؟
رفێنەر!! بەگاڵتەپێکردنێکی جوانەوە خەیاڵەکەی پێ بریم... ئەو بیری منی خوێندبۆوە، وتی: رفێنەر!! مەبەستت لەوشەی رفێنەر چییە؟
لە بەکارهێنانی ئەم وشەیە پەشیمان بوومەوە، بەڵام ساتی پاشگەزبوونەوە بەسەرچوبوو، شاردنەوەی وردترین و بچوکترین بیرۆکە لەم مرۆڤە مەحاڵە... من وتم: ئازیزەکەم، رفێنەر بونەوەرێکی خورافی و بەدکارە، نیوەی ژنە و نیوەکەی تری باڵندەیە...
بە سوعبەتێکی جوانەوە وتی: بەڵام من هەموو جەستەم ئافرەتە... باوەڕ بکە من هەرگیز نەگریس و بەدکار نیم...
ئەم وشانەی دەوت و لەچاوە جوان و بچوک و مەنگۆلییەکانیدا تەنها نەرمی و دڵپاکیم دەبینی. بە داوای لێبوردنێکی زۆرەوە پێم وت: ببوورە...

بەراشكاوی دان بەوەدا دەنێم تۆ مرۆڤێكی زۆر جوانیت، ئافرەتی تەمومژاوی ئافرەتێكی بەدكارە... بەڵام تۆ... خوایە گیان... تۆ هەرگیز بەدكار نیت... من تەنها لە تەمومژبوونی تۆ تێناگەم...

- بە راستی من ئافرەتێكی تەمومژاویم؟

- لای من بەو شێوەیەیت... هێزی پێشبینیەكانی تۆ مەترسیدارە. گرنگ جارێكی تر داوای لێبوردن ئەكەم لەبەكارهێنانی وشەی رفێنەر... ئایا بۆم هەیە بپرسم تۆ كێیت؟

- من كێم؟... ئایا پێویستە بزانیت من كێم؟ و سەر بە چ جیهانێكم؟

- ئەی هاورێ رێكەوتەكەم... من فزولی نیم... مرۆڤێكم فزولم كەمە... بەڵام مرۆڤێكی وەک من كە بەم نیوە شەوە درەنگە بەم ئەزمونە نامۆیەدا تێدەپەڕێت... كە ئاگای لەخۆیە و خەو نابینێ و لەبەردەم ئافرەتێكی ناسک و جواندا وەستاوە، ئافرەتێک پڕە لە جوانیی رۆح... بێگومان لەم حاڵەتەدا دوچاری وێڵگەیەک لە پرسیار دەبم...

- زۆر راستە... زۆر راستە... بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سەرسامم بە خۆگریت... كەواتە تۆ هەر سووریت بزانیت من كێم؟

- بێگومان...

- پێش ئەوەی وەڵامت بدەمەوە، وەرەو لێم نزیک بەرەوە... ئایا ئەزانیت پارچە ئاسنێكی بچووک لەشوێنێكی هەستیاری جەستەتدا هەیە... پارچەی بۆمبە...

من لەجێی خۆم وشک بووم كە ئەو ئاماژەی بۆ شوێنێكی زۆر هەستیاری جەستەم دەكرد... ئەو وتی: لەماوەی چەند ساتێكی كەمدا ئەو پارچەیە دەتوێنمەوە...

تیشكە پلاتینیەكەی ئاراستەی ئەو شوێنەی جەستەم كرد و هەموو جەستەم ختوكەی هات... لەپاش چەند چركەیەک پارچە ئاسنەكەی لەجەستەمدا نەهێشت... زۆر بە گەرمی لێو و رومەت و گەردنی ماچ كردم، لەچاوتروكانێكدا خۆی رووت كردەوە... خودایە... ئەم جەستە سپی و جوان و ناسک و وروژێنەرە كە زۆر بەگونجاوی رێكخراوە... هاتە نێو ئامێزم... منیش بەناسكی ئەویندارییم دەكرد و... لەدڵی خۆمدا وتم: هەندێجار مرۆڤ چاوەڕێی هەموو شتێک لە ئافرەتی بوێر دەكات، تەنانەت شتی ناماقوڵیش، بەر لەم چركەساتە تەنها بە رۆح لەگەڵیدا دەژیام، ئێستا بە گۆشت و رۆح لەگەڵمایە. بۆ نا، ئەوێک كە خاوەنی گەردەلولێک لە ئیرادەیە و... هەروەها ئازایەتییەكی پاک و كەمێكیش گوناهكارانەی هەیە... وتی:

- ئێستاش توانای سێكسیتم لەگەڵدا تاقی بكەرەوە... لەسەرەتادا وام زانی ئەو ساتەوەختەی بەچاوتروكانێک خۆی رووت كردەوە، بەبێ ئیرادەی خۆم حاڵەتی شپرزەیی و دڵەراوكێ و بگرە هێڵنجم لەلا دەخولقێنێ... بەڵام من ئاوێزانی بووم و ئەویش بەگوێمدا چرپاندی:

-دەبێ بەسەر نەخۆشییەكانتدا زاڵ بیت... كێ چوزانێ دەشێت كچە هاورێكەت بخوازیت... شپرزەییەكەت بۆ هەتا هەتایە نامێنێت...

بەراستیش وابوو... شپرزەیی و شەرمم نەما، بەراشكاوی دانم پیادا نا كە پێشتر دوچاری لاوازیی سێكسی ببوم...

بە هەمان ئەو خێراییەی خۆی رووت كردەوە، جلەكانی لەبەر كردەوە... وتی:

- ئەگەر تۆزێک لەمەوپێش چارەسەرم نەكردیتایە، ئەوا لاوازیی سێكسییەكەت دەبوو بە درمێكی هەمیشەیی...

بەگەرمی ئەملاو ئەولایم ماچ كرد و پێم وت: بۆچی ئەم هەموو كارە بێ نیاز و بێ بەرژەوەندییەم بۆ دەكەیت؟

ئەویش وەڵامی ماچەکانی دەدامەوە و وتی: تۆ کەمێک دوچاری لاوازیی یادوەریش بوویت... هەروەها چاوی چەپیشت کز بووە... خەریکە باوەڕ نەکەم گەنجێکی بیست و پێنج ساڵ دەبینم ئەو هەموو نەخۆشییەی هەیە. گوێ مەدەرێ... من تەواوی تەندروستیتم بۆ گەڕاندیتەوە.

نازانم بۆچی لەنێو ئەو هەموو دڵنیاکردنەوە جوانەی کە موچڕکەیەکی بەچێژی لەهەستەکانمدا خوڵقاند، کەچی بە بێئاگایی، دوچاری گومان و ڕاراییەکی ترسێنەر بووم و... هەروەها حاڵەتێک لە ترس کە هیچ بنەما و مانایەکی نییە لەگەڵ ئەم ئافرەتە جوانەدا. ترسێک لەوانەیە ئەم لوغزە هەندێجار سادە و هەندێجاری تریش ئاڵۆزە دروستی کردبێت. سەیرە... ئەم دەستنیشانکردنە خێرا و وردە بەبێ پشکنین بۆ ئەو نەخۆشییانەی بە ڕاستی دوچاریان ببوم!!

لەمیانی جوانترین پێکەنینەوە پێی وتم: لە مۆنۆلۆگەکانی خۆتدا واتێدەگەم کە بەڕاستی مەترسییەکانت هیچ بنەما و مانایەکیان نییە... ئازیزەکەم لەئێستا بەدواوە تۆ گەوهەرێکی کەڕ و ماهیەتێکی پوچ نیت... تۆ لەمەودوا بەرەو هەڵکشانێکی ئۆرفیوسی دەچیت و، هەڵوێستەکانیشت لە کێشە قورسەکانی ژیاندا وەک هەڵوێستی پرۆمیسیۆسی دەمێننەوە...

چەندە شەرمم لە گومان و دوودڵییەکانی خۆم کرد... تەسلیمی هێزە ڕەسەنەکەی ئەو بووم و، ئیدی روونییەکی جوانم لە فیکر و بینین و روانیندا هەبوو...

ئاخۆ ئەو وەک بونەوەرێک بەو خێراییە سەرسوڕهێنەرە دەرک بە نەخۆشییەکان دەکات، یان ئەو ئامێرە بچوکەی دەستی... ئەمە چ زانستێکە؟ بێگومان ئەمە دەگمەنترین ئامێرە لە مەزنی و پیرۆزیی...

سوپاس ئەی ڕێکەوتی تەماوی، ئەی ئەوەی وەک ڕۆشناییەک... وەک تارماییەک دێیت و بەچاوتروکانێکیش ون دەبیت... ئەی ڕێکەوت تۆ هەروا بویت لەگەڵ مێژووی بەشەریی ئێمەدا، نەک تەنها لەگەڵ سێوی نیوتندا، بەڵکو لە بەرەبەیانی مێژوویشەوە هەروا بوویت... ئەی ڕێکەوتی پیرۆز... بریا بمزانیبا ئەم مرۆڤە کێیە کە لەم شارەدا ماڵەکەی منی هەڵبژارد... ئەها جارێکی تر بیرەکانی من دەخوێنێتەوە و لەمیانی زەردەخەنەیەکی لێبوردەییەوە دەڵێ: «ئاگادارت دەکەمەوە من کێم!... ئێستا سەیری تەلەڤیزیۆنەکەت بکە»... لەپڕ تەلەڤیزیۆنەکە جوڵەی تێکەوت.

بە ڕاستی تەلەڤیزیۆنەکە کەوتە کار... لەئاسمانی بێکۆتاییدا سەدان هەزار هەسارەم بینی. ئاماژەی بۆ ئەستێرەیەک کرد و وتی:

- من سەر بەو ئەستێرەیەم، ناوی ئەستێرەکەم «کریستاڵی خاوێن»ە، هەموو شتێک تیایدا وەک کریستاڵ دەدرەوشێتەوە.

بە نیگا ئەفسوناوی و ئەڵماسییەکەی لێم ڕاما و وتی:



- لەوانەیە لەدوای هەزار ساڵ بتوانن تیلیسکۆپێک دروست بکەن ئێمەی پێ ببینن.
- ئایا خەڵکی ئەستێرەکەی ئێوە لەئێمە دەچن؟
- زۆر... لەهەموو شتێکدا... ئێمە چەندین ئەستێرەی ترمان دۆزیوەتەوە کە بەشەر و ژیانیان تیایە... ئێوە لەرووی فسیۆلۆژییەوە لەئێمە نزیکترن... سوپاس.
- ئایا بە رێکوپێکی سەردانمان دەکەن؟
- بێگومان... ئێستا پتر لە حەفتا نێردراومان لەسەر هەسارەکەی ئێوەدا هەیە! منیش، بەو بۆنەیەوە، یەکێکم لەو نێردراوانە...
- ئایا تۆ ئێستا پەیوەندیت بە ئەستێرەکەی خۆتەوە هەیە؟
- بەبێ پچڕان... گوێ بگرە ئێستا لەگەڵ جیهازی کۆنترۆڵدا قسە دەکەم.
بە راستی بە زمانێکی نامۆ دەستی کرد بە قسەکردن، هەمان ئەو زمانەی یەکەمجار لەباخچەکەدا قسەی پێکرد... لێم پرسی:
- چییان وت؟
- هەندێ شتیان وت پەیوەندیی بە تۆوە نییە...
- پەیوەندیی بە منەوە هەیە... تکایە...
- دەربارەی شارەکەت پرسیاریان لێکردم... جەختیان کردەوە لەوەی ئەو وێنانەی بۆم ناردبوون، بەتایبەتی وێنەکانی تۆ لەو کاتەوەی هاتوومەتە ماڵەکەت، زۆر ساف و جوانن، زۆریش سەریان لە بوونی ئەو هەموو نەخۆشییە سوڕما کە لە ئەستێرەکەی ئێوە لەهەموو شوێنێکدا بڵاوە... گوێ بگرە، ئەوان سڵاوت بۆ دەنێرن و پرسیاری ئەوەت لێدەکەن کە ئاخۆ لاریت نییە لەوەی سەردانیی ئەستێرەی «کریستاڵی خاوێن» بکەیت.
بێخواستی خۆم پێکەنینێکی بەهێزم دەرپەڕاند بۆ ئەو پرسیارە کۆمیدییە، وتم:
- ئەو گەشتە چەند دەخایەنێت؟
- پرسیاری وام لێ مەکە لەسەرووی توانای زەینیی خۆتەوە بێ، لەسەرتە قایل بیت یان رەتی بکەیتەوە...
- ئایا جارێکی تر دەمگەڕێننەوە سەر زەوی؟
- وەڵامی ئەم پرسیارەیان پێ نییە... بۆچی دەتەوێ بگەڕێیتەوە؟ تۆ لەوێدا تەمەنێکی درێژتر دەژیت، وزەیەکی بێشومارت لە پێشبینی و هەستکردندا دەبێت. لەوێ ژیانێک دەژیت وەک شاری دلمون... بڕیاری چیت دا؟
- نانا... نانا... من هەسارەکەی خۆمم خۆشدەوێت، نیشتمانەکەی خۆم خۆشدەوێت، گەلەکەم و شارەکەی خۆم خۆشدەوێت... نانا...
- هیچت لە من ناوێت؟
- ئایا بەزمانی عەرەبی کتێبت هەیە دەربارەی مێژووی ئەستێرەکەتان؟
نازانم چۆن و لەکوێوە سێ کتێبی بە عەرەبی دامێ، یەکەمیان بەناونیشانی (دابو نەریت لە ئەستێرەی کریستاڵی خاوێندا) و دووەمیان (سەرهەڵدانی ئەستێرەی کریستاڵی خاوێن) و سێیەمیشیان (بەروبومە سروشتیەکان لە ئەستێرەی کریستاڵی خاوێندا)... بەگەرمی سوپاسم کرد و پێم وت:
- ئەی تۆ... هیچت لەمن ناوێ؟
- بێگومان دەمەوێ...
- بفەرموو... فەرمانت چییە؟
- داوایان لێکردم کە هەر دەبێ لە تۆ سکم هەبێ و منداڵێکم ببێت... بەتایبەتی ئێستا تەندروستییەکی باشت هەیە و... ئێمە بۆ ئەوەمانە بزانین جۆری ئەو کۆرپەلەیە چییە کە دێت...
لەنێو خامۆشییەکی خۆشدا لەپڕ ئاوازێکی سەرنجڕاکێش و هەڵچوو، تا ئەندازەی مەستبوون، رۆحی گەشاندمەوە. ئەو ئاوازانە ئەوەندە جوان بوون وەک دەرکەوتنی تیشکی ئەڵماس لەگەڵ خۆیدا بردمی

و دوا گەردیلەی خەم و ئازاری تیامدا سڕییەوە. ئای لەو مەستبوونە بە مۆسیقایەک هەموو ژوورەکەی پڕ کـردۆتـەوە، مەستبوون بە جەستەی مێیەکی «کریستاڵی خاوێن» کە بە ئەوینێکی ئاگرینەوە جەستە و هەستەکانم و سۆزەکانمی کۆکردۆتەوە... لەگەڵ کازیوەدا لەخەو هەستاو جلە زیوییە نامۆکەی لەبەر کردو... بە دەنگێکی خەمناک وتی:

- ئێی هاورێ رێکەوتەکەم، هەموو جارێ بیرم بکە، لەبەرئەوەی هەستکردنم بەوەی بەلای تۆ و نیشتمانە جوان و شارە قەشەنگەکەتدا تێپەڕیوم، وام لێدەکەن هەمیشە زیندوو و گەرموگوڕ بم لەگەڵ خۆمدا...

- بێگومان بیرت دەکەم... و... هەرگیزا و هەرگیز لەیادت نـاکـەم... کێ دەتوانێ ئەزمونێکی ئاوا دەگمەن لەبیر بکات لەگەڵ کچێکدا کە بەراستی رۆحێکی خانەدانی هەیە...

- سوپاس...

بە دەست ئاماژەی بۆ کردم و... وەک ئاسکێکی راستەقینە چووە باخچەکە... پاشماوەی تاریکییەکی چرپەدار ئەو ناوەی گرتبوو. لەناوەراستی گژوگیاکەدا راوەستا، لە کەمتر لە خولەکێکدا گەشایەوە... هەمان ئەو تیشکە زیوینە جیوەییەی پێشوو ئەو ناوچەیەی تەنی... و... ون بوو.

* * *

پاش حەوت ساڵ، ئێوارەیەک ئەحمەدی کوڕم کە تەمەنی حەوت ساڵ بوو، تەماشای تەلەڤیزیۆنی دەکرد، لەپڕ بەدەنگێکی زیقن قیژاندی و بانگی من و دایکی کرد. ئێمە بەپەلە بەرەو ئەو غارمان دا، زۆر سەرمان سوڕما کە بینیمان منداڵێک کتومت لە ئەحمەد دەچوو، دەنگێکی ژنانەی ناسکیش دەیوت: ئەم منداڵە لە باوکێکی عەرەبیی سەر هەسارەی زەوی و دایکێک لە ئەستێرەی «کریستاڵی خاوێن» بووە... تەلەڤیزیۆنەکە وەستا.

حەپەسان هەموو جوڵانەوەیەکی لە جەستەمدا سڕ کرد. بێگومان مەحاڵ بوو یان بێهودە بوو ژنەکەم ئاگادار بکەمەوە و پێی بڵێم ئەو منداڵەی لە ئەحمەدی کوڕم دەچوو، کوڕی منە لەو بوکەشوشە جوانە، لەو رۆحە خانەدانە، لەو کچەی لەرەنگی زیوە.

ژنەکەم بە سەرسوڕمانێکی زۆرەوە وتی:

- سوێند دەخۆم ئەوە ئەحمەد بوو...

- گەڕایتەوە سەر وڕێنەکانی خۆت!

- کورە بەراستی ئەوە ئەحمەد بوو... لەهەسارەی زەوی، باوەڕم پێبکە.

- ئازیزەکەم دەشێت وڕێنەکردن زۆر واقعیتر بێت لە واقیع خۆی... باوەڕم پێبکە...

- سەرچاوە: گۆڤاری (الاقلام)، ژمارە (٤)، ساڵی (٢٠٠٢).
- جەلیل قەیسی (١٩٣٧-٢٠٠٦) چیرۆکنووس و شانۆنامەنووسێکی ناوداری شاری کەرکووکە و بەزمانی عەرەبی دەنووسێت، چوار کۆمەڵەچیرۆک و چـوار کۆمەڵە شانۆنامەی چاپ کـراوی هەیە. یەکێکە لەئەندامانی «گـرووپـی کـەرکـوک» کە لەساڵانی شەستەکانی سەدەی بیستەمدا رۆڵێکی دیاری لەجووڵاندن و چالاککردنی کەشی ئەدەبی و رۆشنبیریی شاری کەرکوکدا هەبوو، ئەم گرووپە نووسەر و داهێنەری کورد و عەرەب و تورکمان و ئاشووری و ئەرمەنیشیان تیادا بوو. جەلیل قەیسی لە رێکەوتی ٢٠٠٦/٧/٢٧دا لە شـاری کەرکووک بەنەخۆشیی شێرپەنجە کۆچی دوایی کرد. لەپاش مردنی، سەرجەمی بەرهەمەکانی لەساڵی ٢٠٠٧دا لە دوو بەرگدا و لە دەزگای ئاراس لە هەولێر چاپ کرا.

مردن خۆش نەویستنی تۆیە
گەر منت خۆش نەوێ
رادەکشێم و دەمرم
مردن نە سەفەری بێ گەڕانەوەیە و
نە کتوپڕ لە ناوچوون
مر دن خۆش نەویستنی تۆیە
رێك ئەو کاتەی دەبێت خۆشت بوێ.

هەمیشە درەنگ دێت
دەبێت خۆم
با رازی کەم
تا هەڵنەکات
دەبێت خۆم
رێزی کۆلیتەکەم
لە دەریا بگەیەنم
زەوی جێگەیەکی ترسناکە و
کەسێك کە
دەبێت بێت
هەمیشە درەنگ دێت.

تەلەفۆنێك لە کەللەمدا زەنگ لێدەدات
سالانێکە
تەلەفۆنێك لە کەللەمدا زەنگ لێدەدات و
من
ناتوانم بیستەرەکە هەڵبگرم
سالانێکە شەو و رۆژم نییە
بەڵام لە منیش بەدبەختتر هەیە
ئەو



هەمان ئەو کەسەی زەنگ بۆ من لێدەدات!

بەڵێن بدە
بەڵێن بدە دێیت
بەڵام هەرگیز مەیە!
ئەگەر بێی
هەموو شتێك خراپ دەبێت
ئیدی ناتوانم
بەم شێوەیە تامەزرۆیانە
لە دەریا و جادە رابمێنم
من راهاتووم
بەم چاوەڕوانییە
بەم پیاسە کردنانە
لە ئەسکەلەو وێستگە.
ئەگەر بێی
من چاو لە رێی کێ بم؟

ئەم مانگە بە هیچ دەسرێك لە پەنجەرەکان ناسڕێتەوە...
تۆ مانگت
لە هەموو شتێك خۆشتر دەویست
ئێستا یش
هەموو شەوێ مانگ
تۆم بیر دەهێنێتەوە
دەمەوێ لە بیرت بکەم
بەڵام ئەم مانگە
بە هیچ دەسرێك
لە پەنجەرەکان ناسڕێتەوە.



هەڵاتن
ئەم شارە
شاری حیکایەتەکانی داپیرە نییە
تا جوان و ئارام بێت
هەرگیز
ئاسمانەکەیم شین نەبینیوە.
من لێرە دەڕۆم و
جیاوازیشی نییە
فانۆسم پێ بێت یا نا
ئەو کەسەی هەڵدێت
لەون بوون ناترسێ!

تۆ لە مندای
تۆ لە مندای
وەك وێنەی مانگ لە ناو گۆمدا
لە مندایت و
زۆر دووریش لێم
پشکی من لە تۆ
تەنها ئەم شیعرە ئەویندارییانەیە و
ئیتر هیچ
دەوڵەمەندێکی نەدارم
وەك بانکدارێکی بێ پارە
من تەنها ئاوێنەی تۆم.

دەریا هەڵچوو
دەریا هەڵچوو
هێندە هەڵچوو
لە چوارچێوەی پەنجەرەکەدا وەستا

نازانم
رەنگیشە پەنجەرەکە داکشابێت
تا دەریام پیشان بدات
دواجار لەم ڕووداوانەیش دەقەومێ
کاتێك تۆ هەبیت.
ئێستا کە تۆ نیت
من ئەو مافە دەدەمە باڵندەکان
نەجریوێنن
هەروا بە خۆریش
کە گاڵتەجاڕ و مەنگ
وەك قەرەقۆزێکی شێت بەرەڵای کۆڵانان بێت...

قەرزاری کەس نیم
قەرزاری کەس نیم
جگە لەم مانگە
کە لەودیو شیشەکانەوە تێدەپەڕێ
کە دەیتوانی
لێرەوە نەڕوات و
لە جێیەکی دی
بۆ نموونە لە ناوەڕاستی دەریایەکی خەیاڵ بزوێن
بلکێ بە شووشەی کابینەی بازرگانێکی دەوڵەمەندەوە
قەرزاری هیچ کەس نیم
جگە لەم مانگە
کە تۆم بیر دەهێنێتەوە.

تۆ نیت
تۆ نیت
بەڵام من چاییت بۆ تێدەکەم

دوێنێش
نەبوویت و بلیتی سینەمایشم بۆ بڕیت
حەز دەکەی پێکەنە
حەز دەکەی بگری
یا گەر پێتخۆشە
وەك ئاوێنە حەیران بە
حەیرانی من و دنیا چکۆلەکەم
ئیدی جیاوازی چییە
هەبی یا نەبی
من لەگەڵ تۆ دەژیم.

ئەگەر تۆ نەبیت
هەموو شەوێ خەو دەبینم
لە تەلارێکی هەوربڕەوە دەکەومە خوارێ و
تۆیش لە لێوارەکەیەوە
دادەنەوییەوەو
دەستم دەگری
هەموو شەوێ دەکەومە خوارێ
لە سەربانی شەو و
گەر تۆ نەبیت
دەستم بگری
بێگومان
بەیانی
لاشەکەم
لە قولایی دۆڵەکەدا دەدۆزنەوە...

تۆ قوتارت کردم تا یەخسیرم کەیت
خەریکبووم لەم شارە دەڕۆیشتم

بانگت کردم
جێمام
له کەشتییەك کە ڕۆیشت و نووقم بوو
هەڵبەتە...
ئەمە تەنها دەتوانێ حیکایەتێك بێت
لەم شاری دووکەڵ و ئاسنە
دەریا له کوێ بوو
تا من بمەوێ سواری کەشتی بم و...
تۆ گازم بکەیت
تەنها دەمەوێ بڵێم
تۆ قوتارت کردم
تا یەخسیرم بکەیت.

ئەگەر تۆ نەبوویتایە
ئەگەر تۆ نەبوویتایە عیشق نەبوو
هەروابێتەوە
رازێك بۆ ژیان
ئەگەر تۆ نەبوویتایە
زەوی تەپڵەکی قوڕینی جگەرەیەك بوو
جێگەیەك بۆ کوژانەوەی بێتاقەتییەکان
ئەگەر تۆ نەبوویتایە
من تەواو بێکار بووم
لەم دنیایەدا هیچ کارێکم نییە
جگە له خۆشەویستی تۆ.

تەنها من دەزانم
تەنها تاریکی دەزانێ
مانگ چەندە رووناکە

تەنها زەوی دەزانێ
دەستەکانی ئاو
چەندە میهرەبانە!
تەنها مرۆڤی برسی
مانای دروستی نان دەزانێ
تەنها منیش دەزانم
تۆ چەندە جوانی!

تەنیا تۆ رۆیشتووی
بارانێکی بەلێزمە
لە نیوەڕۆیەکی هەتاویدا...
هیچ رووی نەداوە
تەنها تۆ رۆیشتووی
بەڵام من
سوێند دەخۆم ئەم بارانە
بارانێکی ئاسایی نییە
بە دڵنیاییەوە لە جێگەیەکی دوور
دەریایەکیان داوە بە دەم باوە...

رامەکە
هەوڵدە لەگەڵ هەموو شتێك رابێی
رانەکەیت
زەوی بە شێوەیەکی گەمژانە خڕە!

سەرچاوە؛
http://ghambarak.blogfa.com/tag

## پراگ ٥ ژوڵای ١٩٢٠ - دووشەممە

٥) وابزانم پێویستە بڕۆم بخەوم. سەعات یەکی دوای نیوەشەوە. دەبوو ئێوارە نامەم بۆ بنووسیتایە. بەڵام ماکس لێرەبوو کە زۆر ئارەزووی بینینیم دەکرد. لێ نیگەرانیەکانی من بەرانبەر بەو کچە[1] نەی هێشتبوو تائێستا ئەو کارە بکەم. تا سەعات ٨،٣٠ لەگەڵ ئەو کچەدا بووم. ماکس سەعات (٩)ی بۆ بینینەکە دانابوو. پاشان تا سەعات ١٢،٣٠ پێکەوە بووین و لەو ناوە پیاسەمان دەکرد. حەزدەکەم بزانیت چیم لەدڵدایە بە ڕوونی لە نامەکانمدا نووسیومە. لەوانەی ئەوەی تۆ تۆ تۆ (دیسانەوە تووشی تورتەتورتی قەڵەمەکەم بووم) تۆ تەنیا کەسیت لەبارەی ئەوەوە قسەم لەگەڵدا کردبێت. ئەو ئەمەی نەدەزانی. تازەیش ناوی تۆی زانیوە (دیارە من ئەوەم نەنووسیبوو، چونکە لەوانەبوو هاوسەرەکەی نامەکان بخوێنێتەوە) لەبارەی ئەو کچەیشەوە: ئێستا دۆخەکە لەبارترە. لێ لەسەر ئەوەی من ڕێگام پێ دابێت نامە بۆ تۆ بنووسێت و شتی لەو بابەتە زۆر پەشیمانم. یەکێک لە نیشانەی دڵ نیگەرانیم بەرانبەر بە تۆ ئەو تەلگورافەیە ئەمڕۆ ناردم (ئەو کچە بە میهرەبانی و ڕاست گۆییەوە نامەت بۆ دەنووسێت- لێرەدا من دەم ویست وشەی (زۆر)یشی بۆ زیاد بکەم- تۆیش بە جیدیی و کۆکی وەڵامی بدەرەوە و لایەنم بگرە) ئەمڕۆ دۆخەکە بەگشتی لەبارتربوو. وام دانابوو بە شادیەوە دەربارەی مران بدوێم. دۆخی ئەمڕۆ هەڕەشەی کەمتر تیابوو. بەڵام هەر کە هاتنەوە سەر باسەکە- ئەو کچە لەپاڵما، لە کارلزپلاتس ماوەیەک هەموو گیانی کەوتە لەرزین- من تەنیا ئەوەندەم پێ کرا بڵێم کە بەرانبەر بە تۆ[2] هەموو شتێکی تر- هەرچەندە پێ دەچێت ئاڵوگۆڕیان بەسەر نەیەت- نامێنن و تەواودەبن. لەدواییشدا دواپرسیار دێتە پێشێ کە من بەرانبەری دەستەوسانم. پرسیارەکە ئەوەیە کە: ((من ناتوانم واز لە تۆ بێنم، لێ ئەگەر دەرم بکەیت دەڕۆم. ئایا تۆ دەرم دەکەیت؟)) ئەم دەربڕینە بەرانبەر بە تۆ، جگە لە خۆپەرستیی، شتێکی زۆر نەفرەت هێنی لەخۆ گرتوە. من بۆتی باس دەکەم. چونکە خەمی تۆمە. لەسەر ئەم هەموو پیلانەی دژی تۆ دەکرێت ئایا دەتوانم کارێک هەبێت نەیکەم؟ بڕوانە ئەمە چ ترس و سەرسووڕمانێکی تازەیە!)) من وەڵامم داوەتەوە: ((بەڵێ)) ئەویش لە وەڵامدا وتی: ((بەڵام بەهەرحاڵ من ناتوانم بڕۆم)) لەوکاتەدا ئەو مرۆ چاک و ئازیزە دەستی بە قسەی زۆر کرد کە لە سەرووی توانای خۆیەوە بوو. لەم جۆرە قسانە. ئەو لەو شتانە ناگات کە ڕوویانداوە، وەک ئەوەی کە تۆ مێردەکەت خۆش دەوێت و بەدزیەوە قسە لەگەڵ مندا دەکەیت و بابەتی تریش. لەڕاستیا چەند قسەیەکی ناپەسەندییشی بەرانبەر بە تۆ کرد کە دەبوو لەسەر ئەو قسانە لێی بدەم. بەڵام لەلایەکی ترەوە ئەی نەدەبوو دەرفەتی ئەوەی بدەمێ کە دەردەدڵی خۆیم بۆ بکات. هەر هیچ نەبێت تاقە دەرفەتێک؟ وتی دەیەوێت نامەت بۆ بنووسێت. لەبەر ئەو دوودڵیەی

---

[1] - مەبەست لەو کچە ژولی فریزکی دوەم دەزگیرانی کافکایە. ماکس برود ڕای وایە لە هەموو (نامە بۆ میلنا)دا کە دەڵێت (ئەو کچە) مەبەستی ژولیە.

[2] - مەبەست لە وشەی (تۆ) میلنایە. کافکا دەیەوێت دەربارەی میلنا لەگەڵ دەزگیرانی دوەمیدا- ژولی فریزک- قسەبکات و. ف.

بەرانبەر بەو هەمە و ئەو بڕوا بێ ئەندازەیەیش کە بە تۆم هەیە ڕێگام پێدا. ئەگەرچی باجەکەی چەند شەوێک نەنووستنە. ئەوەندە بەسە کە ئەو ڕێگە پێدانە ئاسوودەییەک بەو دەبەخشێت و نائارامیەکییش بە من. تۆ دلۆڤان و خۆگربە. بەڵام با خۆگریەکەت زیاتربێت. من دەمەوێت چی بڵێم؟ بۆ نازانم تۆ ئەو شتە دەنووسیت کە دەشێت باشتر بێت. پەشێویی من لەم بارەیەوە ڕەنگە لەو نائومێدیەوە بێت کە شتێکی پیلان گێڕانە بۆ تۆ بنووسێت و بەرانبەر بە من کارت تێ بکات. ئایا بەهای من لای تۆ زۆر زۆر ناهێنێتە خوارێ؟ شپرزەیی من بێ ڕێزم ناکات؟ بەڵام چی بکەم لەباتی دڵ، ئەم شپرزەییە دەڕواتە ناو جەستەمەوە! لەڕاستیا هەق نەبوو ڕێگام پێ بدایە، دەی، من بەیانیی دەیبینمەوە. بەیانیی پشووی هاسە[3] زۆر داوای لێ کردم پاش نیوەڕۆ پیاسەی لەگەڵدا بکەم. دەڵێت لە ڕۆژانی تری هەفتەدا ئیدی من ناچارنابم بچم بۆ ئەوەی ببیبنم. ئەگەر هێشتا نامەکەی نەنووسیبێت بەڵکوو بتوانم پەشیمانی بکەمەوە. بەڵام لەو حاڵەتەدا بە خۆم دەڵێم: لەوانەیە ئەو تەنیا ڕوون کردنەوەیەکی بوێت. لەوانەیە قسەی تۆ کە بە شێوازێکی ڕاست و ڕاسا پێی بڵێیت ئارامی بکاتەوە. ڕەنگە (ئەم ڕۆژانە من بیرم بەم شتانەوە ئاڵاوە) تەنانەت بەرانبەر بە نامەکەت بکەوێتە سەر چۆک. فرانتس

هۆکارێکی ترلەبارەی ڕێ پێدانەکەی منەوە. ئەو دەیویست ئەو نامانە ببینێت کە تۆ بۆت نووسیوم، لێ من ناتوانم نامەکانی پیشان بدەم.

(لە پەراوێزی لای ڕاستەوە ئەمە زیادکراوە) : جگە لەمەیش هەندێک جار دەڵێم: ئەگەر بڕیاربێت یەکێک لە خۆشیا بمرێت، بێگومان ئەوە منم. ئەگەر کەسێکیش بڕیاربێت لە خۆشیا بژی، ئەوسا من بە زیندویی دەمێنمەوە.

*پراگ ٦ ژولای ١٩٢٠ بەیانی سێ شەممە*

٦) تووش هاتێکی ناخۆش و بچووک: تەلگورافێکم لە پاریسەوە بۆ هاتوە. یەکێک لە مامە پیرەکانم کە زۆرم خۆش دەوێت، لە مەدرید دەژی و ساڵانێکە لەوێ نەماوە. سبەی شەو دەگاتە ئێرە. ئەمە بۆ من شۆکێکە، چونکە بەشێکی کاتمان داگیر دەکات. منییش دەمەوێت هەموو کاتم، بەڵکوو هەزار جار زیاتر لە هەموو کاتی خۆم و ئەگەر بکرایە پیویستیم بە هەرچی کات هەیە بۆ تۆ بێت. بۆئەوەی بیر لە تۆ بکەمەوە و هەناسە لە تۆدا بدەم. لێرە ئاپارتمانەکە ناارام دەبێت. شەوانییش هەروا دەبێت. بۆیە حەزدەکەم لە شوێنێکی تربم. پێم خۆشە گەلێک لە شتەکان بە جۆرێکی تر بن. حەزدەکەم ئۆفیس هەر نەمێنێت. بەڵام لەم حاڵەیشدا هەر بیر دەکەمەوە. لەبەرئەوەی ئارەزووی تری دوای ئەم چرکەساتەم هەیە ئەم چرکەساتەی تۆ. کەواتە شایانی ئەوەم لێم بدرێت.

٣- ڕۆژی جان هاس Janhus لە سەردەمی کۆماریٚ چیکۆسلۆفیاکیادا پشووی فەرمی بوە.

لەلایەکەوە من ئیدی توانای نووسینی هیچم نیە جگە لەو دەسیسە و ئاژاوەیەی لە دنیادا هەیە و پەیوەندیی بە ئێمەوەیە. هەرچیەکی تر هەیە نەیارە. ئەمە تاوانە! تاوانە! بەڵام چی لە لێوم بکەم کە بە زمانی بێ زمانیی لەبەرخۆ دەدوێت، چی لەم وێنەیەی خۆم بکەم کە لە داوێنی تۆدا ئارام دەگرێت. یادەوەریەکی تاڵی مران. ئایا ڕێگام دەدەیت بیڵێم؟ وابزانم ڕۆژی دوەم لە دارستانەکەدا شتێکی وات وت: ((شەڕی ناو ژووری چاوەڕوانی زۆر ناخایەنێت)) وائێستا لە نامەی پێش کۆتاییدا لە مران، تۆ لەبارەی نەخۆشیەکەتەوە دەنووسیت، من چۆن بتوانم لەنێوان ئەم دوو شتەدا ڕێگای ڕزگاریی بدۆزمەوە؟ من ئەمە لەپای ئیرەیی پێ بردنەوە ناڵێم میلنا. من حەسوودنیم. چ دنیا زۆر بچووک بێت و چ ئێمە زۆر گەورەبین، هەرچۆنێک بێت ئێمە پڕی دەکەینەوە. دەبێت ئیرەیی بە کێ بەرم؟

## پراگ ٦ ژولای شەوی سێ شەممە

٧) بڕوانە میلنا، من ئێستا خۆم ئەو نامەیەت بۆ دەنێرم و تەنانەت نایشزانم ناوەڕۆکەکەی چیە. مەسەلەکە ئەوەیە کە من بەڵێنم پێ دابوو ئەمڕۆ پاش نیوەڕۆ سەعات ٣،٠٣ لەبەردەم ماڵەکەیدابم[٤] دەمانویست بە کەشتیەکی هەڵمی پیاسەیەک بکەین. بەڵام من دوێنێ شەو درەنگ چوومە ناو جێگا و بە زەحمەت خەو چوە چاوم. بۆیە ئەمڕۆ بەیانی زوو بەپەلە نامەیەکم بۆ نووسی کە دەبوو پاش نیوەڕۆ بنووم، تەنیا دەتوانم لە سەعات شەشدا لەوێ ئامادەبم. لە حاڵەتێکی نائارامیدا کە نە نامە و نە تەلگوراف بۆیان چار نەدەکرا ئەمەم بۆ نووسی: ((تا ئەوکاتەی قسە لەسەر ئەم نامەیە نەکەین، مەینێرە بۆ ڤیەنا)) بەڵام ئەو پێشتر، بەیانی زوو لە حاڵەتێکی نیوە هۆشیاریدا: (کە تەنانەت خۆیشی نازانێت چی نووسیوە) نامەکەی نووسیوە و پۆستی کردوە. کچە داماوەکە کە نامە خێراکەی منی پێ دەگات، زۆر بەپەلە و شپرزە خۆی دەگەیەنێتە پۆستەخانە. هەر چۆنێک بوە نامەکەی خۆی دەست دەکەوێتەوە. ئەمەندەیش خۆشحاڵ دەبێت کە هەر پارەیەکی پێ بوە داویەتی بەو کەسەی بەرپرسی کارەکەیە. (دوای ئەوەی پارەکەی داوە پاشان گەلێک سەری لە کارەکەی خۆی سووڕماوە) عەسر نامەکەم بۆ دینێت. هەنووکە من چی بکەم؟ هەموو ئومێدی من بۆ چارەسەرکردنێکی خێرا و زۆرباش وابەستەی ئەو نامەیە و کاریگەریی وەڵامی تۆیە. من دانی پیادەنێم کە ئەم ئومێدە ئومێدیکی ناهوشیارانەیە بەڵام تاقە ئومێدی منە. ئەگەر ئێستا نامەکە بکەمەوە و بیخوێنمەوە، یەکەم ئەو زویر دەبێت و دوەم بێگومانم کە ئیتر من نامەکە نانێرم. بۆیە بێ ئەوەی دەست کاری بکەم یان بیکەمەوە دەینێرم بۆ خۆت. هەر بەوجۆرەی کە پێشتر خۆمم بێ ئەوەی دەست کاری کرابم ڕادەستی تۆ کردوە.

ئاو و هەوای پراگ تاڕادەیەک تاڵ و غەمگینە، هێشتا نامەم پێ نەگەیشتوە. کەمێک دڵ تەنگم. بەڕاستیی

٤- مەبەست لە ماڵ و نامەی ژولی ڤریزکە.

مەحاڵە تائێستا نامەیەکی تۆم پێ نەگەیشتبێت. هەوڵ بدە ئەمە بۆ دڵم ڕوون بکەیتەوە.

- ف -

ناونیشانەکەی: ژولی ڤریزک

پراگ LL

Smeckach na[5]

## پراگ ٦ ژولای ١٩٢٠ سێ شەممە درەنگتر

٨) من چۆن توانیومە چاوەڕێی شتێکی وا لە تۆ بکەم؟ ئەگەر بیرۆکەیەکی وام تێ بگەڕایە دووربوو نامەکەت بۆ پۆست بکەم. هەرچەندە لەم بارەیەوە بڕیاری ڕاست و پێویست تەنیا لە ئەستۆی منە، ڕەنگە نووسینی نامە و متمانەکردن بە وەڵامێکی لەو جۆرە بۆ کەسێکی بێگانە بۆ تۆ مەحاڵ بێت. کەواتە میلنا، داواکارم بەچاوی لێ بووردنەوە تەماشای ئەم نامە و تەلگورافانە بکەیت و بە کەم ئەقڵی منیان بزانیت. کەم ئەقڵیەک هۆکارەکەی جیابوونەوەیە لە تۆ. ئەگەر وەڵامی نامەکەی نەدەیتەوە گرنگ نیە. ناچار ڕێگاچارەیەکی تر پەیدا دەبێت. لەم لایەنەوە ترست نەبێت. مەسەلەکە تەنیا ئەوەیە کە ئەم ڕێپێوانانە (ئەمڕۆ لە ڤیشرادەر) زۆری شەکەت کردووم. سبەی مامم دەگات. دەرفەتی پێکەوە دانیشتنمان لەگەڵ تۆدا دوورە. با لەسەر شتێکی باشتر بدوێین. ئایا دەزانیت تۆ لە ڤیەنا جوانتر بەرگت پۆشیبوو؟ هیچ ئەملاولای ناوێت: ڕۆژی یەکشەممە بوو.

## پراگ ٧ ژولای ١٩٢٠ شەوی چوارشەممە

٩) چەند قسەیەکی بەپەلە لەبارەی ئاپارتمانە تازەکەمەوە. هەروەها بەپەلە چونکە سەعات دە باوکم و دایکم لە فرانتزباد و مامم لە سەعات ١٢ لە پاریسەوە دەگەن. بڕیاریشە هەردوولایان یەکتر ببینن: دەڵێم ئاپارتمانە تازەکە چونکە لەبەرهاتنی مامم گوێزاومەتەوە بۆ ئاپارتمانە چۆڵەکەی خوشکم لە مارین باد. ئاپارتمانەکە گەورە و چۆڵە. لەڕاستیا زۆر جوانە، چونکە شەقامەکەی پڕ لە هەراوزەنایە. لە هەمان کاتدا بۆ ئاڵ و گۆڕ زۆر خراپ نیە. دەبێت ئەوەیشت بۆ بنووسم میلنا، چونکە لە نامە پڕ لە سکاڵاکانی ئەم دواییەم (لە هەموویان خراپتر ئەمڕۆ بەیانی نوسیم و لە زۆر خەجاڵەتیا دراندم. بیری لێ بکەوە: هێشتا چ هەواڵێکی تۆ نازانم. بەڵام سکاڵاکردن لە دەست پۆست کارێکی گەوجانەیە. دەمتوانی چی لەگەڵ ئیدارەی پۆستا بکەم؟) تۆ گەیشتوویت بەو بەرئەنجامەی کە من ئێستا لە تۆ دڵنیا نیم و دەترسام

---

٥- ئەم ناونیشانە تەنیا لە دەقە ئەڵمانیەکەدایە. بەهەرحاڵ هەرچەندە ماکس برود لەبارەی مەبەستەکەی کافکاوە "ئەو کچە" ڕوون کردنەوەیەکی داوە بەڵام ناونیشانەکە ناوی ئەو کچە ئاشکرادەکات.

لە دەستت بدەم. نا، من بێ بڕوا نیم. چونکە ئەگەر لە تۆ دڵنیا نەبوومایە، ئایا دەتتوانی ئەوەبیت کە ئێستا هەیت؟ ئەوەی بوو بەهۆی دەرکەوتنی ئەم هەستە لای من ئەوەیە کە پێک گەیشتنی ڕاستەقینەی من و تۆ کورت و لێک ترازانیشمان لەپڕێکدا بوو. (بۆ هەر یەکشەممە؟ بۆ هەر سەعات ٧؟ ئاخر بۆ؟) هەرچۆنێک بێت ڕەنگە ئەمە کەمێک هەستت ئاڵۆز و بەراژوو بکات. بمبوورە، هەنووکە لەم شەوەدا شەوباشی و هەموو هەست و ئەوەی پێی خۆشە لە تۆدا بێت لێم قبووڵ بکە.

## پراگ ٨ ژولای ١٩٢٠ پێنج شەممە، بەیانی

١٠) شەقام جەنجاڵە، کڵێسە ڕووسیەکەی بەرانبەرمان نەماوە[٦]، بوە بە کۆمەڵێک ئاپارتمان. ئاپارتمان گەلێک پڕە لە مرۆڤ. لەگەڵ ئەوەیشدا ڕەنگە تەنیایی لە ژوورێکدا جۆرێک بێت لە ژیان بەسەربردن. تەنیایی لە ئاپارتمانێکدا (بە مانایەکی وردتر تەنیاییەکی کاتیی لە ئاپارتمانەکەدا) جۆرێک بێت لە خۆش بەختی (دەڵێم جۆرێک بێت، چونکە ئەگەر من نەژیم ئاپارتمان بە کەڵکی چی دەخوات. ئەگەر ماڵێک بۆ ئارامیی، وەک نموونەی دووچاوی شین و درەوشاوە و پڕ لە خۆشەویستی و میهرەبانیەکی زۆر نەبوایە، ئاپارتمان چ سوودێکی بۆ من هەیە) دەڵێیت ئەم ئاپارتمانە بۆ خۆشبەختی من دروست کراوە. هەمووشتێک ئارامە. گەرماو، چێشتخانە، هۆڵ، سێ ژووری زیادە، نەک وەک ئەو ژوورانەی ئاپارتمانەکەی تر کە سیخناخە. پڕ لە خزمە زیناکارەکان و بەرەڵایی، لەهەر سووچێکیدا منداڵی زۆڵ دەخەنەوە.

ئەم شتە هەر بەردەوامە. بەڵام نەک وەک ڕۆژانی یەکشەممەی ئارام و لەسەرخۆی (شارەکەی تۆ) بەڵکوو وەک شوێنێکی زۆر ئاپوورەی بێ سەرەوبەرە و شەوانی شەممە.

خوشکم ئەم هەموو ڕێگایەی بڕیوە تا بەرچایمان بۆ بێنێت. (کە هەر پێویستیی نەدەکرد چونکە دەبوو من بچمەوە بۆ ماڵەوە) پێش ئەوەی من لە خەونی ئەم نامەیە و شەکەتیم لەم دنیایە بە ئاگابێنێتەوە چەندجارێک زەنگی لێ داوە.

بێگومان ئەم ئاپارتمانە پەیوەندیی بە منەوە نیە: لە زستاندا میردی خوشکم جارجارە لێرە دەژی.

## پراگ ٨ ژولای ١٩٢٠ بەیانیی پێنج شەممە

١١) سەرئەنجام نامەکەت گەیشت. هەرچەندە لەوانەیە پەلەکردن قسەی نادروستی لێ بکەوێتەوە کە پەشیمان بوونەوەی بەدوادابێت. بەڵام تەنیا چەند وشەیەکی بەپەلە دەربارەی ئەسڵی مەسەلەکە.

ئەم مەسەلەیە لە ڕوانگەی پەیوەندەیە تایبەتیەکەی هەرسێکمانەوە، کێشەگەلێکن ناتوانم بەراوردیان بە

---

٦- کافکا کە لە ماڵی باوکی بوو، کڵێسایەکی ڕووسی بەرانبەر ماڵەکەیان بوو بەناوی (نیکولا) دوای ئەوەی ساڵی ١٩١٣ لەو ماڵە نەما، لە نامەیەکیدا بۆ فلیس باور یاد لەو دیمەنە دەکاتەوە (و. ف.)

مەسەلەکەی ترەوە بکەم. بۆیە ناکرێت وەک ئەزموونیتر تەماشای بکەیت. ئازار بۆ سێ کەس، ئازار بۆ دوو کەس، ئازار بۆ لەناوچوون[7]. من هاوڕێی ئەونیم. من ناپاکییم لەگەڵ هاوڕێیەکی خۆمدا نەکردوە. لە ئاشناکانی ئەوییش نیم. بەڵکوو بەهۆی چەند ڕێگایەکەوە زیاد لە هاوڕێیەک پەیوەندیەکی نزیکم لەگەڵیدا هەیە. لەلایەکی ترەوە تۆیش ناپاکیت لەگەڵیا نەکردوە. چونکە چەند بکرێت خۆشت دەوێت، ئەگەر بکرێت من و تۆ پەیوەندیەکمان هەبێت (سوپاسی تۆ دەکەم شانەکانم!) لە سنووری ئەودا نیە و لە زەمینەیەکی تردایە. بەکورتی ئەم سەرقاڵیە ڕەنگە هەر بەتەنیا سەرقاڵی نەبێت. بەینی خۆمان بێت ئەم سەرقاڵیە هەر ئەشکەنجە، ئازار و ڕاڕای نیە. - (نامەکەت منی لەو ئارامیە ڕێژەییە کرد کە هێشتا لە یادەوەریی پێکەوەبوونمان مابوەوە و ڕەنگە ئێستا جارێکی تر بگۆڕێت بە وەیشوومەکەی مران. ئەگەرچی چەند ڕێگریەکی بەهێز هەیە بۆ گۆڕینی ئەو دۆخە بۆ هەمان دۆخەکەی مران. هەرچەند تۆ بۆ ماوەیەک بێدەنگیی هەڵبژێریت. ئەم سەرقاڵیە بە ئاشکرا ترسێک لای هەرسێکمان دروست دەکات کە ئەمەیش تەواو ئاشکرا و ڕوونە. منییش تەواو دژ بە گریمانەکانم. (لەبەرئەوە دژم چونکە تۆم هەیە، ئەگەر تەنیا بوومایە نەم دەتوانی بیر لە شتی وا نەکەمەوە) ئەگەر لە ئێستاوە یەکێک خۆی بتباتە ناو شەڕی داهاتوەوە، ئەم سەرزەمینەی کە وێران و سەروبن بوە چۆن دەتوانیت ماڵی ئایندەتی تیا هەڵبگریت؟)

لەم چرکەساتەدا من لەمە زیاتر هیچ نازانم. سێیەم ڕۆژە دەچمە ئۆفیس و تائێستا دێڕێکم نەنووسیوە. لەوانەیە ئێستا باشتربێت. لەڕاستیا کاتی نووسینی ئەم نامەیە، ماکس سەری لێدام. دەکرێت لە بێدەنگیی و نهێن پارێزیی ئەو دڵنیابیت. لە هەموو کەسێک بێجگە لە خوشکەکانم، لە دایک و باوکم و ئەو کچە[8] و ئەو[9]، من لە ڕێی لینتزەوە گەڕامەوە.

- ف -

ئایا دەتوانم هەندێک پارەت بۆ بنێرم؟ لەوانەیە بتوانم لە ڕێگای لاورینەوە[10] ئەم کارە بکەم. بەوجۆرەی پێی بڵێم لە ڤیەنا هەندێک پارەم لێ قەرزکردوویت، ئەوییش لەگەڵ پاداشتی نووسینەکەتدا بۆت بنێرێت. (لە پەراوێزی لای چەپەوە) منییش دەربارەی ئەوەی بڕیارت داوە کە دەتەوێت لەبارەی ترس و دوودڵی شتم بۆ بنووسیت کەمێک قەڵس بووم.

**سەرچاوە: کتێبی نامەهای بە میلنا**

---

[7]- ئاماژەیە بە پولاکی مێردی میلنا. وشەی ناو دوو کەوانەکە پێ دەچێت لە نامەی میلناوە وەرگیرابێت. چونکە لە دەست نووسەکەدا هەر ئەم وشانە لەناو کەوانەکەدا نووسراون.

[8]- مەبەست ژولی ڤریزکی دوەم دەزگیرانی کافکایە

[9]- مەبەست ماکس برودە.

[10]- نارنە لاورین لە کارمەندانی بڵاوکراوەی (تریبونا) و سکرتێری (بدریش هلاواک) بوو

# ساباتی ئەدەب و هۆنراوەی هەنگار

ئامادەکردنی: عبدالکریم عوزێری

## پێشەکی:

هەنگاریا شایستەی ئەوەیە کە خوێندەواری کوردی پێ ئاشنا بکرێت، چونکە لە هەندێک رووی سیاسی و کۆمەڵایەتییەوە لێکچوونی لەگەڵ کوردستاندا هەیە، لەوانە:

- وڵاتــی هەنگاریا کە (مەجەڕ)یشی پێ دەوترێت , کراوە بە پێنچ پارچەوە، چوار پارچەی لە لایەن رۆمانیا و سلۆڤاکیا و نەمسا و سەربیاوە داگیرکراون. بەشێکی بچکۆلەی ماوەتەوە بە هەنگاریا ناسراوە.
- لە رووی سروشتیی کۆمەڵایەتییەوە بە تایبەتی میوانداری و رێز لە میوان گرتن لە کوردەوە نزیکن.
- شارۆچکەیەکی کۆن لە هەنگاریا هەیە کە ناوی (کورد)ە، ئەم شارۆچکەیە ئەگەر لە تورکیا یان لە سووریا بووایە، لە مێژ بوو ناو و پێناسەکەیان گۆڕیبوو.

مەجەڕ دەکەوێتە ناوەڕاستی ئـەورووپـاوە، خاوەنی هەردوو رووباری دانوب و تیسایە. گەورەترین دەریاچەی ئەورووپاش کە ناوی دەریاچەی بالاتۆنە، دەکەوێتە هەنگاریاوە و چەندین شـاری گـەورەی گەشتیاری لەسەرە. خەڵکانێکی زۆر لە وڵاتانی ئەورووپاوە دێن پشووی هاوینە لەوێ دەبەنە سەر. یەکێک لە شاعیرە گەورەکانی هەنگاریا کە ناوی (ئەتیلا جۆزێف) بووە، لە شاری (بالاتۆن سەمەش) ژیاوە.

بوداپێست کە پایتەختی وڵاتەکەیە، یەکێکە شارە هەرە جوانەکانی ئەوروپا و بە پاریسی ئەورووپای رۆژهەڵات هەژمار دەکرێت. رووباری دانوب ئەم شارە دەکات بە دوو بەشەوە: بودا، کە دەوڵەمەندە بە قەڵا و کۆشکی مێژوویی , دەکەوێتە رۆخی باشووری رووبارەکەوە. پێشت، دەشتێکی بەرینە و بە تەلاری پەرلەمان و ئۆپەرا و چەندین سەنتەری بازرگانی رازاوەتەوە.

دانیشتوانی ئەم وڵاتە ١٠ ملیۆن کەسە و هەمیشە بەرەو کەم بوون دەڕوات، چونکە بۆ نزیکەی پەنجا ساڵ لە ژێر دەستی کۆمۆنیستەکانی مۆسکۆدا بوون



و، ژێرخانی ئابووری بە شێوەیەک وێران کرابوو کە خێزانە مەجەرییەکان نەیاندەویست منداڵ بەخێوبکەن.
لە سەرەتای نەوەدەکانی سەدەی رابردوودا کۆمۆنیزم داڕما و حوکمی عەلمانی و Market Economy پەسەندکرا. سەرەتا ریفۆرمخوازەکان هاتنە سەر حوکم بەڵام لەبەر گەندەڵی هەڵبژاردنیان دۆڕاند و کۆمۆنیستەکان لەژێر ئالای دیموکراتخوازەوە توانییان بگەڕێنەوە سەر حوکم، بەڵام عادیلانە حوکمی وڵاتیان نەکرد. تا ئێستاش سندوقی دەنگدان شێوازی حوکم لەو وڵاتەدا دیاری دەکات.

## کورتەباسێکی مێژووی هەنگاری:

هەنگارییەکان هەزار ساڵێک لەمەوپێش لە ناوەڕاستی ئاسیاوە هاتوون، لە مەجەڕ جێگیر بوون و حوکمی شاهانەیان دامەزراندووە. پاشای هەرە گەورە و دادپەروەر ناوی (ماچاش) بوو، زۆر لای گەلەکەی خۆشەویست بووە، چونکە رێگەی بە زوڵمورۆر نەداوە و گوێرایەڵی داخوازییەکانی گەلەکەی بووە. دەنگۆیەک هەیە کە گوایە کوردێک چۆتە لای ئەم پاشایە و هۆنراوەیەکی پیا هەڵداوە کە بە «شاهی مەجەڕ شاهی مەجەڕ، شەمس و قەمەر شاهی مەجەڕ» دەستپێ کردووە، بەڵام ئەم رووداوە بەڵگەی مێژوویی لەسەر نییە، وەلێ شارۆچکەی (کورد) مێژووەکەی ئاشکرایە.
کاتێک کە تورکە عوسمانلییەکان ئەو وڵاتەیان داگیرکردووە، کوردێکی زۆریان بە سوخرە بردووە بۆ شەڕ، وەک کراسسووری بەر لەشکر بەکاریان هێناون، بەڵام تورکەکان خۆیان ئەسپ سوار بوون و لە کاتی شکست خواردندا هەڵهاتوون و کوردەکانیان بەجێ هێشتووە. ئەو کۆمەڵە کوردەی کە لە هەنگاریا گیریان خواردبوو لەم شوێنەی ئێستای شارۆچکەی (کورد)دا ماونەتەوە و شوێنەکەش هەر بە ناوی کوردەوە ماوەتەوە و ئێستا خاوەنی شارەوانی خۆیانن، بەڵام کەسێکیان نییە کوردی بزانێت چونکە ئاوێتەی کۆمەڵگەی هەنگاری بوون و دەرفەتی خوێندنی زمانی کوردییان نەبووە و لەبەر کەمی خۆیشیان زمانەکەیان پێ نەپارێزراوە.
ئەمە ئەوە دەگەیەنێت هەنگاریا کەوتۆتە بەر هەڵمەتی داگیرکردنی عوسمانییەکان، ئەم هەڵمەتانە بە رادەیەک سەرکەوتوو بوون چونکە لە ساڵی ١٥٤٨دا توانییان (بودا) و بەشە دەشتاییەکەی ئەو وڵاتە داگیربکەن. لە قەڵاکەی بودادا کە بەسەر رووباری دانوبدا دەڕوانێت جێگیر بوون. ئەوەی جێگای سەرنجراکێشانە ئەدەبێکی بەرگری ئەوتۆ دژ بە تورکەکان تۆمار نەکراوە، هۆکارەکانی دەگەڕێتەوە بۆ ئەم خاڵانەی لای خوارەوە:

- هەنگاریا پێش ئەم داگیرکردنە بە بیست ساڵێک کەوتبووە ژێر دەسەڵاتی نەمساوە، لەبەر ئەوە ئەم دەستاودەستە زۆر کاریگەری نەکردە سەر هەستی نەتەوایەتی گەلی هەنگاری.
- تورکەکان هیچ کارێکی ئاینی ئەوتۆیان نەکرد کە مەسیحییەکان بووروژێنێت. دەڵێن گوایە لە شاری (پێچ) لە باشووری وڵاتەدا کڵێسایەکیان گۆڕیوە بە مزگەوت، بەڵام دوای رووخانی تورکەکان وەک خۆی لێ کراوەتەوە.
- سەربازی تورک خولیای کچی جوان و هاوسەرگیری ئافرەتی ئەورووپی بوون. بۆ ئەم مەبەستە چەندین مەلەوانگەی کراوەیان دروستکرد. مەلەوانگەی (روداش) کە لە خۆیدا ئاوەکەی گەرمە تا ئێستا ماوە.

سەرقاڵبوونی تورک بە ئافرەتەوە خاڵی لاوازییان بوو، ئەم لاوازییەش بوو بە هۆی رووخاندنیان و دەرکردنیان لە هەنگاریا. لە ساڵی ١٦٩٩دا ئافرەتانی شاری (ئێگەر) پلانێکیان دانا بۆ داگیرکردنی گەورە فەرماندەی سووپای تورک (ئێگەر شارێکی گەشتیارییە، دەکەوێتە رۆژهەڵاتی بوداپێستەوە بە ٥٠ کیلۆمەتر). پلانەکە وا بووکە ئەم ئافرەتانە جوان خۆیان بگۆڕن و بەرەو سەربازگەکە بڕۆن. وەکو چاوەڕێیان دەکرد ئەفسەرو سەربازە تورکەکان بە بێ چەندوچوون هاتن بە پیرییانەوە. ئافرەتەکان کە

پاشێلەکانیان پڕ کردبوو لە خۆڵەمێش، یەکاویەک ئەم خۆڵەمێشەیان کردە چاوی تورکەکانەوە و لە هەمان کاتیشدا کۆمەڵێ جەنگاوەری مەجەڕی لە دارستانە نزیکەکاندا خۆیان حەشاردابوو، هێرشیان بردە سەر سەربازگەکە و توانییان داگیریبکەن. بە داگیرکردنی ئـەم سەربازگەیە ورەی تـورک دابـەزی و چەند پێکدادانێکی تریان دۆڕاند و وڵاتەکەیان بەجێ هێشت.
لێرەدا جێی خۆیەتی کە راستی (دراکـولا) روون بکەینەوە، ئەم ئەفسانەیە نە خوێنمژ بووە و نە بکوژی ئافرەت، بەڵکو ئەمیرێکی نەبەردی رۆژهەڵاتی هەنگاریا بـووە کە لە لایـەن رۆمانییەکانەوە بە (ترانسیلڤانیا) لە لایەن مەجەڕییەکانەوە بە (ئێردەیی) دەناسرێت، سوپایەکی بەهێزی کۆکردۆتەوە و پەلاماری عوسمانییەکانی داوە و سنوورێکی بۆ زوڵموزۆر داناوە. وا دەگێڕنەوە کە ڤالد دراکولا زۆر بەهێز بووە و مەشقی تۆکمەی کردووە بە جۆرێک کە




رمی لە هەر سەربازێکی تورک داوە ، فرێی داوەتە پشتی خۆیەوە. کاتێکیش بە شمشێر شەڕی کردووە دوودڵی نەکردووە لە پارچەپارچەکردنی نێچیرەکانی. بەڵام چیرۆکی خوێنمژین یاخود ڤامپایەر دوورە لە راستییەوە و بەرهەمی خەیاڵی دەرهێنەرانی فلیم و دەزگا سینەماییەکانی رۆژئاوان.
جێگەی خۆیەتی ئێستا بێینە سەر باسی ئەدەبی بەرگری و شاکاری گەورە شاعیری مێژووی هەنگاریا کە ناوی (شاندۆر پێتۆفی) بوو.
شاندۆر لە شارۆچکەیەک کە ناوی (کیشکۆرۆش) ە، لە ساڵی ١٨٢٣دا لە خێزانێکی سەربی لەدایک بووە. نەمساوییەکان کاتێک هەنگاریایان داگیر کردووە هاوڵاتی مەجەڕییان راگواستووە و سەربی و سلۆڤاکی و نەتەوەکانی تریان هێناوە و لە جێگەی ئەوان جێگیریان کـردوون، هـەر بۆیە شاندۆر (کـە بە سربی ناوی ئەلەکساندەر بووە) سەر بە خێزانێکی سربی بووە، بەڵام لە ناخی دەروونەوە مەجەڕی بووە، دڵسۆزی خاکەکەی بووە تا ئەو رادەیەی خۆی بۆ بەکوشتدا.
شاندۆر گەنجێکی لاواز بوو، بەڵام جەسور و زمان پاراو بووە و توانیوێتی بیروباوەڕی خۆی بە ناو خەڵکیدا بڵاو بکاتەوە. کاتێک کە لە ١٥ی ئازاری ١٨٤٨دا لە گۆڕەپانی ناوەڕاستی شاری بۆداپێست کۆمەڵێک خەڵکی لە خۆی کۆکردەوە و هەڵبەستی راپەڕینی بۆ خوێندنەوە، ئەو جـەمـاوەرەی بە شێوەیەک وروژاند کە هەر لەو ئان و ساتەدا شۆڕشی ئازادیخوازانەی مەجەڕ دەستیپێکرد.
سـەرەتـا پـەلامـاری بەندیخانەکانیاندا و بەندە سیاسییەکانیان رزگارکرد، پاشان هەڵیانکوتایە سـەر دامـودەزگـای پڕوپاگەندەی نەمساوی لە بۆداپێست، داگیریانکردن و کردنیانن بە فۆرمی بـانـگـەوازی شـۆڕش. ئـاگری شـۆڕش لـە هەموو قوژبنێکی هەنگاریای کۆندا پەرەیسەند بە شێوەیەک کە لە ساڵی ١٨٤٩دا وڵاتەکەیان رزگارکرد. وەلێ ئەم شاعیرە گەنجە کە یەکێک بوو لە فەرماندەکانی شۆڕش، لە ترانسیلڤانیا بە دەستی نەمساوییەکان

کوژرا و بۆ خۆی ڕۆژی ڕزگاری نەبینی.
بە واتا ئەم شاعیرە مەزنە تەنها ٢٦ ساڵ ژیاوە، بەڵام هەتا ئێستا لە دڵی هەنگارییەکاندا دەژی و هەموو ١٥ی ئازارێک ( کە بە ڕۆژی نیشتیمانی مەجەڕ دادەنرێت) یادی دەکرێتەوە و هەڵبەستی ڕاپەڕینیش کراوە بە سروودی نیشتیمانی.
شایانی باسە ڕزگاربوون و ئازابوونی مەجەڕ تەنها دوو ساڵی خایاند، چونکە ئیمپراتۆری هابسبورگی نەمساوی پەنای بردە بەر قەیسەری ڕووسیا و پێکەوە سووپایەکی بێپەروایان پێکەوەنا و مەجەڕیان داگیرکردەوە.
ئێستا جێگەی خۆیەتی هەڵبەستی ڕاپەڕین بە هەنگاری و بە کوردی بخەینە بەر چاوی خوێنەرانی ئەم گۆڤارە ئازیزە:



Nemzeti dal
Talpra magyar, hí a haza!
Itt az idő, most vagy soha!
Rabok legyünk vagy szabadok?
Ez a kérdés, válasszatok! –
A magyarok istenére
Esküszünk,
Esküszünk, hogy rabok tovább
Nem leszünk!
Rabok voltunk mostanáig,
Kárhozottak ősapáink,
Kik szabadon éltek-haltak,
Szolgaföldben nem nyughatnak.
A magyarok istenére

, Esküszünk
Esküszünk, hogy rabok tovább
!Nem leszünk
, Sehonnai bitang ember
, Ki most, ha kell, halni nem mer
, Kinek drágább rongy élete
.Mint a haza becsülete
A magyarok istenére
, Esküszünk
Esküszünk, hogy rabok tovább
!Nem leszünk
, Fényesebb a láncnál a kard
, Jobban ékesíti a kart
!És mi mégis láncot hordtunk
!Ide veled, régi kardunk
A magyarok istenére
, Esküszünk
Esküszünk, hogy rabok tovább
!Nem leszünk
, A magyar név megint szép lesz
;Méltó régi nagy hiréhez
, Mit rákentek a századok
!Lemossuk a gyalázatot
A magyarok istenére
, Esküszünk
Esküszünk, hogy rabok tovább
!Nem leszünk
, Hol sírjaink domborulnak
, Unokáink leborulnak
És áldó imádság mellett
.Mondják el szent neveinket
A magyarok istenére
, Esküszünk
Esküszünk, hogy rabok továb
!Nem leszünk



شاندۆر پێتۆفی

## سروودی نیشتیمانی

ڕاپەڕە مەجەڕی ڕاپەڕە، خاکەکەت هاوار دەکات
ئێستا نەیکەیت هەرگیز ناکرێت
ئایا کۆیلە بین یان ئازاد بین؟
ئەمەیە پرسیارەکە وەڵامی بەنەوە
بە خوای هەنگاریا
سوێند دەخۆین
سوێند دەخۆین لەمە زیاتر
کۆیلە نەبین
تاکو ئێستا کۆیلە بووین
پێشینانمان کەمتەرخەم بوون
باش وابوو بە سەربەرزی بژین و بمرن
خاکی کۆیلەیی نابێتە ئارامگە
بە خوای هەنگاریا
سوێند دەخۆین
سوێند دەخۆین لەمە زیاتر
کۆیلە نەبین
چ پیاوێک سەرکەوتن بەدەست دێنێت
ئەگەر شەرم لە مردن بکات
ژیانی خۆی بەلاوە ئازیز بێت
نەک سەربەرزی وڵات
بە خوای هەنگاریا
سوێند دەخۆین
سوێند دەخۆین لەمە زیاتر
کۆیلە نەبین
شمشێر لە کۆت و زنجیر درەوشەدارترە
باشتریش دەمانڕازێنێتەوە
کەچی هێشتا کۆت لە گەردنین
دە شمشێرە کۆنەکانتان بخەنەوە کار
بە خوای هەنگاریا
سوێند دەخۆین
سوێند دەخۆین لەمە زیاتر
کۆیلە نەبین
ناوی مەجەڕ دیسان شکۆدار دەبێت
وەک جاری جارانی لێدێت



ئەتیلا جۆزێف

شەرمەزاری ئەم چەند سەدەیە
دەبێت بسڕینەوە
بە خوای هەنگاریا
سوێند دەخۆین
سوێند دەخۆین لەمە زیاتر
کۆیلە نەبین
لەو شوێنەدا کە مەیتەکانمان فڕێ دەدەن
هەر لەوێشدا وەچەکانمان ملکەچ دەبن
بە پشت بەستن بە خوا
ناوی زڕاومان خاوێن دەکەینەوە
بە خوای هەنگاریا
سوێند دەخۆین
سوێند دەخۆین لەمە زیاتر
کۆیلە نەبین

شاندۆر پێتۆفی پێش ئەوەی هەوڵەکانی تەرخان بکات بۆ ڕاپەڕین و شۆرش هەڵبەستی دەربارەی خۆشەویستی نووسیوە، ئەمەش چەند دێڕێکە لە یەکێک لە شیعرەکانی:
حەز دەکەم درەختێک بم
کە تۆ گوڵەکانی بیت
حەز دەکەم گوڵێک بم
ئەگەر تۆ ئاونگی سەر پەڕەکانی بیت
حەز ئەکەم ئاونگ بم
ئەگەر تۆ شەبەنگی خۆر بیت
هەموو حەزەکانم وایە
کە هەمیشە لەگەڵ تۆ یەک بم

کەم نووسەر هەن وەک پالاتزسکی مەیلیان لە نەنووسینەوەی چۆنیەتی دەورانی منداڵی و دەورەکانی‌تری ژیانی خۆیان هەبێ، هەر لەبەر ئەوە زانیارییەکانی وا لە بارەی ئەم نووسەرەوە هەیە لە چەند دێڕێک زیاتر تێناپەڕێ:
یەکێکە لە گەورەترین کەسایەتەکانی ئەدەبی سەدەی بیستەم و لایەنگری ئەدەبیاتی «ناوچەییە » ساڵی ١٨٥٥ لە شاری فلۆرانس لە دایک بووە، سەردەمێکی کەم «فۆتۆریست» بووە و پاشان بۆتە «فاشیست» دوایەش بۆتە رۆژنامەگەر و خۆی لە رێکخراوە ئابووری و هونەرییەکان دوور خستۆتەوە. لە ١٩٤٠ چووە بۆ رۆم و لە ساڵی ١٩٧٤دا لەوێ مردووە.
یەکەم بەرهەمی دیوانە شێعرێکە بە ناوی «ئەسپە سپییەکان» کە لە ساڵی ١٩٠٥ بلاوی کردۆتەوە. یەکەم چیرۆکی بە ناوی «دەنگدانەوەکان» لە ١٩٠٨دا نووسیوە.
باشترین بەرهەمەکانی «چاپەمەنییەکانی سەدەی نۆزدەهەمە »، «خوشکەکانی ماتەرەسی» و «هەق دەسی داوەڵەکانە » کە لە مابەینی ساڵەکانی ١٩٣٢ تا ١٩٣٧ بلاوی کردوونەتەوە. لە ساڵی ١٩٤٨ بە بلاو کردنەوەی رۆمانی «براکانی کوکولی» سەرنجی رەخنەگرانی بۆ لای خۆی راکێشا.
پالاتزسکی خولقێنەری پاڵەوان گەلێکە کە زۆر تایبەتن؛ وەها کە جاری وایە گاڵتەجار و نائاسایی دێنە بەرچاو. هەر بەو هۆیەش کاریگەرییەکی زۆر و بەهێز لە خۆیان بەجێ دێڵن. پالاتزسکی خاوەنی زمانێکی نوێیە و بەهۆی جۆراوجۆری داهێنانەکانییەوە دەچێتە ریزی ئەو نووسەرە هەڵکەوتووانەوە کە هەر بەرهەمێکی دەورێکی تازەیە لە گەشە کردنی ئەدەبی و هونەری ئەو.

****

لە چەند رۆژ لەوەو پێشەوە، لەو شوێنەی وا کۆمەڵێ زارۆکی هارو هاج بە هاتوهاوارەوە تۆپێنیان دەکرد. کوڕێکی ئاوا دە ساڵانە لەولاوە دەهات؛ بەتاقی تەنیا، لە قەراغ مەیدانەکە دادەنیشت و لە کاتێکدا منداڵەکان لە کەفوکوڵی کایەکەدا نوقم دەبوون تەماشای دەکردن. وردیلە و کوشکە کردوو. ئەندامێکی لاواز و چاویلکەیەکی "رەشی تاوگر"ی گەورەی لەچاودا بوو کە نیوەی زیاتری دەموچاوە رەنگ بزرکاوەکەی دادەپۆشی.
منداڵەکان سەرقاڵی کایە و هەر وەکوو نەیاندیبێ وابوو، دواییش بێ ئەوەی سەرنجی کەس بۆ لای خۆی راکێشێ هەڵدەستا و دەرویشت. بەلام رۆژێک کە منداڵەکان کایەیان دەکرد و قاو و قوولیان بوو، کوڕە بەو رۆما هەڵبزرکاوەیەوە کە لە ژێر چاویلکە رەشەکەیدا شارابۆوە، لە کاتێکدا کە هێزی دابووە سەر گۆچانێک بە شەلەشەل، وەکوو پیرە پیاوێکی ماندوو وەدەرکەوت.
لە کاتی وچان دانا یەکێ لە منداڵەکان لێی نزیک بۆوە.
"تۆ کێی؟"
کوڕە بێ ئەوەی جوابی بداتەوە لە پشت چاویلکە رەشە گەورەکەوە تێی رامابوو.
"ناوت چیە؟"
" ئیمیلیۆ."
"چاوت دێشێ؟"
"نا."
"دەی بۆ چاویلکە لە چاو دەکەی؟"
"هی باپیرەمە"
"ئەی باپیرەت کوا؟"
کوڕە سەری داخست؛ گرییەک بەر بینی دەگرت و نەیدەهێشت جواب بداتەوە.
"مردووە؟"
سەری لە قاند :" ئەرێ"
"پیربوو؟"
ئاخێکی هەڵکێشا: "نا"
"بۆ دێی بۆ ئێرە؟ پێت خۆشە لەگەڵ ئێمە کایە بکەی؟"
کوڕە وەلامی نەدەداوە.
دوای کەشەیەکی تر، دیسان کاتی پشوودان منداڵەکان دەوریان دا.
"من ئەوە دەناسم، هەر ئەوەیە وا هەمیشە لەتەک پیاوێکا ئەگەران."
"ئەو پیرە پیاوە باپیرت بوو؟"

دیسان ئاخێکی هه ڵکێشا: "بەڵێ"
"ئەی دایک و باوکت لە کوێن؟"
"من دوو ساڵان بووم ماشێن وەرگەڕا و هەردووکیان تیاچوون."
ئەوەندە هێواش قسەی دەکرد بە حاڵ گوێت لە دەنگی دەبوو.
"بەڵێ، بەڵێ منیش دەمزانی، دایک و باوکی لە وەرگەڕانی ماشێن لە شەقامدا مردن."
"تۆ لە ناو ماشێنەکەدا نەبووی؟"
"نا. لە ماڵێ لای باپیرەم بووم."
"ئەی ئێستا لای کێی؟"
"لای باپیرەم بوو."
"سەد جارم ئەوە دیوە، لەگەڵ ئەو پیرە پیاوە هەمیشە پێکەوە بوون."
"ئەوەندەی لەگەڵ ئەو بووی خۆشت رادەبوارد؟"
"بەڵێ."
"ئاخر چۆن دەتتوانی لەگەڵ پیرە پیاوێکدا کایە بکەی؟"
تروسکەی بزەیەکی خێرا کەوتە سەر رۆما هەڵبزرکاوەکەی.
"دەتەوێ لە گەڵمان کایە بکەی ؟"
کوڕە جوابی نەدەداوە.
"چۆن شتی وا دەڵێی؟ بەم چاویلکە زلە و ئەم گۆچانەوە یانی ها پیرە."
"دەی کەوابوو ئەگەر پیری وەکوو باپیرەت دەمری."
یەکێ تریان هەڵیدایە: "ئێمەش دەتنێژین" ئەو قسەیە دەتکوت چەخماخەیە، لەو چەخماخانەی وا ئاگر لە وڵات بەردەدەن. منداڵان کە هەر دەهات و زیاتر دەبوون، بە سەیرەوە تەماشای یەکتریان دەکرد.
"وەرن، هەمووتان وەرنە ئێرە ئەم پیرە پیاوە داماوە مردووە دەبێ بینێژین."
کوڕە هێزی دا سەر گۆچانەکە و هەستا، وەکوو ئەوەی بڵێ حازرم.
منداڵەکان کە هەر دەهات و زیاتر هۆگری ئەو کایە تازەیە دەبوون، دەست و لاقیان گرت و بەرزیان کردەوە، ئەوانی کەش کەوتنە خۆ و دار و تەختە، تەنەکە شکاو و قووتووە ماسی خاڵییان لە سەر تەپۆڵکەکانی دەوروبەرەوە هێنا و کوڕەیان لە سەر تەختەکە راکێشا.
بە رەوت و هەنگاوی مردوو ناشتنێکی بەڕاستی بەڕێ کەوتن. "مارشێکی" تازیە باری فشەشیان سازکرد. لە پەستا دەنگیان بەرزتر دەبۆوە و تەق و تۆقەکەش توندتر دەبوو. بە دەوراندەوری تابووتێکدا کە کوڕە بە چاوی قووچاوەوە لە سەری ڕاکشابوو، دەرۆیشتن. بەرەو ئەو شوێنەیان برد کە عەرزەکەی وەکوو بە ئانقەست هەڵکەندرابێ وابوو، هەر وەک ئەوەی مەیتێک بنێژن نایانە ناو ئەو چاڵەوە و بە چوار دەوریا وێستان و دەستیان کرد بە لاوێچ لاوێچ خۆڵ بە سەردا کردن. لەگەڵ ئەوەی وردە وردە خۆڵەکە کوڕەی دادەپۆشی جموجۆڵی ئەوانیش زیاتر دەبوو.
پیاوێک کە هەروا لەو نزیکانە و راست لەناو ئەو زەویەدا کاری دەکرد، بە بیستنی ئەو هەڵلا و هەنگامەیەوە شک کەوتبوو، لە پشت پەرژینی زەوییەکەیەوە، هێندێکی چاو لێکردن و دوایەش دەست بەجێ دەرپەڕیە دەرێ. لەگەڵ ئەوەدا کە پێمەڕەکەی بە تووڕییەوە هەڵدەسووڕاند ئامبازیان بوو و وەکوو هەڵفڕینی پۆلێک باڵندە لە کاتی تەقەی تفەنگدا، هەر یەکەی بە لایەکدا پەڕەوازەی کردن : "باوە حیزی چەتەی بێ شەڕەف...!"
ئەوی هەرە گەورەیان ورەیەکی دایە بەر خۆی کە راوەستێ و لابکاتەوە و پێی بڵێ: "پیر بوو، ئێمەش دەبوو بینێژین" قسەکەی کرد خێرا تێی قووچاند.
"ئەگەر جارێکی دی پێتان بەم هەرد و هەوێڵەدا دێتەوە دەزانم چتان لێ دەکەم! هەی بیژووە سەگی فێڵاوی دز...! نەقڵی ئەوەیە دوێشەویش هاتبوونە شەوڕنی ڕەزەکانی من" لەو قووڵکە وا کوڕەیان تیا ناشتبوو نزیک بۆوە و دەستی کرد بە خۆڵ لادان و کێشایە دەرێ. لە قووڵکەکەی هێنا دەرێ و گوتی:
"ئاخر بۆ دێڵی ئاوات لێ بکەن؟"
کوڕە وەکوو یەکێ لە خەوێکی قورس ڕاچەنیبێت، جوابی پێ نەدەدراوە. ئاخری بە خەواڵوویەوە گوتی:
"باپیرەشیان هەروا لێ کرد"

# ئێزرا پاوەند... لە شیعردا بلیمەت و لە سیاسەتدا دۆڕاو

نووسینی: هاشم سالّح
لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

کتێبی (ئێزرا پاوەند.. تەنها گرکان) دەروازەیەکی زۆرباشە بۆ جیهانی ئەم شاعیرە و ئاشنابوون بە ژیانی و کارە شیعرییەکانی. دانەری کتێبەکە پرۆفیسۆر «جۆن تایتل»ە کە لە یەکێک لە زانکۆکانی نیویۆرک، مامۆستای زمانی و ئەدەبی ئینگلیزییە.

ئاشکرایە ئێزرا پاوەند، بە یەکێک لە گرنگترین ئەو شاعیرانە دادەنرێت کە ئەمریکا، بە درێژایی مێژووی خۆی بەرهەمیهێناوە. هەرچەندە بە هۆی لایەنگری بۆ مۆسۆلۆنی لەمیانەی جەنگی جیهانی دووەمدا، ناوبانگی لەکەدار بوو. بەڵام ئەمە کاریگەری زۆر خراپی لەسەر شاعیریەتی ئەو بەجێنەهێشت. لە ڕاستیدا مەسەلەی پێشکەوتنخوازیی و کۆنەپەرستی، بەسەر شیعردا جێبەجێ ناکرێت. زۆرجار کەسێک دەبینین لە بیرکردنەوەیدا کۆنەپەرستە، بەڵام شیعرەکان تابڵێی جوان و نایابن. زۆر جاری دیکە کەسێکی پێشکەوتوخواز دەبینین، بەڵام شیعرەکانی تابڵێی خراپ و بێمانان. تۆ بڵێی (بدوی الجبل) یان نزار قەبانی یاخود شارل بۆدلێر کەسانی پێشکەوتوخوازبووبن؟ لێرەوە دەبا واز لەم پۆلێنبەندییە ڕووکەشانە بێنین. لەگەڵ هەمو ئەو وەرچەرخان و ئاڵوگۆڕانەی بەسەر ئێزرا پاوەندا هات، کەچی کاریگەرییەکی گەورەی بەسەر شاعیر و نووسەرەکانی دیکەوە هەبوو، لەوانە جێمیس جۆیس، ت. س. ئەلیوت، ئەرنست همنگوای و ئەوانی دیکە.

بەڵام ئاخۆ ئێزرا پاوەند کێیە؟ دانەری کتێبەکە ئاوا وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوە: (ساڵی ١٨٨٥ لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەدایکبووە و ساڵی ١٩٧٢ لە شاری بوندوقییەی ئیتالیا کۆچی دوایی کردووە. واتە تەمەنێکی درێژی بردووەتە سەرو زیاد لە ٨٧ ساڵ ژیاوە. ئێزرا پاوەند شاعیر و مۆسیقار و ڕەخنەگرێکی ئەدەبی پلە یەک بووە. لە بیستەکانی سەدەی ڕابردودا، کە هێشتا لە سەرەتای دەستپێکردنی ژیانی ئەدەبیدا بووە، پەیوەندی بە بزووتنەوەی تازەگەری شیعری ئەمریکییەوە کردووە. زۆرجار ڕەخنەگرانی ئەو سەردەمە بە (نەوەی ونبوو) وەسفیان کردووە. ئەوەش ناونانێکی تابڵێی جوان و قەشەنگە، چونکە شیعر بەبێ سەرگەردانی یان ونبوون چ مانایەکی هەیە؟ لەو سەردەمەدا «هۆف کبینیر»ی ڕەخنەگر ئێزرا پاوەند دەبینێت، پاشان بەم شێوەیە باسی دەکات: لە ناکاو هەستمکرد لەبەردەم تازەگەری شیعریی و هونەریدا ڕاوەستاوم! تازەگەری شیعریی لە کەسێتیەکەیدا بەرجەستە ببوو، دروست وەک ئەو موغامیرانەی دیکە کە خۆیان فڕێدەدەن نێو ڕێگا پێچاوپێچەکانی ئەزمونی داهێنانەوە).

ئێزرا پاوەند لە نێوان ساڵانی ١٩٠٠ — ١٩٠٥ لە زانکۆی بنسلڤینیای نیویۆرک، ئەدەبی بەراودکاری دەخوێنێت، بەڵام ساڵی ١٩٠٨ کە تەمەنی هێشتا ٢٣ ساڵی تێنەپەڕاندووە، ئەمریکا بەجێدەهێڵێت و ڕوو دەکاتە ئەوروپا. چونکە نەیتوانیوە خۆی

لەگەڵ کۆمەڵگای ئەمریکیدا رابێنێت. ئێزرا پاوەند کەسێکی هەڵسوکەوت سەیر بووە. واتە کەسێکی نا نموونەیی و ناکۆمەڵایەتی بووە. ئەمەش یەکێکە لە خەسڵەتی داهێنەرە گەورەکان. ئایا بۆدلێر لەگەڵ کۆمەڵگادا تەبابوو؟ ئەی رامبۆ؟ یان هۆڵدەرلین؟ شێتیان کردن.

ئێزرا پاوەند سەرەتا لە شاری بوندوقییە نیشتەجێ بووە، بەڵام تەنها ماوەیەکی کورت تێیدا ماوەتەوە. دواتر زۆر بەخێرایی ئەو شارەی جێهێشتووە و رۆشتووە بۆ لەندەن، پایتەختی ئەدەبی ئینگلیزی و قیبلەی هەمو شاعیر و ئەدیبەکانی ئەو سەردەمەی ئەمریکا. لەوێ نووسەرە گەورەکانی ئینگلیز دەبینێت، لەوانە جێمس جۆیس، فۆرد مادۆکس فۆرد، ویندهام لویس. لەو سەردەمەدا ئێزرا پاوەند هێشتا هەر سەر بە (بزوتنەوەی ئیمیگیزم imagism - الحركه الت×ويريه) بووە. ئەمە بزوتنەوەیەکی ئەدەبی بوو، لە رێگەی بەکارهێنانی زمانێکی لیرکییەوە، چوونەتە نێو دونیای ئەزمونگەری شیعرییەوە.

ئێزرا پاوەند لەژێر کاریگەری ئەدەبی خۆرهەڵاتی دوورو بەتایبەتی شیعری یابانیدا بووە. ئەو کۆمەڵەیەی سەر بەو بزوتنەوە ئەدەبییە بوون، بەرهەمەکانیان لە گۆڤارێکدا بڵاودەکردەوە ناوی (خۆویست - الانانی) بوو. تەماشای ئەم ناوە وروژێنەرە بکە چەند جوانە! ئایا داهێنەر جگە لەوەی خۆپەرست و گۆشەگیربێت، دەتوانێ شتێکی دیکە بێت؟ ئایا دەتوانێ جگە لەخودئەڤینی، هیچی دیکە بێت؟ ئێزرا پاوەند دوای ئەوەی «هونەری گۆدییە برزیسکا»ی پەیکەرتاش دەبینێت، (بزوتنەوەی گێژاو، vorticism الحركه الدواميه) لە شیعری ئینگلیزیدا دێتەئاراوە. ئەمەش بزوتنەوەیەکی ئەبستراکی دیکە بوو کە نزیک بوو لە ئاقاری ئایندەگەرایی لە شیعردا و دواهەمین هاواری ئەو بزوتنەوەیە بوو*. بەشێوەیەکی گشتی ئەو بزوتنەوە شیعرییە، تا دواسنوری مومکین جەختی لەسەر چڕکردنەوەی شیعر دەکرد.

پاشان ئێزرا پاوەند لە میانەی جەنگی جیهانی یەکەمدا، لە ئیرلەندە چاوی دەکەوێت بە شاعیری گەورە «ویلیام بتلەر بیتس» و دەبێتە سکرتێری ئەو شاعیرە. وەک چۆن دواتر «سامۆئێل بێکیت» دەبێتە سکرتێری جێمس جۆیس. ئێزرا پاوەند ساڵی ١٩١٤ لەگەڵ خانمی هونەرمەند «دۆرسی شکسپیر» هاوسەرگیری دەکات. تەماشای ناوی ئەو خانمە بکەن! دوای ئەوە ئێزرا پاوەند فێری زمانی یابانی دەبێت و گرنگی بە شیعری لیرکی دەدات کە لە خۆرهەڵاتی دوور باوبووە. ساڵی ١٩١٥ دەست دەکات بە نووسینی شاکارە ئەدەبییەکەی «کانتۆس»، واتە سروودەکان کە بەدرێژایی ژیانی کاری لەسەر کردووە.

دوای ئەوە لە ژیانی ئێزرا پاوەند دا، قۆناغی پاریس دێت، ئایا هیچ داهێنەرێک لە جیهاندا هەیە، رۆژێک لە رۆژان بە پاریسدا تێنەپەڕیبێت؟ شیعر بێ بوەیهیمی یان بێ سوڕانەوەی ناکۆتا بە شەقامەکانی پاریسدا چ مانایەکی هەیە؟ شیعر بێ چاوبازی ئازادانە و گێچەڵگرتن چ مانایەکی هەیە. بەڵێ ئێزرا پاوەند ساڵی ١٩٢٠ دەگاتە پاریس و بەخێرایی پەیوەندی بە کۆمەڵێ لە ئەدیب و هونەرمەندە پاریسییەکانەوە دەکات، لەم کۆمەڵە ئەدیب و هونەرمەندانەوە یەکەمجار بزوتنەوەی دادایزم لەدایکدەبێت و دووەمجار بزوتنەوەی سوریالیزم پێکدەهێنن. لێرەوە ئێزرا

پاوەند لە شوقە پاریسییە سادەکەیدا، پێشوازی لە گرنگترین نووسەرەکانی فەرەنسا دەکرد، لە نموونەی جان کۆکۆتۆ، ئەندرێ بریتۆن و داهێنەرە شێتەکانی دیکە. ئێزرا پاوەند تابلێی میهرەبان و دەستبڵاو بووە، ئاخر چ مانایەکی هەیە شاعیر ڕەزیل و دەستنوقاو بێت؟ هەمو خەڵکی دەتوانن ڕەزیل بن، تەنها شاعیر یان شێت نەبێت کە ناتوانێت ڕەزیل و دەستنوقاو بێت. لەو سەردەمەدا بە ڕێکەوت ئارنست همنگوای لە پاریس دەبێت، سەردانی ئێزرا پاوەند دەکات کە شوقەکەی دەرگای بۆ هەموان کراوە بووە. ئێزرا پاوەند لە لایەنی ئەدەبییەوە کاریگەری لەسەر همنگوای دەبێت و لەڕێگەی ئەو ڕێنماییانەی دەیخاتە بەردەستی، وادەکات همنگوای شێوازی نووسینی باشتربێت. کەچی ئێزرا پاوەند خۆی هەرگیز کاری بەو ڕێنماییانە نەدەکرد!

دانەری کتێبەکە ئاماژە بەوە دەکات کە ئەرنست همنگوای بەهۆی ئێزرا پاوەندەوە، بەرهەمی نووسەرە تازەکانی وەک ت. س. ئەلیوت و جێمس جۆیس دەناسێت. ئەمە جگە لە نووسەرە کلاسیکییە گەورەکانی وەک فلۆبێر و ستندال و هنری جیمس...هتد. لە بەرامبەر ئەم خزمەتگوزارییە ئەدەبییانەدا، همنگوای وانەی زۆرانبازی بە ئێزرا پاوەند دەڵێتەوە، تاکو ماسولکە و بازووی بەهێزببن! ئێزرا پاوەند دەڵێ: نووسەرە باشەکان ئەو کەسانەن زمانێکی چالاک بەکاردەهێنن، واتە زمانێکی ورد و ڕوون و ئاشکرای بێ گرێوگۆڵ.

ئێزرا پاوەند پێوابوو ئەو پارەوپولە زۆرەی کڵێسا مەسیحییەکان کۆیانکردووەتەوە، پێویستە بەسەر هونەرمەندان و شاعیران و فەیلەسوفان و زاناکاندا دابەشبکرێت کە یاساکانی جیهان دەدۆزنەوە و خزمەتی زۆر بە مرۆڤایەتی پێشکەش دەکەن. ئەوان زیاتر شایەنی وەرگرتنی ئەو پارەوپوولەن تا مەترانەکان و کەرادیلەکان و پاپاکان و پاشا بێ ئیش و کارەکان. دەکرێ بڵێین ئێزرا پاوەند لە لایەنگرانی فەیلەسوفی چینی «کۆنفۆشیۆس» بوو، ئەم فەیلەسوفە پرنسیپەکانی ئاینی مەدەنی فێرکردین کە تێیدا بە شێوەیەکی زۆر باش ئەرکە کۆمەڵایەتییەکانی هەمو کەسێکی دەستنیشان کردووە: سەرەتا لە ئیمپراتۆری وڵاتەوە دەستپێدەکات تا دەگاتە سەر بچوکترین جوتیار یان زبڵڕێژ.

وەلێ ئێزرا پاوەند لە ژیانیدا گەورەترین هەڵەی کرد، کاتێ بڕوای وابوو ئەو دەوڵەتە فاشیستییەی مۆسۆلۆنی لە ئیتالیا دایمەزراند، نموونەی ئەو دەوڵەتە مەدەنییەیە کە کۆنفۆشیۆس خەونی پێوەدەبینی. ئێزرا پاوەند دوای کۆتاییهاتنی جەنگی جیهانی دووەم، باجی ئەو هەڵەیەی زۆر بە قورسی دا. ساڵی ١٩٤٥ ڕاپێچی دادگایان کرد و پێیانوابوو لەلایەنی عەقڵییەوە نەخۆشە، هەر بۆیە لە خەستەخانەی شێتەکان بۆ ماوەی دە ساڵ یان زیاتر، زیندانی کرا. لەگەڵ ئەم کەوتنە ئەخلاقییە گەورەیەدا، کەچی هەندێ لە ڕەخنەگرەکان پێیانوایە یەکێکە لە شاعیرە هەرە گرنگەکانی خۆرئاوا لە سەدەی بیستەمدا، ئەمە ئەگەر لە هەموویان گرنگترنەبێت. زۆرێک لە پلەبەندی شیعریدا لەسەروی «ت. س. ئەلیوت»ەوە دایدەنێن. ژمارەی ئەو شاعیرە تازەگەرانە زۆر کەمن کە توانا شیعرییە داهێنەرانەکەی ئێزرا پاوەندیان هەبێت. شیعرەکانی تا دوا سنور بۆنی بەهێزی ئازادییان لێدێت.

ئایا ئێمە دەزانین کە ئێزرا پاوەند هەمو جۆرە شیعرەکانی خۆرهەڵاتی دووری، وەرگێڕاوە بۆ ئەوروپا؟ ئەو لە میانەی ئەو کارەیەوە بەشوێن زمانێکی شیعری گەردونیدا دەگەڕا، هەر لەبەر ئەوەیە خۆی فێری چەند زمانێک کردووە. ئێزرا پاوەند لەو باوەڕەدا بووە شیعری یابانی و چینی و هیندی، زیاتر لە بەرائەت و سروشتەوە نزیکن و بەشێوەیەکی باش گوزراشت لەو دووانە دەکەن. لێرەوەیە گرنگییەکی زۆری بەو شیعرانە داوە. ئەو لە شیعری ئەو نەتەوانەدا، بە شوێن شتە سەرەتاییەکان، عەفەوییەکان، ڕاستگۆکاندا دەگەڕا کە هێشتا مۆدێرنەی پیشەسازی پیسی نەکردوون، وەک ئەوەی لە کۆمەڵگاکانی ئەوروپا و ئەمریکادا ڕویـداوە. ئەو لە شیعردا بەشوێن بەرائەتی ڕەهـادا دەگـەڕا، شیعر چ سودێکی هەیە گەر گەڕانێکی هەمیشەیی نەبێت بەشوێن یەکەمین بەرائەتەکاندا؟ چ مانایەکی هەیە گەر هەڵکۆڵینێکی ئارکۆلۆجی قوڵایی ناخ نەبێت، واتـە هەڵکۆڵینێک بۆ بەرائەتە ونبووەکان، ئـەو بەرائەتانەی لە قوڵایی ناخێکی بێ بندا شاردراونەتەوە و داپۆشراون. تەماشای کتێبی (شیعرو قوڵایی) بکەن، لە نووسینی ڕەخنەگری فـەرەنـسـی «جـان بییر ریـشـار» کـە تێیدا دەهالیزەکانی بۆدلێر و چینەکانی ژێری ژێرەوە ئاشکرا دەکات کە بۆدلێر ڕۆچووەتە ناویانەوە، ئـەوانـە ئـەو ناوچە مەترسیدارەن کە هەرگیز هیچ کەسێک نەیوێراوە پێی تێبخات. بیرۆکەی سەرەکی لای ئێزرا پاوەند بریتییە لەوەی: ئەو پەیوەندییەی لەنێوان شتەکاندا هەیە، لە خودی شتەکان گرنگترە. بـەڵام ئەمە هەمو کەسێک نایبینێت، تەنها شاعیری گەورە نەبێت.



ئێزرا پاوەند

دواجار دانەری کتێبەکە دەڵێ: ئێزرا پاوەند ئەو کەسەیەساڵی ١٨٨٥ لە قوڵایی ئەمریکا لەدایکبووە، بەڵام بەهۆی ڕازینەبوونی بە مەیلی گوێڕایەڵی و حەزکردنی لە مەیلی تاکگەرایی و یاخیبوون، لە زانکۆکانی ئەمریکا دەرکرا. ئیدی ڕۆشت بۆ ئینگلتەرا، لەوێ و لە جیهانی لەندەنی ئەدەبیدا شوێنێکی شایستەی داگیرکرد. لەوێ دەمامکێکی لەسەرنا تا یەکەم شیعری بنووسێت و ئەوەی پێیدەوترێت قوتابخانەی تەسویری داهێنا. ئەو قوتابخانەیە قوتابخانەیەکی شیعری تازەگەر بوو، بانگەشەی بۆ خۆڕزگارکردن لە وەزن و قافییە دەکرد و داوایدەکرد بە وێنەی شیعری ڕوون و ئاشکرای بێ ئاڵۆزی و ڕەمز، گوزارشت لە فیکر و هەڵچونەکان بکرێت. ئاشکرایە ئێزرا پاوەند لە سەرەتای گەنجیدا دەڵێ: (مەزنترین شیعر دەنووسم کە دەرفەت بۆ بوونەوەرێکی سەر گۆی زەوی ڕەخساوە بینووسێت). ئەو قسەیە هەمان ئەم قسەی «المعری»ی بیرخستمەوە: (من گەرچی دواهەمین کەسی زەمانەکەی خۆمم، ئەوە دەنووسم کە پێشەنگەکان نەیانتوانی بینووسن).

لە واقیعیشدا هەر ئەوە ڕویدا. ئێزرا پاوەند یەکێک بوو لەو پێشەنگانەی شیعری حوڕی بەکارهێنا و لە وەزن و قافییە دوورکەوتەوە. ئەو ڕۆڵێکی مەزنی لە بەرپاکردنی شۆڕشی تازەگەری شیعریدا بینی کە لە سەدەی بیستەمدا کاریگەی بەسەر هەمو ئەدەبی ئینگلیزییەوە هەبوو. یاخیبوونە شیعرییەکەی هاوکاتە لەگەڵ یاخیبوونە دەرونی و شەخسییەکەیدا. ئێزرا پاوەند بەوە بەناوبانگ بوو زۆر دژی داب و نەریتی باوی کۆمەڵگابوو، حەزی لە چوونەدەرەوە بوو لە شتە باو و مەئلوفەکان. هەر ئەمەش بوو سوریالییەکان تێیدا خۆشیاندەویست. ئێزرا پاوەند شەیدای وەسنیەت بوو، ڕقێکی زۆری لە ئەمریکا بوو، چونکە ئەمریکا لەیەککاتدا کتێبی پیرۆز و دۆلاری دەپەرست!

دواجار ئێزرا پاوەند دەڵێ: (هەڵەبووم، بە ڕێژەی نەوەد لە سەدا هەڵەبووم، لەنێو گێژەڵوکەکەدا عەقڵی خۆم لەدەستدا). زۆر درەنگ داوای لێبوردنی کرد لە ئەزمونی فاشیزمی لەگەڵ مۆسۆلۆنی. بەڵام ئێزرا پاوەند ئەزمونی ژیانی خۆی، لەیەک پەرەگرافی شانازیبەخشی زۆر جواندا کورتکردووەتەوە و دەڵێ: (شکستێک یەکسانە بە هەمو سەرکەوتنەکانی سەردەمەکە).

*بزوتنەوەی vorticsm وەرگێڕانەکەی بۆ کوردی دەبێتە (بزوتنەوەی گێژەڵوکەیی)، بزوتنەوەیەکی ئەدەبی و هونەریی ئەبستراک بوو، لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا لە ئینگلتەرە سەریهەڵداوە، بەڵام زۆری نەخایاندووە و تەمەنی تەنها چەند ساڵێک بوو: ١٩١٢-١٩١٥. ئێزرا پاوەند یەکێک بووە لە دیارترین نوێنەرەکانی. گەرچی ڕێباز و پرنسیپەکانی ئەم بزوتنەوەیە بە تەواوی دیار و ڕوون و ئاشکرا نەبووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هیچ گومانێکی تێدانییە کە پەیڕەوکەرانی ئەم بزوتنەوەیە لە هونەردا، زیاتر بایەخیان بە فۆرم داوە تا بە ناوەڕۆک. ناونانی ئەم ڕەوتە ئەدەبی و هونەرییە بە بزوتنەوەی گێژەڵوکەیی، بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە (وێنە image) کۆڵەکەی شیعرە و وێنەی شیعری وەک گێژەڵوکە وایە کە فیکر پەنای بۆ دەبات و لێیەوە دەردەچێت. (و.ک، لە ئەنتەرنێتەوە)

**سەرچاوە:**

الشرق الاوسط، ٢٠١٣/١٠/١٦

# وتارێک دەربارەی گەوهەری مێژوو

ئیحسان تەبەری
لە فارسییەوە: کاوە

لیۆ تۆلستۆی، مێژووی ئینسان بە گەڕانێکی راز ئامێز، پەی پێنەبراوو، پێشبینی نەکراو، دادەنێت کە دەسەڵاتێکی دورە دەست بە حەزو ئارەزووی خۆی ئەیسوڕێنێتەوە.

کارێل یاسپێرس فەیلەسووف و بیرمەندی هاوچەرخی ئەڵمانی، مێژوو بە هاتنەدی وردەوردەی خەون و ئارەزووی دیاریکراو دانانێت، بەڵکو مێژوو لای ئەو وەزعیەت و بونیادێکی بەرچاو و سەربەخۆیە بەدوور لە دەستێوەردان و دەسەڵاتی مرۆڤ، هەر بۆیە مێژوو بەو ئاراستەیەدا ناچێت کە وەچە (نەسل) ەکان ئەیانەوێت و گەلێ شتی سەیر و سەمەرەی چاوەڕواننەکراوی لەناخدایە.

هایدگر، بیرمەندێکی دیکەی هاوچەرخی ئەڵمانی کە ئەویش وەکو یاسپێرس بە بناغەدانەری مەکتەبی وجودیەتی ئەڵمانی ناسراوە، مێژوو بە بیابانێکی رەهاو نەزۆک ئەشوبهێنێت و لەو باوەڕەدایە کە مرۆڤ دەبێت پەڕینەوەی خۆی لەگەڵ ئەودا بەرانبەر و تەتبیق بدات و، بە هێمنی و لەسەرخۆ،

وەک ڕەواقیەکان خۆی بۆ خولی گیان توێنەری ئەو ئامادە بکات. ئەم بۆچوونە جۆرێک زیادەڕۆییە بە بەراورد لەگەڵ ئەو بیرۆکەیەدا کە دەڵێت گەڕانی مێژوو بە ئاراستەیەکی قەدەری و لە ئەزەلەوە دیاریکراوە بەرەو ئامانجێکی تایبەت.
ئایینداراکان ئیرادەی یەزدان بە جەوهەری مێژوو ئەزانن و مێژوو لای ئەوان یانی هیدایەتی مرۆڤ لەلایەن پێغەمبەرانەوە و گەیشتنی ئینسان بە دۆزەخ یان بە بەهەشت کە دەرەنجامی کردەوەی خێر یاخود شەڕی مرۆڤە و لە ئاکامدا تێکرای مرۆڤەکان بەرەو قیامەت و زیندووبوونەوە و وەرگرتنی پاداشت یاخود سزادان ئەڕۆن. تەنانەت ئەوانەش کە دەوری خوا لە مێژوودا وەلائەنێن و مرۆڤ بەحەق بە قارەمانی ناوەندی (دەورگێڕی یەکەمی) مێژوو ئەزانن، زۆرجار تەسەورێکی بەستوو بێڕەنگیان (وەکو ڕوانینیی ئایینی) بۆ ئەم چەمکە هەیە. واتە ئەڵێت مێژوو بەرنامە و ئەرکێکی لەئەستۆدایە و لە چارەنووسیدا نووسراوە کە وەچەیەکی تایبەت بە هوشیاری ووردبینییەوە ئامادە و فەراهەم کردووە، هەربۆیە کاتێک مێژوو لە ڕەوتی خۆیدا، شتی سەیر و سەمەرە ئاشکرا ئەکات، ڕووبەڕووی سەرسوڕمان و گومان و لە ئاکامیشدا ڕەشبینی و ئینکار دەبنەوە.
لەنێوانی ئەم دوو بۆچوونەدا، ئەڵتەرناتیڤێکی سێهەم، بەڕای من هەیە کە بە دروستی و هاوکات ئەم ئاڵۆزی گەڕانەی مێژوومان بۆ ئاشکرا ئەکات و گەوهەری ئەم خولانەوە دەرئەخات ئەویش ئەمەیە:

*بزاڤی مێژوی مرۆڤ، وەکو مێژووی مادە بە گشتی، پێڕەوی یاسا گشتیەکانی تەکامولی مادەیە. مێژووی مرۆڤ بەکوڵ و کۆترین و سەیرترین بەشی ئەم تەکامولەیەو لەم ڕێگەدا هەر ئان و ساتێک سیستمێکی هاوئاهەنگ و ئاڵۆزتر و باڵاتر دێتە ئاراوە و ئەم ڕەوتە هەرگیز کۆتایی پێنایەت و بەردەوام شتی تازە و چاوەڕواننەکراوتر بەخۆوە دەبینێت.

*هەرچەند ئەتوانین ڕێگەی گشتی مێژووی مرۆڤایەتی لەسەر تابلۆی بیر و هزرێکی تەجریدی بەرێکوپێکی و بەشێوەیەکی زانستیانە دیاری بکەین، بەڵام بەرزونزمی و چاڵ و چۆڵی ئەم ڕێگەیە بەکەس پێشبینی ناکرێت. مێژوو بەرەو ئامانجێک ڕێدەکات کە ئەم ئامانجە خودی خۆی لە ناچارکردنی ناخی بزاوتی تەکامولی سیستەمی ئاڵۆزی کۆمەڵگای مرۆڤایەتیەوە، هەڵقوڵاوە. مێژوو بەردەوام ڕێدەکات، بەڵام تاکەی و تاکوێ و چۆنایەتی ئەم ڕۆشتنە ڕوون و ئاشکرا نیە. ئەتوانین بۆ سەردەمێکی کورت، بەشێوەیەکی ئیحتمالی، هەندێ تایبەتمەندی وردی ڕەوتی مێژوو دیاری بکەین، بۆ وێنە خێرایی و هێواشی و لەسەرخۆیی بزاوتی تەکامولی مێژوو لە زەماندا، یاخود کارەسات لێ کەوتنەوە یا پێچەوانەکەی، ئیمکانی ڕوودانی شتێک لە شوێنێکی دیاریکراودا.. کە ئەمەش خۆی نیازی بە کۆکردنەوەی کۆمەڵێک فاکت و زانیاری پێویست هەیە بەڵام بە دڵنیاییەوە، ئەم تایبەتمەندییە وردانە بۆ سەردەمێکی درێژخایەن ناتوانین دیاری بکەین، چونکە مێژوو هیچکاتێک نموونەیەکی پێشوەخت ئامادەکراو وەکو بەرنامەی عەمەلی قبووڵ ناکات. تاکە پێشبینی زانستی توندو تۆڵ و پایەدار پێشبینی ڕەوتی گشتی مێژوو لەسەر بنەمای ناسینی یاسا و ڕێساکانی مێژووە.

*مێژوو خەلقکەر و هاوکات خوڵقێنراوە. وەکو هێزێکی ئاشکرا و بەر چاو و سروشتی لە دەرەوەی دەسەڵاتی مرۆڤ و وەچەکانی تێکدەر و دروستکەری سیستم و تێکڕای سەربوردەکانە. بەڵام وەکو کۆمەڵێک کرداری ئاگایانە و نائاگایانەی میلیاردەها مرۆڤ، دروستکراوی ئەوانە. مێژوو دونیای رووبەڕووبوونەوەی عەین و زەین (واقع و فیکر)ە.

هەروا کە مادە دارای شانایەکی سەرەتایی یاخود پلاسمایەکی بزۆز و سووتێنەرە کە هەوێنی یەکەمینی جیهانی جۆراوجۆرە، پراکتیک (کردە) پلاسمای مێژووە. لە پراکتیکدا، عەینی مێژوویی لە زەیندا ئەشکێتەوە و دەبێتە عەینیەتی مێژوویی. ئەم پلاسما بزۆز و ئاڵۆز و سوتێنەرە کاتێک لەگەڵ فکر و ئیحساس و کرداری میلیاردەها مرۆڤ بەرەو ڕوو ئەبێتەوە، شێوەگەلێک لەخۆ دەگرێت و بە ئاڕاستەیەکدا ئەڕوات کە ناتوانرێت بە گشتی پێشبینی بکرێت یان لێی تێبگەیت، ئەم تێنەگەیشتنەش لە میکرۆ پرۆسێسەکانی مێژوو دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەم روداوانە لە حەشارگە و بە شێوەیەکی نهێنی لە مێژوودا لەدایک ئەبن و دواتر بە شێوەی رووداووی دابڕاو لە یەکتر خۆیان دەرئەخەن. بەڵام لە ماکرۆپرۆسەکانی مێژوو، ئەو دەمەی رووباری ئیرادەی ملیۆنەها مرۆڤ دەبێتە "دەریای مێژوویی" و دەبێتە شەپۆلی نەسرەوتی "یاسا مێژووییەکان" مێژوو دەنووسرێت و مەیدان مەیدانی شارەزایی و دەرکی زانستیە هەروا هەنگامەی مێژوو دەبیسترێت و شتە بینراوەکان و دیمەنەکان و هێڵە سەروەکان ئاشکرا دەبن.

*وزەی بزاوتی مێژوویی مرۆڤ، ناکۆکی و دژایەتییە: ناکۆکی بیۆفیزیکی (دژایەتی لەگەڵ سروشت، ناکۆکی لەگەڵ ئەتنیک و رەچەڵەک، ناکۆکی تەمەن و ڕەگەز) یان ناکۆکی کۆمەڵایەتی لە نێوان چینەکانی کۆمەڵگا (بەرهەمهێنەر و بەرخۆر) یاخود دژایەتی ئاشتیانە لە کۆمەڵگای یەکسانی دوور لە جیاوازی چینایەتی کە بەردەوام لەلایەکەوە لە نێوان بزاوتی هێزە بەرهەمهێنەرەکان و ئاستی تێگەیشتنی ئەوان لەگەڵ ئەو لای دیکە، واتە پەیوەندیەکان و سازمان و ئەو نیزام و رێکخراوانەیدا کە هەن جۆرێک لە ناتەبایی و ناهاوئاهەنگی دێتە ئاراوە کە دەکرێت بەشێوەیەکی ئاشتیانە و بەبێ ئەوەی کارەساتی لێ بخوڵقێت چارەسەر بکرێن، لە ڕاستیدا، دژایەتی ڕۆن و سوتەمەنی گڕ و کڵپەی زۆپای مێژووە.

*تاک (مرۆڤ) سەرەڕای بچووکی خۆی، دەورێکی گەورە لە مێژوودا دەگێڕێت. دەتوانێت لە کاتەکان بە جوانی کەڵک وەربگرێت و گالێسکەی مێژوو خێراتر بەرەو پێشەوە ببات.
تاک ئەتوانێت بە لەبەرچاوگرتنی تایبەتمەندی خۆی و لێهاتوویی، تواناکانی خۆی لە پراکتیکدا بخاتە گەڕ و لەسەر هەویری لاستیکی مێژوو مۆر و نیشانی چاک یان خراپی خۆی بەجێبهێڵێت. زۆرێک لە رووداوە گەورەکانی مێژوو بە تاڵی ناسکی دەزووی ئیرادەی ئەم یان کەسێکی ترەوە بەندەو دەیان قارمانی گومناوو نەناسراو لە مێژوودا دەوری گەورەیان گێڕاوە و کەسیش حسێبی بۆنەکردوون.

*ئەوەی بەسەر خوالێخۆشبوی مێژوودا دێ لە چێشتخانەیەکی نهێنی و رازئاویدا ئامادەدەکرێت. ئەم چێشتخانەیە ژوانگەی رۆحی و گیانی مرۆڤە

دروستکەرەکانی مێژووە لەلایەک و، لەلایەکی تریش رووداوە سەرسوڕهێنەرەکان و چۆنیەتی و شکاندنەوەی رەنگەکانی ژیانی کۆمەڵگا لە هەست و نەست و، هەست و نەستیش لە ژیانی کۆمەڵگادا، هەر بۆیە ئەگەر توێژەرێک بە وردی سەیری بکات لەم رەوت و موکاشفە سەری سووڕ دەمێنێت.

زانستی ئەمڕۆ بۆمان ئاشکرا دەکات کە دروستبوونی گەڵای گوڵێک لەژێر چەتری پەڵە هەورێکدا لە کۆبوونەوە و بەستنی میلیۆنەها دڵۆپە ئاو پێک دێت و لە ئاسمانەوە تا سەر زەوی، رێگایەکی ئاڵۆزو دژواری لەبەردایە، بەڵام لەم ڕەوتە ئاڵۆزکاوتر، بلووری رووداوە مێژووییەکانە کە سەد هێندە سەیر ترە. هەربۆیە گەر بمانەوێت لە مێژوودا ببینە دادوەرێکی عادل، دەبێت لە هەڵسەنگاندنی بەپەلەی مێژوو و هەروەها لە قەبووڵی تەعبیر و ڕاڤەکردنی رووداوەکان کە زۆرداران نووسیویانە، خۆ بپارێزین. تا بێت فریوی ناوبانگ یاخود بەدووی قسەی خەڵکی ئاسایی بکەوین و رواڵەتەکان ببینین و بە ناخی رووداوەکاندا شۆڕ نەبینەوە و نهێنیەکانی رازاوی گیانەکان و رووداوەکان هەست پێنەکەین.

دەبێت بە شێوازی زانستی بیرکردنەوە و لە ژێر رووناکی توێژینەوەدا، بڕۆینە ناو گێژاوی مێژوو لەناو کارێزە تاریکەکانی مێژوودا زۆلاڵی واقعیەتەکان هەڵهێنجێنین و پێوەری ئەم قەزاوەتەشمان دەبێت ئەمە بێ: "حەق ئەو شتەیە کە بە قازانجی رەوتی تەکامولی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بێت".

*"جیهان بەسەر شارێی عەدالەتدا ئەڕوات". دروستی ئەم وتەی حافزی شیرازی ئەمڕۆکە ئاشکرایە، چونکە مێژووی لەخۆبوردویی و هەوڵ و تەقەلای مرۆڤ تەنیا فیداکاری و هەوڵێکی رەواقی (تسۆئیک) نیە کە تەنیا لەبەر زاتی فەزیڵەت و پاراستنی لێهاتوویی مرۆڤ بێت بەڵکو جۆرێکە لە هەوڵ و فیداکاری تێلەئۆلۆژیک بە مەبەست و ئامانجێکی تایبەت. دەبێت نەسرەوین و رەوتی تەکامولی مێژوو خێراتر بکەین. ئەمەش پێویستی بە فیداکاری و هەوڵی گشتی هەیە. بۆیە ئێمە بە پێچەوانەی وجودیەکان مێژوو بە وتنەوەی رەها و گۆڕەپانێکی نەزۆک دانانێین.

مارکسیزم — لێنێنیزم یانی شیکردنەوەی مێژووی سەردەم و دیاری کردنی هێڵە گشتیەکانی تەکامولی مێژوو بەبێ واستیە. ئاشکرایە کە م.ل لە پێشیەوە هیچ حوکمێکی دۆگم لەم بارەوە دەرناکات و خۆی ئەداتە دەست ئەو ڕاستی و وردبینیانەی کە لە پراکتیکدا دێتەپێشێ. هەربۆیە م.ل زانستی، گشتی، وردبین و کامڵترین لێکدانەوە و باشترین بەرنامەیە بۆ موبارزەو کارو داهێنان بەدەست وەچەی ئێستاو داهاتووەوە. م.ل باشترین پێوەری بۆ هەڵسەنگاندنی مێژوو لەم سەردەمەدا داناوە و بەشێوەی تەرحێکی فاتاڵ و بەسیت و ئایینی ناڕوانێتە مێژوو و مێژوو بە شتێکی بێ ئەسەر (نێرەمووک) و یاخود کۆمەڵێک رووداوی بێ مانا دانانێت. ئەم ڕوانینە دروستە بۆ مێژوو هۆکارێکە بۆ ئەوەی مارکسیەکان خۆیان لە کلێشە دانان و هاوکات لە تەسلیم بوون لە بەرانبەر "ئیراسیۆنالیزمی مێژوویی" دوور بگرن.

سەرچاوە:

نووسراوە فەلسەفی و کۆمەڵایەتیەکان — ئیحسان تەبەری — ١٣٨٢ حیزبی شیوعی ئێران (تودە).



# نامەی نهێنی

فروغی سەفیر
لە فارسییەوە: کاوە

نامەیەک لە مەرحومی فروغی سەفیری گەورەی ئێران لە پاریس، کە لە تورکیاوە بۆ وەزیری دەرەوەی ئێران ناردوویەتی (لە بەرواری دووەمی سەرماوەرزی ١٣٠٦ (کـــە) بەرامبەر ١٩٢٧زاینی مانگی نۆڤمبەر) (ئۆلتیماتۆمی تورکیا بە ئێران- ئەمنیەتی سنور. هەڵسوکەوتی تورکیا لەگەڵ ئەرمەنییەکان، یۆنانییەکان و کوردەکاندا. تورکیا پشت لە رووسیا دەکات و ڕوو لە ئینگلیز- ترسی تورکیا لە یۆنان و ئیتاڵیاو ئینگلیز- ئایا تورکیا چاوی تەماحی بڕیوەتە ئازەربایجان؟ کردەوەی ژیرانەی مستەفا کەمال پاشا - ڕێـژەی دانیشتوانی تورکیا - هێزی ئاسمانی تورکیا - نەوتی موسڵ - کوردەکان موسوڵمانن و ئاسیایی و ئێرانین - شانامە و کارتێکردنی لەسەر کوردەکان - ژیری و وڵات پارێزی و نیشتیمان پەروەری ڕەزا شای پەهلەوی).

قوربان. ئەمن چونکە ئاگادارم، کە بەڕێزتان تا چ ڕادەیەک سەرقاڵن، لەبەرئەوە تا ئەو جێگەیەی پێم بکرێت نامەوێ ببمە هۆی زەحمەت و چەرمەسەری بۆ جەنابتان، بەڵام هەندێ شت هەیە، کە ناچارم لە خزمەتتان ڕایبگەیەنم. لەوەی کە درێژی ڕاپۆرتەکەم دەبێتە هۆی سەر ئێشانی بەڕێزتان داوای لێبوردنتان لێ دەکەم.

لەبارەی ناردنی من وەک ڕاسپاردەیەک بۆ تورکیا و دامەزراندنی پێوەندی لە نێوان ئێران و تورکیادا چەند هەڵەیەک ڕووی داوە. مەبەستی دەوڵەت لە هەڵبژاردنی من بۆ ئەم کارە، بە بیروبۆچوونی خۆم ئەوە بوو، کە من بە زمانی چەور و نەرم و گەرم و گوڕ و دۆستانە، کارێک بکەم تورکەکان لە کەلی شەیتان دابەزن و ڕازییان بکەم گۆڕانکارییەک لە کردەوەکانیاندا بکەن. بەڵام کە چومە ئانکارا، هەر لە یەکەم وتووێژدا وا تێگەیشتم، کە ئەوان بەهەڵەدا چوون پێیان وایە، کە من نێردراوی رەسمی دەوڵەتم بۆ ئەوە هاتووم تا هەموو گیروگرفتەکان چارەسەر بکەم و هەرچی کۆسپ لەپەیوەندی نێوان هەردوو وڵاتدا هەیە لای ببەم. لە نامەیەکیشدا، کە بۆ منتان ناردبوو دوای ئیشارە و کێشەکان، بە کورتی ئەمرتان کردبوو، کە ئەبێ ئەم گێرە و کێشانە چارەسەر بکەی، بەڵام لەبارەی چارەسەرکردنیان بە وردی چۆنیەتی ئەرکەکەمان شی نەکردبۆوەو بە تایبەت نەتانفەرموو بوو، کە کێشەی کوردەکان دەبێ لە تاران قسەی لەسەر بکرێ. وەزیری دەرباریش لە نامەیەکی تایبەتدا بە پێچەوانەوە نووسیبووی، کە من دەبێ لە کێشەی کوردەکانیش بکۆڵمەوە، هەر بۆیە ئەمن دوو دڵ بووم لە بروسکەی یەکەمی خۆمدا داوام کردبوو کە ڕوونی بکەنەوە کە ئەرکی من چیە؟ ئەو کاتەیش کە لە پاریسدا بووم هەر ئەم دوو دڵییە لەگەڵمدا بوو، حەزم نەدەکرد پێش ئەوەی ئەرکەکانی من بە وردی دەستنیشان بکرێ بچم بۆ ئانکارا. بەڵام کە باسی ئۆلتمیاتۆم هاتە کایەوە، وام بە چاک زانی، کە زیاتر لەمە چاوەڕێ نەبم و هاتم بۆ ئێرە. ئەوەش بڵێم کە وەڵامی بروسکەکەم پاش بیست و دوو ڕۆژان گەیشتە دەستم هەر بۆیە لە یەکەم مانگی مانەوەم لە ئانکارا، بۆ خۆیشم نەمدەزانی، کە چی بکەم و چی بڵێم. لایەنی تورکیش منیان بە مەئموری رەسمی دەزانی و پێیان وابوو، کە هاتووم تا هەموو کێشەکان چارەسەر بکەم. بەختەوەرانە هاتنی من هاوکات بوو لەگەڵ بەڕێوەچوونی کۆنگرەی حزبی میللی و قسەکانی مستەفا کەمال پاشا، کە حەوت ڕۆژی خایاندوو هەڵبژاردنی سەرۆک کومار و.... هەر بۆیە بواری ئەوەیان نەبوو ئاوڕێک لە من بدەنەوە، لە لایەکی دیکەشەوە ئەوان چاوەڕوانی ئاکامی وتووێژەکان لەسەر کێشەی کورد بوون و دەبێ ئەوەش بڵێم، کە ئەم هەلەی تورکەکان بە قازانجی ئێمە بوو، کورتەی هەواڵکە بەم جۆرەیە:

لێرە، زیاد لەوەی کە ئێمە چاوەڕێمان دەکرد کێشەی کوردیان بەلاوە گرینگە. تورکەکان پێیان وایە کە بوون بە چەندین نەتەوە، وەکو یۆنانی و ئەرمەنی و سێرب و بۆلغار و عەرەب و. لە نیشتیمانەکەیاندا لە ڕابردوو گەورەترین هۆی چارە ڕەشی و ناکامی ئەوانە، لە ژیانی نوێیاندا ئەیانەوێ خۆیان لەم بەڵایە بپارێزن و چیدی ئەو شتانەی، کەهۆی دواکەوتوویی ئەوانە، لە وڵاتەکەیاندا بۆ ئەبەد

بنەبڕ بکەن. بولغار و سێرب و عەرەبیان، کە لە کیس چووە، بەڵام ئەوان ئەمە بە جۆرێ سەرکەوتن و ڕزگاری ناو ئەبەن بۆ خۆیان. ئەرمەنییەکانیان لە تورکیا لە ناوبرد و یۆنانییەکانیشیان بە زۆرەملی کۆچ پێکردن و وەدەریاننان. پاش ئەم کارانە، ئــەوان لایــان وابــوو، کە بە ئامانج گەیشتوون و ئیتر بێستانی تورکیا بێ ســەرەخــەر دەبێ بــەڵام لەناکاو، لە سێ ساڵی ڕابــردوودا لەگەڵ بزووتنەوەی کوردەکان و شێخ سەعیددا ڕووبەڕوو بوونەوە، ئەم بزووتنەوەیە ئەوەندە بەربڵاو گرینگ بوو، کە بوونی تورکیای خستە مەترسییەوە بە جۆرێک، کە ناچار بوون هەشتا هەزار عەسکەر بنێرن بۆ کوردستان و دەیان ملیۆنیان سەرفی ئەم کــارە کــرد، بــەڵام بەهۆی ئەو هەڵانەی کە کردیان کێشەکە دوایی نەهات. بۆخۆیشیان باش ئەزانن و ڕووداوەکانی دوو مانگ لەمەوپێش بوو بەگرێیەک لەسەر دڵی ئــەوان. لە هەموو ئەمانە خراپتر ئەوەیە، کە ئینگلیز دروشمی کوردستانی سەربەخۆی خستۆتە سەرزاری کوردەکان و بەم جۆرە دەوڵەتی تورکیایان نیگەران کردووە، ئەڵبەتە دەبــێ ئێمەش وەکــو ئــەوان نیگەران بین، بەڵام بەداخەوە تورکەکان لەم کێشەیەدا لەباتی ئەوەی ئێمەش لەم خەمەدا بەشەریکی خۆیان بزانن تەنیا خۆیان بە خاوەنی ماف ئەزانن و لەلایەکەوە وەکو ڕووسەکان یا وەک لاسایی کردنەوە، ئێران بەوە تاوانبار ئەکەن، کە سەر بە ئینگلیزە، لە لایەکی دیکەشەوە لە وتووێژەکانی تاراندا لەگەڵ مەمدوح شەوکەت بەگ، وای بۆ ئەچێ، کە ئێمە ئەمانەوێ دەوڵەتێکی کوردی دابمەزرێنین تا ببێتە کۆسپێک لە نێوان ئێمە و ئەواندا. ئەم شتە پێش ئەوەی جەنابتان لە برووسکەکەی خۆتاندا، دەستنیشانی بکەن ئەوان لێرە بە منیان ڕاگەیاندبوو. بە کورتی ئەبێ بڵێم تورکەکان لەسەر ئەو باوەڕەن، کە ئێران نیازی نییە لە دیاری کردنی سنورەکاندا، لەگەڵ ئەوان هاوکاری بکات و لەبەر ئەمە تۆمەتی پەیمان شکاندن ئەدەنە پاڵ ئێمە. لەکاتێکدا ئامانجی ئەوان لە ئیمزاکردنی ڕێکەوتننامە لەگەڵ ئێمە ئەوە بوو، کەبە هاوکاری هــەردوولا لەشەڕی کێشەی کورد ڕزگار ببن و بە بۆنەی کوردەوە ئەو هەموو هەوڵ و تەقەلایەی، کە بۆ دامەزراندنی تورکیای نوێ داویانە بە فیڕۆ ئەچێ. چونکە ئەوان ئەزانن، کە ناتوانن کوردەکان وەکو ئەرمەنییەکان بە کۆمەڵ بکوژن یان وەکو یۆنانییەکان ناچاریان بکەن لە تورکیا کۆچ بکەن، لەبەرئەوەی موسوڵمانە و ئاسیایی و لەگەڵ تورکەکان هاودینن و ئەندازەشیان ئەوەندە زۆرە، کە ڕێگایەک بۆ چارەسەر کردنی کێشەکەیان شک نابەن و لەبەرئەوەی ناچار نەبن تا ئەبەد لەشکرێکی گەورە بە خەرجییەکی زۆرەوە لەوێ دابنێن حەز دەکەن بە هاوکاری لەگەڵ ئێران، ڕێگایەکی باش بۆ ئەم کارە ببیننەوە. ئەو ئولتیماتۆمەش، کە داویان لەئێران هەر لە پەیوەندی لەگەڵ ئەم کێشەیەدا ئەوان مەبەست و ئاکامەکان باش دەبینن بەڵام شێوە و بۆچوونیان بۆ گەیشتن بەو مەبەستانە خراپە و هەڵەیە و ئەو ئاژاوانەش، کەلە ئێراندا دەینێنەوە ئیدامەی ئەو بۆچوونانەیە. ئەوەش بڵێم، کە مەئمورەکانی ئەوان ئەوەندەش ژیر و تێگەیشتوو نین و بەکردەوەی هەڵەی خۆیان، بەرد ئەخەنە سەر ڕێگای دەوڵەتەکەیان.

ئەمن کــە گەیشتمە ئــانــکــارا و پــاش وتووێژ لەگەڵ تۆفیق روشدی بەگ لەسەر چەند شتێک

پێکهاتین، بەڵام کاتێ بەوانم گووت، کە من بەرەسمی نەهاتووم بۆ ئێرە پێیان سەیر بوو. هەرچەندە لەپێشدا خۆم وام بەچاک ئەزانی، کە رەسمی نیم بەڵام ئێستا، کە بە وردی تێ ئەفکرم ئەگەر ئەوان بزانن رەسمی نیم و نامەوێ لەسەر کێشەی کورد هیچ گفتوگۆیەک بکەم ئەوان دڵیان کرمۆڵ ئەبێت و وای دا ئەنێن، کە ئێران حەزناکات کێشەی کورد چارەسەر بکرێ و بۆیە لە بروسکەیەکدا کە ناردبووم بۆ جەنابتان داوام کرد حوکمی رەسمیم پێ بدرێ تا لەسەر کێشەی کورد وتووێژبکەم. کێشەی کوردیش بە من چارەسەر ناکرێت بەڵام واباشترە من وتووێژە سەرەتاییەکان لەگەڵ ئەوان ئەنجام بدەم و دڵپاکی خۆمان بەوان نیشان بدەین تا دواتر، لەکات و ساتی تایبەتدا، هەردوولا مەسەلەکە بە وردی شیبکەینەوە و بەبێ ئەوەی پەلەی لێ بکرێ رێگایەکی باشتر بۆ ئەم کێشەیە بدۆزنەوە.

لەبارەی دانانی هێڵی سنورەکانەوە، پێم وانەبێ ئەوان چاوی تەماحیان بڕیبێتە خاکی ئێران و یان ئەوەی بیانەوێ گیروگرفتێک بۆ ئێمە دروست بکەن. زۆرتر پێم وایە نیازیان ئەوەیە هێڵە سنورییەکان، کە هاوبەشن کورت تر بکرێنەوە تا بتوانن لە داهاتوودا لە بەرانبەر هەر چەشنە مەترسییەک لەلایەن ئێران یان کوردەکانەوە، بتوانن باشتر پارێزگاری لە قسەکانیان بکەن.

هەر جۆرێ بێ من پێم وایە، کە بۆ دانانی هێڵی سنوری ئەبێ لەگەڵ تورکیا هاوکاری بکەین چونکە دەوڵەت نابێ نیگەرانی ئەوەبێ، کە ئەیانەوێ کورد لەناو ببەن، ئەوان چاوەڕێی ئەم کارە لە ئێمە ناکەن تەنانەت رەنگە لەسەر چەککردنی کوردەکانیش زۆر پێ دانەگرن چونکە دەزانن، کە ئەمە کارێکی ساکار نییەو بە ماوەیەکی کورت بەدی نایات. لەبنەڕەتدا ئەوان تەنیا خوازیاری ئەوەن، کە هەردوو دەوڵەت هاوکاری بکەن و ناکۆکی لە نێوانیاندا نەمێنێت تا دڵنیا بن، کە کوردەکانی ئێران نابنە هۆی گێچەڵ و سەر ئێشەی نوێ بۆ ئەوان، هەروەها ئەیانەوێ دڵنیا بین، کە کوردەکانی تورکیاش لە دوارۆژدا ئێران نەکەن بە حەشارگەی خۆیان و زەبر لە دەوڵەتی تورکیا بدەن.

کەوابوو هاوکاری ئێمە لەگەڵ ئەوان هیچ زیانێکی نییە. ئەگەر نیازی ئەوان هەر ئەمەبێت، کە ئیشارەم پێکرد ئەوا قازانجی ئێمەش لەوەدایە و ئەگەریش چاوەڕێی شتی نەگونجاو بکەین، ئەوا ناپاکی لەوانەوەیە و ئێمە دڵپاکی خۆمان نیشان داوە. هەرجۆرێ بێت دەوڵەتی تورکیا ناتوانێت ئەم ئەرکە بەئاسانی پشت گوێ بخات هەرچۆنێک بێت سنورەکانی خۆی ئەپارێزێت.

ئەوەش کە گوتم تورکیا چاوی تەماحی نەبڕیوەتە خاکی ئێران پێتان وانەبێ، کە ئەوەندە ساویلکە و دڵ سافم. ئەمن بە تەواوی دڵنیا نیم، کە ئەوان ئەو شتە لەمێشکیاندا نەبێت، لانی کەم بۆ وڵاتی ئازەربایجان، بەڵام ئەوەی راستی بێت ئەمەیە، کە ئەوان ئەمڕۆکە گیرۆدەی کێشە ناوخۆییەکانن لە لایەکەوە مەترسی یۆنان و ئینگلیز لەسەریانە و لەلایەکی دیکەشەوە وەزعی سیاسی و ئابووریيان ئەوەندە خراپە، کە مستەفا کەمال و هاوڕێکانی بەهۆی زۆری دروشمەوە دەرفەتی هەناسە هەڵکێشانیان نییە. مستەفا کەمال رێگەیەکی ژیرانەی گرتۆتە بەر بەوەی، کە بەرزە فڕی و

ئیدیعای پێشووی پان ئیسلامیست یان تورانیسمی وەلا ناوە و هەموو هەوڵ و تەقەلای جارێ بۆ ئەوەیە، کە بەردی بناغەی دەوڵەت و میللەتی تورک لەسەر شوێنێکی سەخت و ئەستەم دابنێ و لەم ڕوانگەوە ڕەنگە مەترسی بۆ ئێمە هەبێت. واتە ئەگەر ماوەی حکومەتەکەی درێژخایەن بێت و بتوانێت گیروگرفتەکانی تورکیا چارەسەر بکات، دواتر بۆخۆی یان جێنشینەکانی ڕەنگە بکەونە فکری ئەوە، کە دەست بکەن بە فرەوانخوازی و هێرش کردنە سەر خاکی وڵاتەکان. هەرچەندە ئەم خەونە تا بیست ساڵی دیکەش نایەیەتە دی و ئەگەر خودای نەخوازە ئەو ڕۆژە بێت ئێمە ناتوانین هیوامان بە ناوچە کوردنشینەکان بێت. ڕێژەی دانیشتوانی ئێستاکە ١٤ ملیۆنە و تا پازدە ساڵی دیکە دەبێتە بیست ملیۆن. ئەگەر ئەو کاتە تورکیا کێشەکانی ناوخۆی چارەسەر کردبێ و سیاسەتی دەرەوەیش ڕێگەی پێ بدات بە ئاسانی دەتوانێت لەشکرێکی دووسەد تا سێ سەد هەزار کەسی بەرەو ئێران ڕەوانە بکات و کورد و فارس و هەرچی بێتە سەر ڕێی ڕای بماڵێ. تەنانەت ئەو کوردانەش، کە ئەمڕۆکە ئێمە بە داردەستی خۆمان دایان دەنێین ڕەنگە بە ئاسانی فریوی ئەوان بخۆن و ببنە دار دەستی تورکەکان. بە بیر و باوەڕی من لە داهاتوودا ئێمە ئەبێت تەنیا هیوامان بەخۆمان بێ و بەجۆرێک، کە لە سیاسەتی ناوخۆدا جۆرێ ڕەفتار بکەین، کە ئیداراتی لەشکری و کیشوەری بە جۆرێ ڕەفتار بکەن، کە خەڵک دەوڵەمەند و دڵخۆش‌و ڕازی بن و دەوڵەتەکەی خۆیان خۆشبوێت و... ئەگەر مەترسییەکیش هاتە پێش، خەڵکی بە گشتی بۆ لابردنی ئەو مەترسییە بێنە مەیدان و ئامادەی فیداکاری بن.

لە سیاسەتی دەرەوەشماندا ئەبێت پەیوەندی دۆستانە لەگەڵ دەوڵەتەکان دابمەزرێنین بە چەشنێ، کە ئەگەر یەکێک لەوان لە داهاتوودا نیازی ناپاکی لەگەڵمان هەبوو باقی وڵاتەکان لایەنیی ئێمە بگرن، یان لانی کەم بەلەبەرچاو گرتنی ڕەقابەتی نێوان دەوڵەتەکان خۆیان، هەندێکیان بە ڕواڵەت یان بە دڵ یارمەتی ئێمە بدەن.

ئەمە دەربارەی کوردستانی سەربەخۆ، ئەمن پێم مەترسییە بەڕاستی لەسەر ئێمە هەیە و نابێ فریوی قسەی ئینگلیزەکان بخۆین، کە گوایە بە شێخ مەحمودیان گوتووە ئێمە ناتوانین کوردستانێکی سەربەخۆ قبوڵ بکەین. من لێرە لەگەڵ ئینگلیزەکاندا قسەم کردووە و زۆر شت تێگەیشتووم.

یەکەم: بەلەبەر چاوگرتنی ناوچە نەوتاوییەکانی کوردستان من پێم وا نییە کە ئینگلیزە ماڵ پەرست و دوور بینەکان، بێ دەنگ دابنیشن و لێ بگەڕێن تورکیا پاش چەند ساڵ بە خەیاڵی ئاسودەوە کێشەی موسڵ زیندوو بکاتەوە، بۆ بەرگری لەم کارە بە ناوی کوردستانی سەربەخۆ کوردەکان بۆ لای خۆیان ڕابکێشن. تەنانەت ئەگەر ئەم کارەش نەکات لەبەرئەوەی ئەم دروشمە کەوتۆتە سەر زاران و کوردەکانیش میللەتێکی تێگەیشتوون خۆیان بە دوای ئەم دروشمە دەکەون بە تایبەت کە کورد پەست ئەبێت بەوەی، کە ژێر دەستی عەرەب بێت. کەوابوو ئەبێ ئێمە لە فکری کوردستانی خۆماندا بین و ئەگەر توانیمان لەگەڵ تورکەکان ڕێکبکەوین

چ باشتر، بەو مەرجەی ئەم ڕێکەوتنە بە نیازی لەناوبردن و قڕکردنی کورد نەبێ چونکە ئاشکرایە، کە ئەمە خەیاڵێکی خاوە بەڵکو ئێمە ئەبێ بە جوانی لەگەڵ کوردان هەڵسوکەوت بکەین و کارێک بکەین ئەوان قازانجی دەوڵەتی ئێران لەبەرچاو بگرن، بۆ ئەم کارەش دەبێت بە شێوەی پەروەردەکردنی ئێرانی ڕایان بهێنین و ئەم کارە زیاتر بۆ ئێمە ئاسانترە وەک لە تورکیا. چونکە کوردەکان لەباری زمان و ڕەگەزەوە ئێرانین و ئێستاکە کەسانێک هەن، کە بۆ زیندوو کردنەوەی غیرەتی میللی لەواندا، دەستەودامێنی شاهنامە و حیکایەتی جەمشید و فەرەیدوون و...هتد بوون. ئەگەر مەئمورەکانی دەوڵەتی ئێران ژیر و کەم تەماح بن و زوڵم و زۆر لەسەر کوردەکان لابەرن و بە جوانی تەکبیری ئەم کارە بکەن لانی کەم ئەو قازانجەی هەیە، کە لە نێوان کورد و فارسدا دوژمنی و کینە نامێنێ و تەنانەت ئەگەر ڕۆژێکیش خەونی کوردستانی سەربەخۆ پەرە بسێنێ ئەتوانم بە دڵنیاییەوە بڵێم، کە کوردەکانی ئێران نابنە هۆی کێشە و زەحمەت بۆ ئێران و ڕەنگە لایەنی ئێرانی بوونیان بەسەر لایەنی کوردبوونیاندا زاڵ ببێ و نەک تەنیا زیانێکیان بۆ ئێمە نەبێت بەڵکو قازانجیشمان پێ بگەیەنن. بەڵام ئەگەر مەئمورەکانی ئێران بەشێوەی ڕابردوو لەگەڵ کورددا بجوڵێنەوە و کەمتەرخەمی بنوێنن سەبارەت بەوان ئەوا پێم وایە، کە مەترسی نزیکە. ئەوەش بڵێم، کە تورکەکان ئەڵێن ئینگلیزەکان لە نێوان کورد و ئەرمەنی و ئاسوریدا پەیوەندییەکی پتەویان دامەزراندووە و نیازیان وایە لەبەهاری داهاتوودا لە کوردستانی ئێران ئاژاوە ساز بکەن، هەرچەندە، کە ئەم قسە ڕەنگە ڕاست بێ و یان پڕوپاگەندەی تورکەکان بێ بۆ ئەوەی ئێمەی پێ بترسێنن، بەڵام لەهەر حاڵدا نابێ ئێمە غافڵ بین.

گۆڤاری یغمار– ژمارەی سرِی ۱۲٤/ساڵی یازدەهەم ژمارەی هەشتەمی /ڕەزبەری ۱۳۳۷ لاپەڕەی ۳٤٥– ۳٥۱ مدیر :حبیب یغمایی

*محمد علی فروغی لە ساڵی ۱۳۲۱ لە ڕۆژی نۆی مانگی سەرماوەزدا کۆچی دوایی کردووە، ئەوەی شیاوی باسە ئەوەیە ئەگەرچی ناتوانین بڵێین فروغی هەموو پێشبینییەکانی دروستە، بەڵام لە دەقی نامەکەدا دەر دەکەوێ، کە پیاوێکی نیشتیمان پەروەر و زانا بووە و سیاسەتمەدارێکی ژیر و تێگەیشتوو بووەو ڕاستییەکانی بێ ترس درکاندووە، ئەگەرچی سیاسەتمەدارانی ئەوڕۆکە، تەنیا شتێک ناویان نەبیستووە ڕاستی و تێگەیشتووییە. بەداخەوە.

تێبینی: هەندێک لە بەشەکانی نامەی فروغی پەیوەندی بە کوردەوە نەبوو، بۆیە تەنیا ئەو شوێنانەی کە پێوەندی بە کێشەی کوردەوە هەیە وەرمگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی.

لە ۲۷/پوشپەڕی /۱۳۸۰ هەتاوی دا وەرمگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی
سەقز– ڕۆژی سێ شەممە

# جەلادە دڵسۆزەکە... ئەشکەنجەدان لە ماوەی دادگاکانی پشکنیندا

لە عەرەبییەوە: فرمێسک



جویل هارینگتۆن

ئەوروپا هەرگیز لەوە ڕانەوەستاوە. تەماشای ڕابردووی دوور و نزیکی خۆی بکات. "جویل هارینگتۆن" مێژوونووس و مامۆستا لە زانکۆی (ڤاندیربیلت) لە بەرهەمێکی تازەیدا دەگەڕێتەوە بۆ هەڵدانەوەی چەند لاپەڕەیەک لە کۆتاییەکانی سەدەی شانزەهەم و سەرەتاکانی سەدەی حەڤدەهەم. (فرانز شمیت) بابەتی سەرەکی دوا کتێبی ئەم نووسەرەیە و کتێبەکە ئەم ناونیشانەی لەخۆگرتووە: (جەلادە دڵسۆزەکە).

بەڵام فرانز شمیت کێیە؟

فرانز شمیت: پیشە جەلاد، لەنێوان ساڵانی ١٥٧٣ — ١٦١٧، وەک ئەوەی دانەری کتێبەکە باسیدەکات. بەم مانایە فرانز شمیت سەر بە مێژووی ئەشکەنجەدانە کە ئەوروپا لە میانەی دادگاکانی پشکنین و بە درێژایی دوو سەدە بەخۆیەوە بینی. فرانز شمیت لە شاری نۆریمبێرگی ئەڵمانیا، ماوەی ٤٥ ساڵی تەمەنی لە جێبەجێکردنی پیشەی (جەلادە دڵسۆزەکە) بردووەتەسەر. بەڵام ئەو تەنها بکوژێک و جەلادێک نەبووە، بەڵکو لە پیشەکەیدا زۆر کارامە و دەستڕەنگین بووە و هەمیشە ئامادەبووە بۆ جێبەجێکردنی هەر ئەرک و فرمانێک کە پێیسپێردراوە. لێرەوە و لەو ماوەیەی مێژووی ئەوروپادا، تێگەشتن لە چەمکی (سزای جەستەی)، چ لای دەسەڵاتداران بە شێوەیەکی گشتی و چ لای دادگاکان بە شێوەیەکی تایبەتی، هەمان تێگەشتن بووە.

دانەری کتێبەکە باس لەوە دەکات شمیت نەیویستووە و چاوەڕێی ئەوە نەبووە ببێت بە پیاوکوژ، بگرە ئەو لە شاری نۆریمبێرگ و دەوروبەری بە هەزاران نەخۆشی چاککردووەتەوە. لێرەدا دانەر سەرنجی خوێنەر بۆ ئەوە ڕادەکێشێت کە بەشی هەرە زۆری جەلادەکانی ئەو سەردەمە، لە بنەڕەتدا پزیشک بوون و شارەزاییەکی زۆر باشیان لە توێکاری جەستەی مرۆڤەکاندا هەبووە.

جویل هارینگتۆن لە بەشێکی دیکەی کتێبەکەیدا بەردەوام دەبێت و دەڵێ: شمیت لە ماوەی کارکردنیدا ٣٩٤ کەسی لە پیاو و ژن و منداڵ، لە هەردوو ڕەگەزەکە، لەسێدارە داوە. ئەمە جگە لە پرۆسەی کوشتنەکانی دیکە کە ئەنجامیداون. هەمو جۆرە پرۆسەیەکی سزادان و شێواندنی جۆراوجۆری ئەنجمداوە. وەک ئوتوکردن بە پارچە ئاسنێکی گەرمی سورهەڵگەڕاو، بڕینی ئەندامەکانی جەستەی زۆر کەس و کردنیان بە کەمئەندام. ئەو هەمیشە ئامادەبووە بۆ جێبەجێکردنی بڕیاری مردن و بەکارهێنانی هەمو جۆرە ئامێرێکی کوشتن: لە هەڵواسینەوە بۆ سوتاندن یان خنکاندن لە ئاودا یان هەر ئامێرێکی دیکە کە لەو سەردەمەدا ناسراوبووە. ئەو وەک دانەری کتێبەکە وەسفیدەکات شایەنی ئەوەیە پێیبوترێت: (کۆ کوژ - القاتل بالجملە).

دانەر لە بەشێکی دیکەی کتێبەکەدا ئەوە

ڕووندەکاتەوە کە شمیتی جەلاد، لەژێر فرمانی دەسەڵاتدارانی شاری نۆریمبێرگدا کاری کردووە و بێ هیچ گفتوگۆیەک، یان تەنانەت بێ ئەوەی بیر لەوە بکاتەوە گفتوگۆیان لەگەڵدا بکات، ملکەچی بڕیار و فرمانەکانیان بووە. لێرەدا دانەر باس لەوە دەکات سیستمی دادوەری لە سەرەتاکانی سەدەی حەڤدەهەمدا و لە تەواوی وڵاتانی ئەوروپادا، سیتمێکی زۆر توند بووە. پاشخانی ئەو توندبوونەی سیستمی دادوەری، بریتی بووە لە جەختکردن لەسەر ئەوەی نابێت ئەو مەسەلانەی کە پەیوەستن بە (بەهای ڕەمزی) سزادانەوە، هیچ سازشێکیان تێدا بکرێت. لێرەوە دانەری کتێبەکە شمیت بە پیاوێکی شەریف ناودەبات کە کارێک جێبەجێ دەکات نەفرەت بۆ خاوەنەکەی دێنێت. هەروەها دانەر ئاماژە بەوە دەکات ئەوانەی وەک شمیت، کاری جێبەجێکردنی سزای جەستەییان ئەنجامداوە، ئەم کارەیان وەک چاکسازییەکی کۆمەڵایەتی پێویست لێکداتەوە. دانەر لەم سیاقەدا گفتوگۆ لەسەر چەمکی سزا لەو سەردەمەدا و لە پێشکەوتنی سیستمی دادوەری ئەوروپیدا دەکات. دانەر لێرەدا سەرنجی خوێنەر بۆ ئەوە ڕادەکێشێت کە سزادانی جەستەیی، بە مانای تەواوی وشەکە، لەو سەردەمەدا تایبڵێی باو و بەربڵاوبووە. لەو سەردەمەدا هەرکەسێ بڕیاری مردنی بۆ دەرکرایە، بە دوو شێوە ئەو بڕیارە جێبەجێ دەکرا: یەکەمیان سەر پەڕاندن بە شمشێر، ئەم سزایە زیاتر سزایەکی خانەدانانە بوو. دووەمیان لەسێدارەدان بە هەڵواسین، ئەم سزایە زیاتر سزایەک بوو سوکایەتی و شەرمەزاری بۆ سزادراوەکەی لەخۆگرتبوو. لە کۆتاییەکانی سەدەی شانزەهەم و سەرەتاکانی سەدەی حەڤدەهەمدا، پەنا بردن بۆ زیندانیکردن وەک جۆرێک لە سزا، بۆ ئەو کەسانەی تاوانی جۆراو جۆریان ئەنجامدەدا، بوونی نەبوو. واتە کەس لەسەر ئەنجامدانی تاوان زیندانی نەدەکرا، بەڵکو بەیەکێک لەو دوو شێوەیەی سەرەوە سزادەدرا.

دانەری کتێبەکە لە چەند دێڕێکدا

جویل هارینگتۆن مێژونووسێکی پسپۆڕە لە مێژووی ئەڵمانیا لە نێوان هەردوو سەدەی شانزەهەم و حەڤدەهەم. لە زانکۆی ڤاندیربیلت مامۆستای مێژووە. پێشتر کارێکی لەسەر (هەتیوەکان و گەنجە لادەرەکان) و توێژینەوەیەکی لەسەر (هاوسەرگیری لە سەردەمی ڕیفۆرمدا) ئەنجامداوە.

ناوی کتێب: جەلادە دڵسۆزەکە

نووسنی: جویل هارینگتۆن

لە بڵاوکراوەکانی: بۆدلی هید، لەندەن، ٢٠١٣

ژمارەی لاپەڕەکانی کتێبەکە: ٢٨٥ لاپەڕەی مامناوەند

سەرچاوە:

بیان الکتب، ٢٠١٣/١١/٨

# بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

ئامادەکردنی: باوکی ڕەهەند

لەماوەی سێ مانگی ڕابـردودا، دەزگـای سەردەم کۆمەڵێ کتێبی جۆراوجۆری بە شێوە و تیراژ و قەبارەی جیاواز جیاوازەوە چاپ و بڵاوکردۆتەوە. لێرەدا هەندێ لەو کتێبانە بەسەر دەکەینەوە و هەوڵدەدەین بە شێوەیەکی کورت و پوخت، بابەت و ناوەڕۆکی ئەو کتێبانە بخەینەڕوو، ئێمە بەم کارە دەمانەوێ ناساندنی کتێبەکان لای خوێنەر ئاسانترین و خوێنەر پێش کڕینی کتیبەکان، بیرۆکەیەکی لەسەر کتێبەکان هەبێت و بزانێت کتێبەکان باس لە چ بابەت و بوارێکی ڕۆشنبیری دەکەن.

## نەفرەت لە دۆستۆیڤسکی




گەر خاڵی سەرەکی لە نووسینی ڕۆماندا، بریتیبێت لە بوونی خەیاڵێکی پان و فراوان و تێکەڵکردنی ئەم خەیاڵە پان و فراوانە بە ڕووداوەکانی واقع، ئەوا ئێمە لە ڕۆمانی نەفرەت لە دۆستۆیڤسکی دا، لەبەردەم ڕۆمانێکی تەواوداین. ڕۆمانێک پشت ئەستورە بە تێکەڵکردنێکی شارەزایانەی نێوان خەیاڵ و واقع، ئەندێشە و ڕوداوی ڕۆژانە. بە بڕوای من ڕۆمان گەر سەرتاپای لەسەر خەیاڵ بنیاتنرابێت و هیچ پەیوەندییەکی بە ژیانی واقیعەوە نەبێت، یان گەر بە پێچەوانەوە تەواوی ڕۆمانەکە باس لە ژیانی واقع بکات و هیچ هێڵێکی خەیاڵی تێدانەبێت، ئەوا دوور نییە ئەو جۆرە ڕۆمانە کارێکی پوخت دەرنەچێت و دووربێت لە هونەری نووسنی ڕۆمانەوە.

ڕۆمانی نەفرەت لە دۆستۆیڤسکی گەرچی لەژێر کاریگەری ڕۆمانی تاوان و سزای دۆستۆیڤسکی-دا نوسراوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئاقارێکی جیاوازتری هەیە. خاڵی جیاکردنەوەی ئەم دوو ڕۆمانە، جگە لەوەی لە دوو کلتور و زەمەنی جیاوازدا نووسراون و باس لە دوو پانتایی جوگرافی جیاواز دەکەن، لەوێوە دەستپێدەکات کە کارەکتەری ڕەسوڵ لە ڕۆمانەکەی عەتیق ڕەحیمی-دا، دوای کوشتنی پیرێژنەکە، دەیەوێ خۆی ڕادەستی دادگا بکات و دادگایی بکرێت. ئەم خۆڕادەستکردنەی بۆ دادگا، لە ئەنجامی پەشیمانبوونەوە لە کردەی کوشتنەکەی نییە، واتە ویژدانی ئازاری نادات بەوەی کەسێکی کوشتووە و پێویستە سزای خۆی وەربگرێت، تا ئەوەی ئەم کارەکتەرە دوای کوشتنەکە بیری لێدەکاتەوە، ئەوەیە دەیەوێ لە ڕێگەی خۆبەدەستەوەدانی بۆ دادگا و دواتر دادگایی کردنی، سەروەرییەک بۆ یاسا بگەڕێنێتەوە، لەکوێشدا؟ لەوڵاتێکدا بەدەست بێ یاسایی و ئاژاوەگێڕییەوە گرفتار بووە. واتە ئەم کەسێک دەکوژێت تاکو دواتر لەسەر ئەو کوشتنە دادگایی بکرێت. بە مانایەکی تر ئەم کارەکتەرە بۆیە بە پێی خۆی دەچێتە بەردەم دادگا، تاکو دادگاکان و دادوەرەکان لەو ئەرکە گرنگ و بایەخدارەی خۆیان تێبگەن و سنورێک بۆ ئەو فەوزای بێ دادگاییە دابنێن کە وڵات گیرۆدەی بووە. وەلێ ئەم بیرکردنەوە جوانەی ڕەسوڵ، هیچ کاردانەوەیەک و هیچ شتێک لەو بارودۆخە خراپ و بێ یاساییە ناگۆڕێت کە لەو وڵاتە بەرقەرارە و دەسەڵاتدارانی وڵات ئەوەی بیری لێناکەنەوە و خەمی لێناخۆن، سەروەری یاسایە.

بڕیاری ڕەسوڵ بۆ سەروەرکردنی یاسا، وەک پووش لە کا بژاردن وایە.
لێرەوە کوشتنی پیرێژنەکە، ئەگەر لە چرکەساتی یەکەمی کوشتنەکەدا، بۆ بردنی پارەوپول و زێڕ و زیوەکە بووبێت. هەروەها بۆ ڕزگارکردنی کچەکان بووبێت لەدەست پیرێژنەکە کە دەیکردن بە سۆزانی و کاری لەشفرۆشی پێ ئەنجامدەدان. ئەوا ڕاستەوخۆ دوای تەواوبوونی کردەی کوشتنەکە، تەواوی مەبەست و ئامانجی کوشتنەکە دەگۆڕێت و مەبەست و ئامانجێکی دیکە وەردەگرێت. کە ئەویش خۆبەدەستەوەدانی کارەکتەرەکەیە بۆ دادگا. ئالێرەوە خاڵی جیاوازی نێوان ڕۆمانی نەفرەت لە دۆستۆیفسکی و تاوان و سزا دەستپێدەکات.
یەکێک لە سیما جوانەکانی ئەم ڕۆمانە، وەرگێڕانە کوردییەکەیەتی کە بە کوردییەکی پوخت و جوانی بێ گرێوگۆڵ کراوە بە کوردی. بە مانایەکی دیکە حەزی خوێندنەوە و تەواوکردنی ڕۆمانەکە، لە بەشێکیدا بۆ وەرگێڕانە جوانەکەی بەڕێز کاک ئازاد بەرزنجی دەگەڕێتەوە. کەم نین ئەو ڕۆمانانەی کاری وەرگێڕانیان بۆ کراوە، دوای خوێندنەوەی تەنها دە بۆ بیست لاپەڕەیەکی، ئیدی لەبەر خراپی وەرگێڕانەکە، بێزاردەبیت و تاقەتی بەردەوامبوونت نامێنێت. خۆشبەختانە ئەم ڕۆمانەی عەتیق ڕەحیمی وا نییە و بەئاسانی خۆی دەخاتە بەردەستی خوێنەر و خوێنەر لە خوێندنەوەی بێزار و بێتاقەت نابێت. بگرە وەرگێڕانەکە وایکردووە تا کۆتایی ڕۆمانەکە بەردەوامبیت لە خوێندنەوەی. ژمارەی لاپەڕەکانی ئەم ڕۆمانە ٢٩٩ لاپەڕەی بچووکە، تیراژی ١٠٠٠ هەزار دانەیەو نرخی ٤٥٠٠ دینارە.

## دوو ژن و دوو پیاو




ئەم کتێبە بریتییە لە ناساندنی چوار شاعیری گەورەی جیهانی کە سەر بە ڕەگەز و کولتووری جیاوازن و بریتین لە (ئانا ئاخماتۆڤا، کلایس ئاندرسن، جوویل، یانیس ئیوفانتس). ئاگاداربوون لە ژیان و بەسەرهاتی ئەم شاعیرانە و خوێندنەوەی بەشێک لە شیعرەکانیان، ئامانجی سەرەکی ئەم کتێبەیە. لە ڕاستیدا دەتوانین بڵێین ئەم کتێبە، کتێبی پشووە، کتێبی دوورکەوتنەوەیە لە دەنگەدەنگ و ژاوەژاوەکانی ژیان. کتێبێکە لە کاتی خوێندنەوەیدا هێمنی و ئاسودەیی ڕۆحیمان

پێدەبەخشێت و لەو دونیا جەنجاڵەی تێیدا دەژین دوورماندەخاتەوە. دوو ژن و دوو پیاو کتێبێکە کە دەستتدایە تا تەواوی نەکەیت وازی لێنایەنیت. چونکە وەک وتم ئارامیەکی رۆحی و چێژێکی زۆرت پێدەبەخشێت، دەکرێ ئەم کتێبە لە تەنها دانیشتنێکدا بخوێنرێتەوە و وەک کتێبەکانی دیکە نییە کە بە چەند دانیشتنێک تەواودەبن. بە مانایەکی دیکە لە ئێوارەیەکدا تا درەنگانێکی شەو، دەگەیتە کۆتایی خوێندنەوە و هەست دەکەی لەو ماوەیەدا لەنێو جیهانێکی ئارام و بێ دەنگی لاپەڕەکاندا ژیاویت، جیهانێک پڕە لە ژیان و جوانی و چێژی شیعری، جیهانێک جیاواز لەو جیهانە جەنجاڵەی دەوروبەرت. جگە لەوە ئەم کتێبە دەکرێ هەر جارێ هەست بە بێزاری و ناڕەحەتی بکەیت، هەست بکەیت پێویستیت بەوەیە تۆزقاڵێک هێوربییتەوە و لە دەنگوباس و هەواڵە ناخۆش و دڵتەزێنەکان دوورکەویتەوە، دەستی بدەیتێ و بڕۆیتە نێو بەسەرهاتی ئەو چوار شاعیرە و شیعرەکانیان، لەوێشەوە کاتێکی نەشئەبەخش و پڕ لە جوانی بەسەربەریت.

بێگومان ئەوەی وایکردووە ئەم کتێبە ئەو ئارامییە ڕۆحییە بە خوێنەربدات، جگە لە بابەتی کتێبەکە، وەرگێڕانە جوان و سەرکەوتووەکەیەتی کە لەلایەن چیرۆکنووس کاک شێرزاد حەسەن ـەوە ئەنجامدراوە. واتە وەرگێڕانی سەرکەوتووانەی شیعرەکان، خاڵێکی گەشی کتێبەکەیە. ژمارەی لاپەڕەکانی ئەم کتێبە ١٧٣ لاپەڕەی بچووکە، تیراژەکەی ٦٥٠ دانەیەو نرخی ٣٠٠٠ هەزار دینارە.

## دیالۆگ لە نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا




ئەم کتێبە بریتییە لە ١٤ چاوپێکەوتن کە لەگەڵ کۆمەڵێ فەیلەسوف و بیرمەند و ڕۆماننوس و شانۆکار و دەرهێنەری سینەمایی و توێژەری کۆمەڵایەتیدا سازکراوە. ئەم فرەیییە لە بوارەکانی فەلسەفە و ڕۆمان و شانۆو سینەمادا، وایکردووە بەهای کتێبەکە بەرزتربێت و زانیارییەکانی نێو دوو توێی لاپەڕەکانی بایەخدارتر و گشتگیرتربێت. چاوپێکەوتنەکان هەر یەکەیان باس لە کێشە و گرفتێکی دیاریکاروی ئەمڕۆی جیهان دەکات. لە سیاسەتەوە بۆ ئابوری و لەوێشەوە بۆ ئەدەب و

جیهانگیری و ڕۆڵی ئەمریکا لە جیهانی تازەدا و چەندین پرسی دیکە. لە ڕێگەی خوێندنەوەی ئەم کتێبەوە، هەستدەکەی تاڕادەیەکی باش ئاشنادەبیت بە دیدگا و تێڕوانینی ئەوانەی چاوپێکەوتنەکەیان لەگەڵدا کراوە. ئەمە وا دەکات ئەو کەسانە باشتر بناسیت و دواتر هەوڵی بەدەستهێنانی نووسین و بەرهەمەکانیان بدەیت. ئاشکرایە هەندێجار خوێنەر لە ڕێگەی خوێندنەوەی چاوپێکەوتنێک لەگەڵ نووسەرێکدا، حەز دەکات بەرهەمەکانی ئەو نووسەرە پەیدا بکات و بیانخوێنێتەوە و لە نزیکەوە بیناسێت. گومانی تێدانییە زۆرجار بۆ ناسین و ئاشنابوون بە ئەهلی کتێب و نووسەران و ئەدیبان و فەیلەسوفان، تەنها بەرهەمەکانیان وەک کتێب و وەک تێکست بەس نییە، بەڵکو لەوانە گرنگتر چاوپێکەوتنەکانیانە، چونکە لە چاوپێکەوتنەکاندا بە شێوەیەکی باشتر و ڕاستەوخۆتر ئاستی ڕۆشنبیری و دیدگای ئەو نووسەر و ئەدیب و فەیلەسوفانە دەردەکەوێت.

ئـەم کتێبە لـەلایـەن کـاک ئـەردەڵان عەبدوڵڵاوە بە کوردییەکی جـوان پوخت کـراوە بە کـوردی، خـوێـنـەر لـە کـاتـی خـوێـنـدنـەوەیـدا هـەسـت بە ناڕەحەتی و تێنەگەیشتن ناکات، گەرچی هەندێ لە چاوپێکەوتنەکان باس لە بابەتگەلی فەلسەفی دەکەن، بەڵام وەرگێڕ سەرکەوتوانە توانیویەتی بە جۆرێک دایانڕێژێت و بیانکات بە کـوردی کە بە ئاسانی لێیان تێبگەیت. ئەمەش خاڵێکی جوانی ئەم کتێبەیە. ژمارەی لاپەڕەکانی ئەم کتێبە ١٧٨ لاپەڕەی بچووکە، تیراژەکەی ٥٠٠ دانەیە و نرخی ٣٠٠٠ هەزار دینارە.

## زۆر نیگەرانین..
## ئێوە لەیلاتان نەدیوە؟!




ئـەوە ناونیشانی ڕۆمانێکی شاعیر و وەرگێڕ و ڕۆماننوسی ئێرانی ڕەسوڵ یۆنان-ە. ئەم ڕۆمانە باس لە ژیانی کچێکی گوندی دەکات. کچێک بەیانییەک لە خەو هەڵدەسێ و خەوێکی سەیری بە گوڵی سورەوە بینیوە. ئەم خەوە سەرتاپای ژیانی خۆی و گوندەکەیان دەگۆڕێت. ئەو گوندە تەریک و لاچەپ و بێ کێشەیە کە سەدان ساڵە لەنێو سروشتێکی ڕەنگیندا، ڕۆژ بەڕێدەکات و شەو دەگوزەرێنێ، بێ ئەوەی تۆزقاڵێک ئاژاوەی بەخۆیەوەبینیبێت و بوبێتە جێگای ڕوداوی ناخۆش. وەلێ ئەو بەیانییە

که لەیلا له خەو هەڵدەسێ، هەستدەکات شتێک لەم گوندەدا ڕوودەدات، ڕوداوێک بەڕێوەیە و ژیانی سادە و بەرائەتی هەم خۆی و هەم گوندەکە دەگۆڕێ. بەڵام له هەمان کاتیشدا نازانێ ئەو شتە چییە و چۆن و دێت و چی بەسەر خۆی و گوندەکەدا دەهێنێت.
ئێوارەی هەمان ڕۆژ، له پشت ماڵەکەیانەوە و لەسەر ڕێگای کانی، کاتێ لەیلا له ئاوهێنان دەگەڕێتەوە، شۆفێری گەلابەیەک دەبینێ بەدیار تێکچوونی ئۆتۆمۆبێلەکەیەوە ڕاوەستاوە و گەلێک ماندوو دیارە و کابرا تابڵێی تینوویەتی. کاتێ لەیلا بە گۆزەکەی سەرشانییەوە دەبینێ، داوای قومێک ئاوی لێدەکات، ئەم داواکردنە و ئەو دەنگە گڕەی کابرا، بەس بوون بۆ ئەوەی تەواوی ژیانی ئەم کچە گوندییە بگۆڕێت و وایلێبکات شەیدای ئەو شۆفێرە نەناسە ببێت که تەنها دەزانێ ناوی ئیبراهیم-ە و هیچیتر. له هەمان کاتیشدا کابرای شۆفێر تا دواسنور سەرسامە بە جوانی ئەم کچە و سادە و ساکار و خاکییە.
ئیدی لەم ڕووداوەوە که بە هۆی پەککەوتنی ئۆتۆمۆبێلێکەوەیە، چیرۆکی عەشقی ئەو دوو بوونەوەرە دەستپێدەکات، بێگومان چیرۆکێکی نهێنی و شاردراوە، چیرۆکێک نابێت لە خۆیان زیاتر هیچ بوونەوەرێکی دیکە پێیبزانێت. چونکە هەمو ئاشکرابوونێکی سەرەتا بە مەرگی کچەکە و پاشان بە کوشتنی پیاوەکە کۆتایی دێت. بەڵام ڕەوتی ڕووداوەکان و پەرۆشی و حەزی ئەو دوو مرۆڤە بۆ یەکتر، وادەکان ئەم چیرۆکە تاسەر بە نهێنی نەمێنێتەوە و بکەوێتە بەر ڕۆشنایی. ئەویش ئەو کاتەیە که باوک و دایکی لەیلا دەیانەوێ کچەکەیان بە زۆر بدەن بە کەسێکی دیکە. ئەم هەواڵە لەیلا ناچار دەکات له ماڵ ڕابکات و گوند و داپیرە و باوک و دایک جێبێڵێت و بکەوێتە دوای دڵدارەکەی.
لەنێوان ڕاکردنی لەیلا و دۆزینەوەیدا، چەندین ڕوداوی سەیر و خەفەتهێن ڕوودەدەن که تەنها بە خوێندنەوەی کتێبەکە دەتوانی لێیان تێبگەیت. ئەم ڕۆمانە بە زمانێکی سادە و ساکار نوسراوە و بە ئاسانی دەخوێنرێتەوە و خوێندنەوەی دووچاری هیچ جۆرە ناڕەحەتییەکت ناکات، کاک جەبار سابیر سەرکەوتوانە کاری وەرگێڕانەکەی ئەنجامداوە. بگرە خوێنەر دەتوانێ له یەک دانیشتندا تەواوی بکات و لەزەتێکی زۆر لەو ڕوداوانە وەربگرێت که له ئەنجامی پەککەوتنی ئۆتۆمۆبێلێکەوە ڕوودەدەن. پەککەتنی ئەم ئۆتۆمۆبێلە ژیانی گوندێک دەهەژێنێت و دانیشتوانەکەی دووچاری شۆک دەکات.
کتێبەکە له ٢٠٤ لاپەڕەی بچووک پێکهاتووە، تیراژەکەی ٦٠٠ دانەیە و نرخی ٣٠٠٠ هەزار دینارە.

## دەربارەی جوولانەوەی کورد له بەلگەنامەکانی فەرەنسادا

ئەم کتێبە بریتییە له



٧٧ بەڵگەنامەی باڵیۆزخانەی فەرەنسا لە سوریا، دەربارەی بارودۆخی هەردوو ناوچەی کوردستانی باکور و خۆرئاوا. بەڵگەنامەکان لە مانگەکانی تشرینی یەکەم و تشرینی دووەم و کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٢٦ نووسراون. واتە مانگەکانی دە و یانزە و دوانزە و ئەو ڕووداوانە بەسەر دەکەنەوە کە لەو سەردەمەدا و لەناوچە کوردنشینەکانی نێوان تورکیا و سوریا ڕویداوە. خاڵی سەرەکی لەو بەڵگەنامانەدا ئەمەیە: زلهێزێکی وەک فەرەنسا لەو سەردەمەدا، بە تەواوی ئاگاداری هەمو ئەو پەلامار و ڕاوەدونان و دەرکردنانە بووە کە دووچاری ناوچە کوردنشینەکان و دانیشتوانەکەی هاتووە. ئەوا ئاگاداربوون کە کوردان چۆن و بە چ شێوەیەکی نامرۆڤانە لەسەر دەستی حکومەتی ئەوکاتی تورکیا دەچەوسێنرانەوە و چۆن بە زۆری لە زێدی باو و باپیریان دوورخراونەتەوە. بەڵام هیچ هەڵوێستێکیان نەبووە و بۆ ڕێگرتن و دانانی سنورێک لەبەرامبەر ئەو هەمو ناحەقییەی بە کورد کراوە، هیچ کارێکیان نەکردووە.

بەڵگەنامەکان گەوایهدەرێکی ڕوون و ئاشکران لەسەر ئـەوەی هەمیشە زلهێزەکان، بەجۆرێک لە جۆرەکان، بەشداربوون لەو نەهامەتییەی بە درێژایی سەدەی بیستەم، بەسەر کوردا هاتووە. لانی کەم بێدەنگبوونی ئەو زلهێزانە، وەک جۆرێک لە ڕازیبووون وا بووە دەرهەق بەو نەهامەتیانەی کە لەلایەن دەوڵەتانی تورکیا و سوریا و عێراق و ئێرانەوە کراونەتە سەر کوردستان و دانیشتوانەکەی. هەمیشە بێدەنگی وڵاتانی زلهێز، هاندەرێکی باش بووە بۆ نەیارانی کورد کە بۆ سەرکوتکردنی کورد و ڕاپەڕین و شۆڕشەکانی دەستکراوەبن. ئەم کتێبە سودێکی زۆری بۆ ئەو توێژەرانە هەیە کە بە دوای بارودۆخی کوردستانی ساڵانی دوای کۆتایی هاتنی جەنگی یەکەمی جیهانییەوەن. کتێبەکە لەلایەن بەڕێزان حەسەن حسێن و سەلام عەبدولکەریم ەوە، بە جوانی و سەرکەوتوانە کراوە بە کوردی.

ژمـارەی لاپـەڕەکـانـی ئـەم کتێبە ٣٠٧ لاپـەڕەی مامناوەندیە، تیراژی ٦٠٠ دانەیەو نرخی٤٥٠٠ دینارە

## ڕاڤەی نوێ لەسەر فەیلەسووفانی سیاسی مۆدرێن




لە ماکیاڤێلییەوە تا مارکس

ئەم کتێبە باس لە کۆمەڵێ ڕاڤە و لێکدانەوەی جیاواز دەکات، دەربارەی کار و بەرهەمی هەندێ لەو فەیلەسوفانەی جیهانیان بەخۆیان و تێزەکانیانەوە سەرقاڵ کردووە. لەوانە ماکیاڤێلی، مارکس، هۆبز،

جۆن لۆک، هیوم، جان جاک ڕۆسۆ، کانت، هیگڵ و چەندین ناوی پرشنگدار و درەوشـاوەی دیکە. ڕاڤە و لێکدانەوە نوێکان، لەلایەن چەند کەسێکەوە ئەنجامدراوە. واتە کتێبەکە لە بنەڕەتدا لەلایەن کۆمەڵێ نـووسـەرەوە، نـەک تەنها نووسەرێک، نووسراوە. پاشان ئەم نووسینە جیاواز جیاوازانە لەلایەن هەردوو نووسەری کتێبەکەوە کۆکراونەتەوە و ئەم کتێبەی لێدەرچووە.
یەکێک لە خاڵە پرشنگدارەکانی ئـەم کتێبە، ئەوەیە نەهاتووە گێڕانەوەیەکی مێژووی ژیانی ئەو فەیلەسوفانە بخاتەڕوو. نەهاتووە پانۆرامایەکی گشتگیر دەربـارەی زیندەگی ئـەو فەیلەسوفانە پێشکەش بە خوێنەر بکات. ئـەو کـارە گرەچی کارێکی گرنگ و بایەخدارە، وەلێ لەم کتێبەدا ئاوڕ لەو لایەنە نـەدراوەتـەوە، بەڵکو هەوڵدراوە زیاتر قسە لەسەر فەلسەفەی سیاسی و کۆمەڵایەتی ئەو فەیلەسوفانەدا بکرێت و ڕاڤـەی و شیکردنەوەی تازەیان لێوە هەڵهێنجرێت. خاڵێکی پرشنگداری دیکەی ئەم کتێبە، وەک لە پێشەکی وەرگێڕە فارسییەکەدا هاتووە: ئەوەیە کتێبێکی سەربەخۆیە، واتە خوێنەر حەز لە چ فەیلەسوفێک بکات، دەتوانێ ڕاستەخۆ ئەو فیلەسوفە بخوێنێتەوە. بەشێوەیەکی گشتی ئەم کتێبە دیدگاو تێڕوانینی ئەو فەیلەسوفانە دەخاتەڕوو کە تا ئێستاش ئامادەییان لە ناوەندی ڕۆشنبیری و سیساسی و کەلتووری جیهانیدا هەیە.
لاپەرەکانی ئەم کتێبە ٤٧٢ لاپەڕەی مامناوەندییە، تیراژی٧٠٠ دانەیە، نرخی ٧٠٠٠ هەزار دینارە.